# کاروان


گۆڤارێکی ڕۆشنبیریی مانگانەیە

ئەمینداریتی ی گشتی ی ڕۆشنبیری و
لاوان بە زمانی کوردی و عەرەبی
دەری دەکا


لەم ژمارەیەدا




سەرنووسەر
**محمد أمین محمد احمد**

جێگری سەرنووسەر
**حسێن عارف**

**43**
نیسانی ١٩٨٦
ساڵی چوارەم



ئەدرەس :
هەولێر : ئەمینداریتی ی
گشتی ی ڕۆشنبیری و لاوان
گۆڤاری «کاروان» ت : ٢٠٨٨٢



نرخی (٢٥٠) فلسە

لە کتێبخانەی نیشتمانی لە بەغدا ژمارە «٤٨٣»ی ساڵی «١٩٨٢»ی دراوەتێ
لە چاپخانەی (الادیب البغدادیة) چاپکراوە

# جەنگاوەرانی سەرۆکی لەبەرەی ژووروویی جەنگەوە

وولاتی عیراق خاوەنی مێژوویەکی پڕ لەقارەمانێتیو سەربەرزییە . ڕۆڵەکانی ئەم وولاتە پێشکەوتنخوازە بەردەوام تێکۆشاونو خەباتیان کردووە بۆ وەدەستهێنانی سەربەخۆییو بەختەوەری بۆ ڕۆڵەکانی داهاتووی ، ئەوەتا ئەو خەباتەی ساڵانی زوو ، لەم ئازایەتی یەی ئیمرۆدا ڕەنگ دەداتەوەو دەردەکەوێ ، خەباتگێرە نەبەزەکانی ئەم گەلە خۆبەختکەرە پەیتا پەیتا قوربانی ی گەورە گەورەیان پێشکەش کردووە لەپێناو پاراستنی خاکو سنووری عیراقی خۆشەویستو کەرامەتی میللەتە پاڵەوانەکەی دا . هەموو کاتێکیش بەرەو ڕووی دوژمنانی عیراق بوونەتەوە ، ئەوانەی هەر لەزووەوە چاویان بڕیوەتە بەروبوومو داهاتو خاکی ئەم وولاتەمانو جۆرەها پیلانیان ناوەتەوە بۆ ڕاگیرکردنی ڕەوڕەوەی کاروانی بەرەوپێشکەوتنی چووی گەلەکەمان .

لەم چەند ساڵانەی دواییشدا ڕەگەزپەرستەکانی ئێران ، تاقمە شەڕپەرستەکەی خومەینی ، هەر لەگەڵ هاتنیاندا بۆ سەر حوکم . گیانی هەڵپەو شەڕفرۆشی هانی دان بۆ دەستدرێژی کردنە سەر خاکو سنووری عیراق ، کینەو دڵڕەشی وای تێکردن کە بەرامبەر بەگەلێکی دراوسێی وەکو گەلی عیراق ئاژاوە بنێنەوەو ئاگری شەڕێکی نارەوا هەڵگیرسێننو ، هەلێکی وا وەدەست بێنن تاوەکو ڕۆژێ لەڕۆژان پەلامار بێننە سەر عیراقو ، هەموو هەقیقەتێکی مێژوویی بنێنە ژێر پێو ، مافی ئەوە بەخۆیان بدەن بێبەزەیی یانە بۆردومانی لادێکانی سەر سنووری وولاتمان بکەنو ، ڕێکەوتنەکانی نێوان دەوڵەتان بشێوێننو ، نەفامانە بە تەپڵو زوڕنای سەرۆکەکانیان هەڵپەڕنو خواستو ئارەزوو گلاوەکانیان ئەنجام بدەن .

ئەوەبوو لە ڕۆژی ۱۹۸۰/۹/۲۲دا ، ئەو نەخشەیەی بۆیان کێشرابوو ئەنجامیاندا ، بەلام ئەو تاقمە حوکمرانە سەرکێشانە وا دوای زیاتر لەپێنج ساڵ شەڕی پڕ لەکارەساتو ماڵوێرانی ، لەدۆڕاندن بەولاوە هیچی تریان وەرگیر نەکەوتووە ، بەڵکو ڕۆژ لەدوای ڕۆژ ئاشنایەتیان لەگەڵ بەزیندا زێدە دەبێو دەکەونە گێژاوی گەورەتر. بەلام هەردیسان بەوەش نەوەستانو جارێکی دیکە خۆیان تاقی کردەوەو هێرشێکی تریان کردە سەر خوارووو ژووروی عیراق ، لەهەردوو کەرتی فاوو ، چوارتا ، کەچی ئەمجارەیشیان لەتێشکانو بەزین بەولاوە هیچی تریان وەچنگ نەکەوت . .

ئێمە بەوپەڕی دڵنیایی یەوە دەڵێینو دووپاتی دەکەینەوە ، کە

# فەرماندە صدام حسین بۆ «کاروان» دەدوێن

حوکمرانەکانی ئێرانی هەرچەند درێژە بەشەڕەکەیان بدەن ، هێندە ماڵوێرانیو دەربەدەری بۆ گەلانی وەڵاتەکەیان زامن دەکەنو لەو دەستکەوتە بەولاوە هیچی تریان دەست ناکەوێ ، چونکە ڕۆڵەکانی گەلی عیراق بەعەرەبو کوردیانەوە پاسەوانێکی ئازاو چاونەترسی ئەم وولاتە نەبەزیوەنو ، بەگیانو بەخوێن پارێزگاری لێدەکەن . بۆ سەلماندنی ئەم هەقیقەتەیش نوێنەرانی گۆڤارەکەمان لەڕۆژی ۲۳ی ئاداری ئەمساڵو لەگەرمەی سەرکەوتنەکانی هێزە چەکدارەکانمان لەهەردوو بەرەی شەڕدا ، لە «فاوو ، چوارتا» ، سەردانێکی ناوچە سنوور یەکانیان کردو ، لە هەر دوو ناوچەی «سیدەکانو مێرگەسووردا» ئەم چەند چاوپێکەوتنانەیان لەگەڵ ئەفسەرو سەربازو جەنگاوەرە کوردەکاندا کردوو ، ئەمەیش دەقی قسەکانیانە :

## ● ناوچەی سیدەکان ●

– لەناوچەیەکی شاخاویو لەنزیك دێی کەژەك ، چووینە بارەگای فیرقەی «۳۳»ی سەربازیو چاومان بە بەڕێز ڕابەری سیسیی فیرقە نەقیب «هادی علی» کەوتو ، ئەم لێدوانەمان لەگەڵیا تۆمار کرد :

● کاروان : حەزدەکەین بەڕێزتان لەبارەی سەرکەوتنەکانی ئەم دواییەوە شتێکمان بۆ باس بکەن :

– پێشەکی بەبۆنەی ئەو سەرکەوتنە دڵخۆشکەرانەی جەنگاوەرە پاڵەوانەکانمان ، سەربازانی هەڤاڵی تێکۆشەر موهیب روکن صدام حسین «خوا بیپارێزێ» ، وەدەستیان





هێناوە ، ناسکترین‌و جوانترین سلاّوو پیرۆزبایی دەکەینە دیاری بۆ جەنگاوەرە دلێرەکانمان ، وە بەتایبەتی برا کوردەکانمان کە سەر بە فەوجە سووکەکانن‌و لەکەرتی ژووررووددا شان بەشانی برا سەربازەکانیان پەلاماری دوژمنە رەگەزپەرستەکان رەت دەکەنەوە ، لەم شوێنەداو بەم بۆنەیەشەوە ، پەیمان بە سەرۆکی فەرماندە دەدەین ، کە تا هەتایە سەربازێکی دڵسۆزو بەوەفابین لەپێناوی پارێزگاری کردن لە خاکی وولاّت‌و ، ئەوەی لەتواناماندا هەیە بیکەین بۆ وەدەست هێنانی سەرکەوتنی تازەترو گەورەتر .

● لەبارەی دەوری دەزگاو دایەرە ئیمپریالی‌یەکانیشەوە کە هەوڵی ئەوە دەدەن ئاگری شەڕەکە خۆشتر بکەن‌و ، درێژەی پێ‌بدەن ، گوتی :

— بێ سێ‌و دوو دەزگاو دایەرە ئیمپریالی‌یەکان ، وە بەتایبەتی ئەوانەی سوود لە درێژە پێدانی شەڕەکە وەردەگرن دەورێکی دیارو ئاشکرایان هەیە بۆ بەردەوام‌بوونی شەڕ ، چونکە هەر لەزووەوە هەستیان بەوەکرد کە عیراق بەسەرۆکایەتی صدام حسین هەنگاوی گەورەو فرەوان دەهاوێژێ بەرەو پێشەوە ، ئیتر ئەوەیان بەلاوە خۆش نەبوو ، بۆیە کەوتنە ئاژاوە نانەوە ، شان بەشانی ئەوانیش هەندێ سەرۆك وولاّتی بەرەگەز عەرەبیش ، کەوتنە جولانەوە بۆ دووبەرەکی خستنە ریزی وولاّتانی عەرەب ، تاوەکو عیراق نەی‌پەرژێ بەشداری لەچارەسەری کێشەی فەڵەستین‌دا بکات‌و ، دووری بخەنەوە لەوەی کە بتوانێ سەرۆکایەتی نەتەوەی عەرەب بکات . ئەمەش بە ئاشکرا لەو هاوکاری‌و یارمەتی‌دانەدا دەردەکەوێ کە ئیسرائیل دەیداتە رژێمی ئێرانی ، باشترین بەڵگەش ئەو چەك‌و جبەخانەیە بوو کە هێزەکانمان لەکەرتی ژووررووی دەستیان بەسەرداگرت دوای بەزینی فارسەکان ، کە لەم چەند رۆژەی رابردوودا تەلەفزیۆن نیشانی بینەرانی بەرێزی‌دا .

دووبارە دەڵێم دەوری بەرەگەز عەرەبەکان وەکو «حافظ أسدو قذافی» هیچی لەدەوری قەوارەی ئیسرائیل کەمتر نی‌یە ، بەڵکو هەرئەوانە بوون ئاگری شەڕەکەیان داگیرساندو بەدرێژە پێدانی زیاتر خۆشحاڵ‌و بەختەوەر بوون .

● لەبارەی بەشداری‌کردنی جەنگاوەرە کوردەکانیش لەکەرتی فەیلەقی یەکەم‌دا لەناوچەی چوارتا «نقیب» هادی گوتی :

— گومان لەوەدا نی‌یە کە ئەو برا جەنگاوەرە کوردانە دەورێکی دیارو بالاّیان هەبوو لە شەڕەکانی ناوچەی چوارتا ، ئەگەرچی ئێمە لێشیانەوە دووربووین بەلاّم بەردەوام هەواڵی سەرکەوتنەکانی ئەوانمان پێ‌دەگەیشت‌و ، لەو دەورە بالاّیەی ئەوان ئاگاداربووین کە بەسەرۆکایەتی هەندێ لەراوێژکارەکانی فەوجە سووکەکانەوە بوو ، ئەوانەی توانیان سەرکەوتنی باش لەو بەرەی شەڕدا وەدەست بێنن ، لەگەڵ ئەوەشدا نابێ لەبیرمان بچێ کە ئەو برا کوردانەیش عیراقین‌و مەبەستیانە بەرژەوەندی عیراق بپارێزن ، وەکو هەر عیراقی‌یەکی تر کە لەم وولاّتەدا دەژی . دووبارە دەڵێم بەڵێ ئەو برا کوردانە دەورێکی جیاوازو دیاریان هەبوو بۆ تێکشکاندنی دوژمن‌و پاك‌کردنەوەی ناوچەکە لەو رەگەزپەرستە داگیرکەرانە .

لەکۆتاییدا زۆر سوپاس ئەو ئەرك‌و ماندووبوونەتان دەکەم ، کە ئەو رێگە دوورو درێژەتان بڕیوە ، تاوەکو سەردانی هێزە

چەکدارەکانی سەر سنووری ئەم وولأتە خۆشەویستەمان بکەن‌و لەگەڵیاندا بدوێن‌و بەشداری خۆشی‌و سەرکەوتنەکانمان بن . .

● کاك محمدامین جێگری ڕاوێژکاری فەوجی ۳۱ ، لەبارەی سەرکەوتنەکانی ئەمجارەی سوپاو جەنگاوەرە دلێرەکانی هەردوو کەرتی خواروو ژووروی بەرەکانی شەردا گوتی :

- بەبۆنەی سەرکەوتنەکانی سوپای عیراق بەسەر فارسە ڕەگەزپەرستەکان لەخواروو ژووروی وولأتدا ، خۆشحاڵی خۆمان دەردەبرین‌و ، پیرۆزبایی لەهێزە چەکدارەکانمان دەکەین بەعەرەب‌و کوردەوە ، بۆ ئەو سەرکەوتنە مەزنانەی لەبەرەکانی شەردا وەدەستیان هێناو شکستیان خستە نێو هێزە دەست درێژکارە بەزیوەکانی ئێران .

هەر بەم بۆنەیەشەوە ، بەناوی عەشیرەتی برادۆست ، وەبەتایبەتی ئەو جەنگاوەرانەی سەر بە فەوجی «۳۱»ی سووك کە لەناوچەی «سیدەکان»ین، بەگیان‌ودڵ‌ئامادەین پارێزگاری لە وولأتە ئازیزەکەمان بکەین‌و بڕیاری وەفاداری بۆ گەلی عیراق دووپات دەکەینەوە کە نەهێڵین دوژمنانمان بستێك بێنە نێو خاکەکەمان ، ئەوەتا جەنگاوەرە مەیدانەکانی جەنگن‌و شوورەیەکی پۆلأیینن بەرامبەر بە دوژمنە گومراکان ، هەر لەم ڕوانگەیەشەوە بڕیاری خۆمان تازە دەکەینەوە بۆ سەرۆکی فەرماندە ، تێکۆشەر صدام حسین «خوا بیپارێزێ» کە هەموو کاتێك سەربازێکی وەفادارین لەپێناوی پاراستنی خاکی وولأتە شیرینەکەمان . .

● هەروەها جەنگاوەر «علي حسين علي» لەهەمان فەوجەوە خۆشحاڵی خۆی دەربڕی‌و گوتی :

- ئێمەی جەنگاوەرانی فەوجی «۳۱» لەناوچەی سیدەکان ، گەرمترین پیرۆزبایمان پێشکەش بەو ڕۆڵە نەبەزانە دەکەین کە توانیان هێرشە چەپەڵەکەی دوژمن پوچەڵ بکەنەوەو خەونە ڕەشەکانیان بەساوایی لەگۆڕ بنێن ، ئەڵبەتە بەشداری کردنی جەنگاوەرە کوردەکان لەکەرتی سەروو ، لەناوچەی چوارتا ڕاشترین بەڵگەی ئازایەتی‌و دڵسۆزی گەلی کوردە بۆ خاك‌و وولأتی عیراق .



ئێمە لەکاتێکدا نارەزایی خۆمان دەردەبڕین بەرامبەر بە ڕژێمی فارسیی ڕەگەزپەرست‌و پیلانە گلأوەکانیان ، لەهەمان کاتدا ئامادەیی خۆمان نیشان دەدەین بۆ بەربەرچ دانەوەی هەموو هێرشێکی دوژمنانی عیراق خۆشەویست ، هەروەها ئامادەین لەهەموو بەرەکانی شەردا بەشداری بکەین ، لەپێناوی پارێزگاری کردن لەسنووری وولأتەکەمان . .

هەر بەم بۆنەیەشەوە سلاوو ڕێزو پیرۆزبایی خۆمان پێشکەش دەکەین بە سەرۆکی فەرماندە موهیب روکن صدام حسین «خوا بیپارێزێ»و ، هیواداریین گەلی عیراق‌و سوپا



دلێرەکەی هەمیشە لەسەرکەوتندابن‌و دوژمنانی ئەم وولاتە ئازیزەمان هە سەرشۆڕی‌و بەزین بەشیان بێت . .

● هەر لە فەوجی «٣١» ، جەنگاوەر مولازم «محمد علی هادی» ئەم کارتەی پیرۆزبایی پێشکەش کردو گوتی :

– بەبۆنەی سەرکەوتنەکانی ئەم دوایی‌یە کە سەربازەکانی سەرۆکی فەرماندە صدام حسین «خوا بیپارێزێ» لەناوچەی خوارووو سەرووی وولاتدا بەدەستیان هێنا ، ناسکترین‌و جوانترین پیرۆزبایی خۆم پێشکەش بە سەرۆکی فەرماندەو گەلی عیراق دەکەم ، ئاواتەخوازم گەل‌و سوپاکەمان هەمیشە سەرکەوتووبن‌و وولاتەکەیشمان لەبەختەوەریدا بژی .

● جەنگاوەر «نهاد محمد عزیز»یش گوتی :

– بەبۆنەی سەرکەوتنەکانی سوپا دلێرەکەمان بەسەر فارسە دوژمن‌و ڕەگەزپەرستەکاندا ، لەهەردوو بەرەی شەر ، لەفاوو چوارتا ، پیرۆزبایی‌یەکی گەرم ئاراستەی سەرۆکی فەرماندە صدام حسین – «خوا بیپارێزێ» – دەکەین ، هەروەها پیرۆزبایی لەو سوپا قارەمانەمان دەکەین کە ئازایانە ئەم سەرکەوتنانەی وەدەست‌هێناو ، خەون‌و ئاواتە نەزۆکەکانی دوژمنانی پوچەڵ کردەوە . .

● لە چاوپێکەوتنێکیشدا لەگەڵ جەنگاوەر ، مولازم «طارق حسون عباس» کە سەرپەرشتی‌ی کۆمەڵە سەربازێکی دەکرد لەبناری چیای «کەژەك» – لەناوچەی سیدەکان – درێژەی بەقسەکانی داو گوتی :

– بەبۆنەی سەرکەوتنەکانی ئەم دوایی‌یەی هێزەکانمان بەسەر تاقمە بەزیوەکانی قوم‌و تاران ، سڵاوو ڕێزمان پێشکەش دەکەین بە سەرکردایەتی سیاسی‌و سەرۆکی فەرماندە موهیب روکن صدام حسین «خوا بیپارێزێ» . .

هەروەها بەناوی هەموو سەربازە نەبەزەکانمان جوانترین‌و گەرمترین پیرۆزبایی پێشکەش بە سەرۆکی قارەمانمان دەکەین‌و ، بەڵێن دووبارە دەکەینەوە کە لەهەموو شەرێکماندا سەرکەوتنی گەورە وەدەست بێنین‌و ، دوژمنانی وولاتەکەمان ببەزێنین .

پەیمانیش بەگەلە خۆشەویستەکەمان دەدەین کە هەمیشە سەربازێکی بەوەفابین‌و پارێزگاری لە خاکی وولاتەکەمان بکەین‌و ، سەرکەوتنیش لەیەزدانی مەزن دەخوازین .

● هەر لەناوچەی کەژەك‌و سیدەکاندا چەند سەربازو دەرەجەدارێکی سوپایی بەدەنگمانەوە هاتن‌و قسەیان بۆ کردین ، لەوانە :

– جەنگاوەر «ن . ض» عبدالعباس عطشان .

– جەنگاوەر «ن .ض» عباس حسون مطشر .

– جەنگاوەر «سەرباز» علی حمود یوسف .

ئەم برا جەنگاوەرانە ، خۆشحاڵی خۆیانیان نیشاندا بەرامبەر بەو سەرکەوتنانەی وەدەست هاتوون لەهەردوو بەرەی شەڕدا ، لەخوارووو ژووروی وولات ، لەکەرتی فەیلەقی سێ‌و حەوت لەفاو ، وە لە کەرتی فەیلەقی یەك لە ناوچەی چوارتادا . .

وەپەیمانی دڵسۆزی‌و وەفاداری خۆیانیان تازەکردەوەو ، بەڵێنیاندا کە هەمیشە سەربازێکی بەجەرگ‌و کوڵنەدەری ئەم

وولاّتەبن‌و ڕێگە بە دوژمنە داگیرکەرەکان نەدەن کە بستێك لە خاکی نیشتمانی عیراق داگیر بکەن .

هەر بەم بۆنەیەشەوە سلاّو ڕێزو پیرۆزبایی خۆیانیان پێشکەش‌کرد بە سەرۆکی فەرماندە . تێکۆشەر صدام حسین «خوا بیپارێزێ»و ، ئامادەیی‌یان نیشان‌دا بۆ ئەنجامدانی هەر کارو فەرمانێك کە پیێیان بسپێردرێ لەهەموو بەرەکانی شەڕدا .

● هەر لەو شوێنەدا جەنگاوەر «مولازمی یەکەم» عبدالحمید سعدون ، پیرۆزبایی لە گەلی عیراق‌و سەرۆکی فەرماندەو سوپا کرد . بەبۆنەی ئەو سەرکەوتنە مەزنانەی سوپا دلێرەکەمان‌و جەنگاوەرانی کورد کە سەر بە فەوجە سووکەکانن ، لەناوچەی فاوو ، چوارتادا ، وەدەستیان هێناو ، گوتی : مەحاڵە گەلی عیراق – بەعەرەب‌و کوردەوە – ڕێگە بە دوژمنانی بدات بێتە نێو سنوورو ، خاکەکەی داگیر بکات‌و ، ڕۆڵە ئازاو بەجەرگەکانیشی دەستەوەستان بوەستن ، بەڵکو ئێمە لەوە دڵنیاین کە هەموو بستێکی ئەم خاکە خۆشەویستەمان لە دوژمنانی دەبێتە گڕکان‌و . گڕ لە ئاواتە گڵاّوەکانیان بەردەدات‌و ، نەخشەو پلانە ناکامڵەکانیان سەرەونگون دەبن‌و ، گومانیش لەوەدانی‌یە کە هێزی خێرخوازان‌و نیازپاکان هەر زاڵ دەبێ‌و ، شەڕوفرۆشانیش ڕیسوایی‌و ڕوورەشیان بۆ دەمینێتەوە . .

## ● ناوچەی مێرگەسوور ●

**لەسەرەتادا لەبارەگای سەرکردایەتی هێزەکانی «طلحة» لە «سپیلك» چاومان بە رابەری سیاسی – بەرێز عەقید باهر محمد قاسم – کەوت‌و ، بەبۆنەی سەرکەوتنەکانی ئەم دوایی‌یەی هێزە چەکدارەکانمان لەناوچەی «فاوو چوارتا»دا ئەم پیرۆزبایی‌یەی پێشکەش بەسەرۆکی فەرماندەو گەلی عیراق کرد :**



– پڕ بەدڵ پیرۆزبایی لەگەلی عیراق مەزن دەکەم بەبۆنەی سەرکەوتنە گەورەکانی سوپای قارەمانمان لەهەردووبەرەی جەنگ ، لەکەرتی فەیلەقی «سیێ‌و حەوت»و «فەیلەقی یەکەم»دا ، هەر بەم بۆنەیەشەوە پیرۆزبایی لە سەرۆکی فەرماندە دەکەین‌و ، داوا لەیەزدانی مەزن دەکەین سەرکەوتنی گەورەتر وەدەست بێنین بەسەر دوژمنە ڕەگەزپەرستەکان‌و ، هیوادارین سوپا دلێرەکەمان بەردەوام لە سەرکەوتن‌دا بێت‌و ، هەموو پیلان‌و نەخشە گلاّوەکانی دوژمن پوچەڵ بکاتەوە ، دووبارە پیرۆزبایی بۆ سەرۆکی فەرماندە صدام حسین «خوا بیپارێزێ»و ، بۆ گەل‌و سوپای عیراق بەم بۆنە پیرۆزەوە . .

● **لە ناوچەی مێرگەسووریش ، چاومان کەوت بە فەرماندەی کەرتی مێرگەسوور بەرێز «عمید» تحسین‌و ئەم کارتەی پیرۆزبایی پێشکەش کرد :**

– بەبۆنەی سەرکەوتنەکانی ئەم دوایی‌یە گەرمترین‌و بۆندارترین پیرۆزبایی پێشکەش دەکەم بە سەرۆکی فەرماندە هەڤاڵ صدام حسین «خوا بیپارێزێ» . هەربەم بۆنەیەشەوە ئامادەیی خۆمان نیشان دەدەین بۆ ڕەت‌کردنەوەی هەموو



دەستدرێژییەك كە بكرێتە سەر سنووری وولاتەكەمانو ، هەرگیز رێگە بە دوژمنان نادەین بستێك بێنە نێو خاكی عیراقی خۆشەویست . .

● **جێگری راوێژكاری فەوجی «٢٩»ی سووك كاك اكرم ، بەناوی خۆیو جەنگاوەرانی فەوجەكەی ئەم چەند قسەیەی بۆ كردین :**

ئێمە جەنگاوەرانی فەوجی «٢٩»ی سووك ، كە ئێستا لەسەر چیای پیرانی ناوچەی مێرگەسوورین ، هەموو كاتێك ئامادەین بۆ پوچەڵ كردنەوەی هەر هێرشێكی نارەوا كە بكرێتە سەر خاكی وولاتەكەمان ، بەهەموو توانایەكیش تێ دەكۆشین بۆ پارێزگاری كردن لەعیراقی خۆشەویستمان ، لەهەمان كاتدا پەیمان دووبارە دەكەینەوە بۆ سەرۆكی تێكۆشەر صدام حسێن «خوا بیپارێزێ» كە هەردەم سەربازێكی بەوەفاو جەنگاوەرێكی دڵسۆزی ئەم وولاتە بین .

● **هەروەها جەنگاوەرێكی فەوجی «٣٤»ی سووك كە سەر بەكەرتی قەڵادزێیە گووتی :**

– پیرۆزبایی لە هەموو هێزە چەكدارەكانمان دەكەین لەبەرەكانی شەڕداو ، پەیمان دووبارە دەكەینەوە بۆ گەلی عیراقو سەرۆكی فەرماندە ، كە هەموو كاتێك وەكو شوورەیەكی پۆلایین پارێزگاری لەم وولاتە ئازیزەمان بكەینو شكستی بە هێرشە نارەواكانی دوژمن بێنین .

● **لە فەوجی «١٢»ی سووك ، لەكەرتی مێرگەسوور ، كاك «رضا مشیر اسماعیل» جێگری راوێژكاری فەوجەكە خۆشحاڵی خۆی دەربڕیو گوتی :**

– ئێمە جەنگاوەرانی فەوجی «١٢»ی سووك لەناوچەی مێرگەسوور ، خۆشحاڵی خۆمان پیشان دەدەین بەبۆنەی سەركەوتنەكانی ناوچەی «فاوو چوارتا» كە سەربازە نەبەردەكانمانو جەنگاوەرە كوردەكانی سەر بەفەوجە سووكەكان ئەنجامیان داو ، خاكی عیراقیان لەدوژمن پاك كردەوە ، ئێمەیش هەموو كاتێك وەستاوین بۆ بەشداریكردن لە بەرەكانی شەڕدا دژی دوژمنی رەگەزپەرست لەهەر ناوچەیەكی وولاتدا بێت ، هەر بەم بۆنەیەشەوە پەیمانی وەفاداری دووبارە دەكەینەوە بۆ سەرۆكی فەرماندە هەڤاڵ صدام حسین «خوا بیپارێزێ»و ، بۆ بەرز راگرتنی ئاڵا شەكاوەكەی عیراقی خۆشەویست لەسەرتاسەری سنووری وولاتەكەماندا . .

● **هەروەها جەنگاوەران «ئومید عارف اسماعیل»و «صدیق یاسین عبدالقادر» لەهەمان فەوجدا ،**

خۆشحاڵی خۆیان نیشان داو ئامادەیی خۆیانیان دەربڕی بۆ بەشداریكردن لەهەموو بەرەیەكی شەڕدا دژی دوژمنە رەگەزپەرستەكان ، ئەوانەی بەنیازی ئەوەن خاكی عیراق داگیر بكەنو درێژە بەم شەڕە نارەوایەیان بدەن .

● **لەكەرتێكی تری ناوچەی مێرگەسوورو ، لەبنكەیەكی سوپای میللیدا ، چاومان بەچەند لێپرسراوێك كەوتو ئەوانیش بەشداری برا سەربازو جەنگاوەرانی فەوجە**

سووکەکانیان کرد ، بەبۆنەی سەرکەوتنەکانی ئەم دوایی‌یەو گوتیان :

● **هەڤاڵ محمد نعمە حمد ، جێگری فەرماندەی کەرتی (نبوخذ نصر)ی کەرتی پارێزگای کوت ، گوتی :**

– بەبۆنەی ئەو سەرکەوتنە مەزنانەی سوپا دلێرەکەمان ، پیرۆزبایی لە سەرکردایەتی سیاسیی‌و سەرۆکی فەرماندە موهیب روکن سەرۆکی کۆمار صدام حسین – «خوا بیپارێزێ» – دەکەم‌و هیوادارم ئەم گەل‌و سوپا مەزنەمان هەمیشە سەرکەوتووبن .

● **هەر لەهەمان بنکەدا جەنگاوەران ، «حسین سلطان جاری‌و عبد چلاپ حسین‌و عطا والی کتاب»**

بەشداری‌ی گفت‌وگۆکەیان کردوو ، خۆشحاڵی خۆیانیان نیشان‌دا بەرامبەر بەو سەرکەوتنە مەزنانەی سوپاو جەنگاوەرە کوردەکان لەهەردوو بەرەی جەنگ ، لە ناوچەی «فاوو چوارتا»دا ، هەر بەم بۆنەیەشەوە ئامادەیی خۆیانیان دەربڕی بۆ پارێزگاری کردن لەخاکی عیراق‌و تێکشکاندنی هەموو نەخشەو پیلانێکی فارسە رەگەزپەرستەکان لە «قوم‌و تاران»دا .

● **لەمێرگەسووریش چاومان بەجێگری هەندێ لەراوێژەکانی فەوجە سووەکەکان کەوت‌و ئەم چەند لێدوانەمان لەگەڵیاندا تۆمار کرد :**

– **جەنگاوەر ، شوکت رشید جێگری فەرماندەی فەوجی «۷۸»ی سووك گوتی :**

لەدڵەوە پیرۆزبایی‌یەکی گەرم پێشکەش دەکەین بۆ سەرکردایەتی سیاسیی‌و سەربازیی ، بەسەرۆکایەتی موهیب روکن صدام حسین «خوا بیپارێزێ» ، بەبۆنەی سەرکەوتنەکانمان بەسەر فارسە رەگەزپەرستەکان ، لە کەرتی خوارووو ژووررووی وولاّت‌داو ، پەیمان دووبارە دەکەینەوە بۆ سەرۆکی فەرماندە



کە هەموو کاتێك سەربازێکی وەفاداری ئەم وولاّتە خۆشەویستەمان بین .

● **جەنگاوەر حیدر رشید شێروانی ، بەرێوەبەری راوێژکاری هەمان فەوج بەشداری لێدوانەکەی کردوو گوتی :**

– بەناوی عەشیرەتی شێروانی‌و هەموو جەنگاوەرەکانی‌یەوە ناسکترین سلاّوو پیرۆزبایی پێشکەش بە گەلی عیراق‌و سەرۆکی تێکۆشەر صدام حسین‌و سەربازو جەنگاوەرە کوردەکان دەکەین کە بەشداریی سەرکەوتنەکانی ئەم دوایی‌یەیان کرد لە خوارووو ژووررووی وولاّتە ئازیزکەماندا ، لەهەمان کاتیشدا



ئامادەیی خۆمان دووپات دەکەینەوە بۆ خزمەتکردنی خاکیَ عیراقی خوشەویست . .

**● جەنگاوەر «نەقیب» رضوان محمد جێگری فەرماندەی فەوجی «٢٩»ی سووکیش گوتی :**

– شەرەفێکی گەورەیە بۆ رۆڵەکانی گەلی عیراق کە ئیمرۆ بەشداری دەکەن لەپاراستنی خاکی عیراق ، هەر بەم بۆنەیەشەوە گەرمترین‌و بەسۆزترین پیرۆزبایی پێشکەش بە سەرکردایەتی سیاسی‌و عەسکەری دەکەین ، بۆ ئەو سەرکەوتنە مەزنانەیان بەسەر دوژمنانی عیراق ، هەروەها پیرۆزبایی لە جەنگاوەرانی فەوجە سووکەکان دەکەین کە دلێرانە بەشداریی شەڕی کەرتی فەیلەق یەکەمیان کردو شکستی‌یان بە هێزە بەزیوەکانی خومەینی هێنا . .

**● احمد حسن هەرکی ، جەنگاوەری فەوجی «٤٥»ی سووکیش گوتی :**

– ئیمەی جەنگاوەرانی فەوجی «٤٥»ی سووك لەناوچەی میرگەسوور ، خۆشحاڵی خۆمان دەردەبڕین‌و پیرۆزبایی لەگەلی عیراق دەکەین بەبۆنەی بەزینی فارسەکان لە بەرەکانی شەڕداو ، ئامادەین هەموو دەستێکی چەپەڵ ببڕین کە بیەوێ زیان بە وولات‌و میللەتەکەمان بگەیەنێ .

**● جێگری راوێژکاری فەوجی «٤٩»ی سووك جەنگاوەر «فریق قاسم محمد»یش گوتی :**

– بەناوی فەوجی «٤٩»ی سووك لەعەشیرەتی دزەیی ، ئامادەیی خۆمان دەردەبڕین بۆ بەشداریکردن لەبەرپەرچ دانەوەی هەموو هێرشێکی ناڕەوا کە دوژمنانمان بیکەنە سەر خاکی وولاتەکەمان . .



● **له فهوجی «٧٨»ی سووك ، جهنگاوهر محسن رشید حمدامین بهشداریی لیدوانهکهی کردوو گوتی :**

– بهبۆنهی سهرکهوتنهکانی هێزه چهکدارهکانمان بهسهر دوژمنی رهگهزپهرست پیرۆزبایی له سهرۆکی فهرمانده تێکۆشهر صدام حسێن «خوا بیپارێزێ» دهکهین و ، پیرۆزبایی لهههموو رۆڵهکانی گهلی عیراق دهکهین . ههر بهم بۆنهیهشهوه ئامادهیی خۆمان دووباره دهکهینهوه بۆ بهشداری کردن لهههموو بهرهکانی شهڕ ، له خواروو ژووروی وولاتدا ، وه بهناوی فهوجهکهمان ئامادهین بۆ بهختکردنی گیانی خۆمان لهپێناوی خاکی عیراقی خۆشهویست . .

● **ههر لهههمان فهوجدا جهنگاوهر شیرزاد رشید محمد گوتی :**

– پهیمان بۆ سهرۆکی فهرمانده تازه دهکهینهوهو ، ئامادهین بۆ ئهنجامدانی ههموو کارو فهرمانێکی عهسکهری که پێمان بسپێردرێ لهههر شوێنێکی وولاتی عیراقدا بێت .

● **له فهوجی «٩»ی سووکیش ، جهنگاوهر «نعمة حسین جانگیر مزوری» گوتی :**

– ناسکترین پیرۆزبایی بۆ سهرۆکی تێکۆشهر صدام حسین «خوا بیپارێزێ» بهبۆنهی سهرکهوتنی سهربازه ئازاو نهبهردهکانی لهبهرهکانی شهڕ ، لهکهرتی «فاوو چوارتا»دا ، جارێکی تر بهڵێن دووباره دهکهینهوه که ههموو کاتێك سهربازێکی بهوهفابین و گوێڕایهڵی ههموو داخوازییهکی سهرۆکی فهرماندهو سهرکردایهتی سیاسی بین .

**«کاروان»**

# سەردانی سەرنووسەری «کاروان» لە مۆسکۆ

لە رۆژی چوارشەممەی رێکەوتی ١٢ی مارتی ١٩٨٦دا ، بەرێز محمدامین محمد احمد ئەمینداری گشتیی رۆشنبیریو لاوان لە ناوچەی کوردستانداو سەرنووسەری گۆڤاری «کاروان» ، سەرکردایەتی وەفدێکی وەرزشیی عێراقیی کردو سەر لەبەیانی رۆژی چوارشەممە ١٩٨٦/٣/١٢ ، بەرێزسەرنووسەری «کاروان» لەگەڵ ئەندامانی وەفدەکە گەیشتنە شاری مۆسکۆ.

لـــــــــە فرۆکەخانەی مۆسکۆ پێشوازییەکی گەرم کرانو بەپێی پرۆگرام نەخشەیێکی دیاریکراو ، بەرێز سەرنووسەری «کاروان»و هەڤاڵەکانی لەهەمان رۆژدا سەریان لەسێرکی مەزنی رووسیاداو بۆ رۆژی دووەم کەرۆژی پێنج



ـەمەبوو لەگەڵ نوێنەرانی بزووتنەوەی وەرزش لە یەکێتی ی سۆڤیەتدا ووتووویژو گفتوگۆیان کردو پرۆتۆکۆڵێکی هاوکاریان ـەگەڵ نوێنەرانی وەرزشوانانی سۆڤیەت مۆرکرد . شیاوی باسە ـەرۆکی لیژنەی وەرزش لە یەکێتی ی سۆڤیەتدا لە کۆبوونەوەکەدا ئامادەببوو

جـــــــــــــگە لە پرۆتۆکۆلەکە باسی گەلێ ـ بەتی تری گرنگ کرا کە پەیوەندیان بە بزووتنەوەی وەرزش هەیە ، وەك یاری ی ئۆلۆمپیو رۆڵی لیژنەی سۆڤێتیو هەوڵدانی ـۆ ئەوەی زمانی عەرەبی لەیەکێتی ی رۆژنامە نووسانی جهانیدا ، بەکار بێتو رۆژنامە نووسێکی وەرزشیش لە کۆماری عێراقدا بەجێگری سەرۆکی یەکێتی ی رۆژنامەنووسە وەرزشی یەکان هەڵبژێرێت .

هەروەهـــــــــا کۆبوونەوەکە ڕسوای دەزگا ڕاگەیاندنەکانی سەر بەرژێمە سەرمایەدار یەکانی کرد ، کە هەوڵدەدەن بازرگانی بە وەرزش بکەن . . بیکڕنو بیفرۆشنو دەتوانین بڵێین دانیشتنە کە تابڵی ی سوود بەخش بوو ، لە بەرژەوەندی ی هەردوولا بوو ، بەتایبەتی بەرژەوەندی ی عیراقو بزووتنەوەی وەرزشی لە عیراقدا .



بۆ ئێوارە وەفدەکەمان سەری لە پەیمانگای پەروەردەی بەدەنی دا کە گەورەترین و مەزنترین پەیمانگایە لەیەکێتیی سۆڤیەتداو لەو پەیمانگایەدا وەفدەکەمان چاوی بەپێنج قوتابیی عیراق کەوت .

رۆژی ١٩٨٦/٣/١٤ وەفدەکەمان سەری لە رۆژنامەی «سپۆرت» داو لەلایەن سەرۆك نووسەرانی پێشوازی کران و وتی : (شادمانم بە سەردانتان بۆ یەکێتیی سۆڤیەت و منیش بەش بەحاڵی خۆم ، دریغی ناکەم لە روونکردنەوەی رۆڵی عێراق لە بواری وەرزش و بزووتنەوەی وەرزش دا) .

جگە لەمەش لەگەڵی چاوپێکەوتنی‌تردا لایەنی سۆڤیەت ئارەزووی هاوکاری کردنیان لەگەڵ عێراقدا دەربڕی هاوکاری کردن لە پێناو رێکخستنی وەرزشدا .

رۆژی ١٩٨٦/٣/١٥ وەفدەکەمان سەری لە مۆزەخانەی سەربازیدا ، پاشان لە میترۆی مۆسکۆو لە ئێوارەی هەمان رۆژ

سەری لە کۆشکی «پێشڕەوان – الطلائع» داو. پاشان لە کاتژمێری هەفتی ئێوارەدا وەفدەکە سەری لە «کۆشکی کۆنگرەکان» لە کرملینداو بالێکیان لەسەر شانۆی هۆڵی کۆشکەکەدا بینی.

لە رۆژی یەك شەممەی ١٦/٣/١٩٨٦داو لە کاتژمێری

(١١)ی سەر لەبەیانی، وەفدەکە بەسەرۆکایەتی سەر نووسەری گۆڤارەکەمان سەری لە گۆری لینین و ئەو سەرکردە مەزنانەی سۆڤیەتدا، ئەوانەی لە دیواری کرملیندا نێژراون.

پرۆگرامی سەردانی وەفدەکەمان بۆ یەکێتی سۆڤیەت بەم شێوەیە بوو: لە رۆژی دووشەممەی رێکەوتی ١٧/٣/١٩٨٦

ПАНОРАМА SPORT DEPORTE LE SPORT PANORAMA

## В СПОРТКОМИТЕТЕ СССР

Вчера в Москве подписан Протокол о спортивном сотрудничестве между Министерством по делам молодежи и спорта Иракской Республики и Комитетом по физической культуре и спорту при Совете Министров СССР на 1986—1987 гг. По поручению Министерства по делам молодежи и спорта с иракской стороны документ подписал М. А. Мохаммед, с советской— заместитель председателя Спорткомитета СССР В. Гаврилин.

Протоколом предусматривается обмен спортивными командами по легкой атлетике, вольной борьбе, волейболу, футболу, тренерами и специалистами. Будут проведены консультации и обмен опытом в различных областях спортивной науки.



### *Мохаммед Амин МОХАММЕД:*

# У НАС ОБЩИЕ ИНТЕРЕСЫ

**Как уже знают читатели, в нашей стране находится делегация спортивного руководства Ирака во главе с Мохаммедом Амином МОХАММЕДОМ. Иракский гость побывал с деловым визитом в редакции «Советского спорта». В этот момент и состоялась наша беседа.**

**— Мы знаем, что Вы не только один из высших спортивных руководителей страны, но и известный спортивный журналист...**

— Насколько известный — не берусь судить, но вне спортивной прессы жизни своей не представляю. Я действительно вхожу в состав редакционных коллегий нескольких газет и журналов в Курдском автономном районе Ирака, являюсь издателем двух из них и горжусь, что избран руководителем объединения спортивных журналистов Курдистана. С работой в спортивной печати связаны воспоминания о самых ярких стра... ном руководстве страны.

Нелегко успевать всюду и везде, стараться сделать максимум того, что можешь, что должен. Но ведь все аспекты моей работы в конце концов взаимосвязаны — как можно, например, говорить о хорошей организации спортивной структуры в стране без хорошей организации спортивной прессы? Конечно, питательная основа спортивной журналистики — это достижения атлетов, но в то же время откуда, как не из печати, узнают массы читателей о достижениях страны в большом и массовом спорте, кто призывает их к гармоничному развитию?

... спортивных специалистов в нашей стране ощущается пока весьма и весьма остро. Вот побывал я в вашем столичном Центральном институте физкультуры, и мне было очень приятно встретиться там и побеседовать с иракскими студентами и аспирантами, которые получают квалифицированную специализацию по различным направлениям. Их очень ждет наша страна, наш молодой спорт, как и 76 их коллег, которых мы осенью прошлого года направили в физкультурные вузы Болгарии, ГДР и других социалистических стран. Вернутся на родину — им и карты в руки, занимайте любые посты, помогайте «старикам»...

...мейском спорте — это гарантия здорового и процветающего будущего всей нации. Будущего в условиях мира, а то, что мир обязательно будет — в этом мы не сомневаемся. Поэтому, повторяю, мы и не жалеем средств на развитие массового физкультурного и спортивного движения во всех районах страны. Для подготовки специалистов открыли три физкультурных факультета при университетах в Багдаде, Мосуле и Басре, открываем такие же факультеты еще в двух крупных городах. В стране созданы федерация по ряду олимпийских дисциплин, и хотя мы не блещем пока особыми успехами, принимаем самое активное участие в мировом спортивном и олимпийском движении. Предмет нашей особой гордости — успехи футболистов Ирака, которые вместе с сильнейшими командами мира вскоре отправятся на чемпионат в Мексику...

...ния молодежи уделяется в нашей стране очень большое внимание. И это — несмотря на нехватку сил и средств для решения, на первый взгляд, более насущных социальных и экономических проектов, даже в тяжелейших условиях навязанной нам войны. Однако мы считаем, что здоровая молодежь — в университетском и школьном, рабочем и сельском, ар...

**«кодексом атлета», откры... щим доступ профессио... на Игры?**

— В этом вопросе наш... зиция однозначна—решит... «нет!». Олимпийский спо... может, не должен быть... метом бизнеса, а ведь то... этому, по сути, и стремятс... датели «кодекса». Если... будут открыты для «пр... олимпийское движение... ся целых континентов... лодому, только становящ... на ноги спорту Азии, Аф... Латинской Америки буд... по силам тягаться с «пр... бизнесменами от спорта. ... рады, что наша позиция по... му принципиальному во... полностью совпадает с по... ями национальных олимпий... комитетов социалистиче... стран. В этом, как и в боль... стве проблем, от которых... висит само будущее спор... нас общие интересы и це...

**— И, наконец, удовлетво... ли члены иракской делег... итогами пребывания в на... стране?**

— Удовлетворены -- не... слово... Я лично не первый... в Советском Союзе, и каж... раз чувствую себя, как д... Даже встречал моих сопле... менников-курдов среди спорти... го руководства в ваших юж... республиках. При подписа... документов, определяющих... кретное содержание спорти... го сотрудничества наших ст... товарищи из Спорткоми... всегда идут нам навстреч... ни разу еще у нас не возн... ло сколько-нибудь серьез... проблем. Отношения н... строятся на прочных трад... онных связях, и, приезжа... СССР, мы всегда помним о... что ваша страна — это под... ный оплот мира на пла... Земля. Именно в Москве р... даются важнейшие мирные... циативы и конкретные пре... жения, призывающие все... роды к сосуществованию в...



یەکەم : لە کاتژمێری ١١ی سەر لە بەیانی ئەندامانی وەفدەکە سەریان لە ڕۆژنامەی «پراڤدا» داو لە هەمان ڕۆژدا میوانی لیژنەی وەرزشی بوونو نانی نیوەڕۆیان لە ئوتێلی «مترو پۆل» خوارد .

دووەم : دوای نیوەڕۆ سەریان لە ناوچەیێکی شوێنەواریی دوور لە شاری مۆسکۆ بە (٤٠) کیلۆمەتردا . ئینجا سەردانێك بۆ زانکوێ مۆسکۆ ڕێکخرا .

لە ڕۆژی ١٩٨٦/٣/١٨ ، لە کاتژمێری دەی سەر لە بەیانی ، وەفدەکەمان سەردانێکی بۆ یاریگەی ئۆلۆمپی ئەنجامداو لە کاتژمێری ١٢ی نیوەڕۆدا ، پرۆتۆکۆلی هاوکاری نێوان ئێمەو لیژنەی وەرزشیی سۆڤیەتی مۆر کرا .

ئابەم شێوەیە سەردانی وەفدە وەرزشییەکەمان ، بەسەرۆکایەتی مامۆستا محمدامین محمد احمد ، ئەمینداری گشتیی ڕۆشنبیریو لاوانو سەرۆکی نووسەرانی گۆڤارەکەمان کۆتایی پێهاتوبەرەو عێراقی ڕەنگینو خۆشەویست گەڕایەوە . . عیراقی سەرکەوتنو قادسیەی صدامو عێراقی کوردو عەرەب .

«کاروان»

# بۆ ئاگاداری

هەندێ لەو برا نووسەرانەی بەرهەممان بۆ دەنێرن ، دەستووری ڕاکێشانی خەت لە نێوان وشەکاندا بۆ جیا کردنەوەیان لەیەکتر ڕەچاو دەکەن ، بەنیازی سووك کردنی باری سەر شانی ئێمە . کەچی لە زۆربەی حاڵەتدا ، کار وا دەشکێنەوە کە باری سەر شانمان قورس دەکەن ، چونکە شارەزای ئیشەکە نینو هەڕەمەیی خەتەکە ڕادەکێشن . بۆیە تکا لە هەموو برا نووسەرەکانمان دەکەین کە ئەو ئەرکە واز لێ بێنن بۆ ئێمەو سوپاسی ئەو هەستی بەتەنگەوە هاتنو هاریکارییەشیان دەکەین .

(کاروان)

## ڕوونکردنەوە

لە ژمارە (٤١)ی مانگی (شوباتی) گۆڤارەکەماندا ، دوو هەڵە ڕوویان داوەو بەپێویستی دەزانین ، سەرنجی خوێنەرانیان بۆ ڕابکێشین :

١ — لە لاپەڕە (٣٤)دا ، وتاری (تۆسنی ڕەشید) لە نووسینی دکتۆر حسین ڕەهبەرەو ناوەکەی لە کاتی لەچاپداندا کەوتوە .

٢ — لە لاپەڕە (٨٧)دا ، وێنەی (زکی صائب) بەهەڵە لەگەڵ ئەو بابەتەدا بڵاوکراوەتەوە .

(کاروان)

بائیز عمر احمد

# پاشیێن کەسان نە «جێناوی لکاو...»

دگۆڤارا کاروانا هژمار (٣٨)دا و ژلاپەریێ (١٣–٢٠)یێ ، سەیدایێ هێژا د . ئەورەحمانێ حاجی مارفی گوتارەك نڤیسیبوو بن ناڤێ : « جێناوی کەسیی لکاو لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا» .

چو – بۆ شارەزاییا دکتۆری ناهێ گۆتن د مەیدانا زمانیدا ، چکو ئەوێن د ڤێ مەیدانێدا کاردکن بهایێ وی چاك دزانن ، لێ لبا من دکتۆری د ڤی گوتاریدا لەزکرییە ، لەو د سەر هندە نەراستی یێن هووررا بووریە .

من دڤێ ئەز لسەر وێ چەندێ راوستم – دا هەکە بۆچوونێن من دخەلەت بن ، دکتۆرێ هێژا ژ منو یێن وەکو منرا راستکەن .

١ – ژرێڤەو د ناڤێ گوتاریدا دکتۆری گۆتییە : «جێناوی لکاو . .» . .

پاشی دبێژە : «ئەگەرچی دەستەی دووەمی جێناوەکان وەك دەستەی یەکەم چالاك نین ، بەلاّم ئەمانیش هەروەك دەستەی یەکەم دەتوانن ببنە بەشێك لە رستەو دەوری کارا یان بەرکار ببینو جگە لەوەی بە کردارەوە دەلکێن ، هەروەها دەچنە سەر گەلێ بەشە ئاخاوتنی(١) تریشو . . جا بۆیە راستنییە بە کۆتایی کردار لە قەلەم بدرێن .» و د پەراوێزاندا دبێژە : « دواتر بەنموونەو بەلگە ئەو راستییە ئیسپات دەکەین» و وەکی گۆتی گەلەك جوان ئەو چەند ئیسبات کرییە . . لێ ئەگەر دکتۆر بهێو جارەك دن نموونێن خوە بنێرە ، دێ چاك بینە کو چو ژ وان یێن کو گۆتی : «جێناوی لکاو . .» بێی ناڤ یان جهناڤێن کەسی یێن جودا (جێناوی کەسیی جودا) بۆ هەمان دەوری رێزمانی نەهاتینە . ئەڤەژی وێ چەندێ دگەهینە کو ئەو بتەنێ نەشێن دەورێ خوەیێ رێزمانی بگەهینو کەسێ مەبەست ژێ دیارکن بێی هاریکارییا تشتەك دن – هەروەکو (م – ت – ی – مان – تان – یان) د کورنانجییا خوارێدا دشێن . لەو ئەز دگەل دکتۆریمە کو نە (کۆتایی کردار)ن ، لێ ئەز دگەل نینم کو (جێناوی کەسیی لکاو) بن . . بەلکو لبا من (مەکەنزی) ڤ راستییا وان کەڤتییە دەمێ ب (دووڤەلانکێن کەسان – یان پاشییێن کەسان) (Personal ending) ددانە(٢) ، چکو هاریکارییا دەرکەڤتنا کەسی دکن د رستێدا – یان – مانا کەسی د رستێدا تەڤاڤدکن .

نموونە بۆ ڤێ یەکێ : د کورمانجییا خوارێدا دێ بێژی :

(خواردم – خواردت – خواردی – خواردمان – خواردتان – خواردیان)

لڤێ درێ هەموو کەس ددریانو چو وەکهەڤی تێدا نینە کو پێتڤی ب تشتەك دن بە دا دیاربکە . . لێ ئەگەر ئەم بێژن :

(نڤستم – نڤستی – نڤست – نڤستن)

ئەرێ (نڤستن) L دووماهیێ مەبەست ژێ کەسێ ئێکێ یان دووێ یان سێیێ کۆمە ؟ هەلبەت ئەگەر بڤی ئاوایی بە ، ئەم نزانن – تا تشتەك دن نەهێ ژمەرا رۆنبکە . لەو ئەڤە نابنە

(جێناو) . هەروەسا یێن کورمانجی‌یا خواریژی کو ئەڤە نە : (م–ی– « . ، ە) – ین – ن –ن) وەکی دکتۆری بخوە ئیسبات کرین[٣] ، چکو ئەوژی یێن کەسێ دووێو سێ‌یێ کۆم وەك هەڤن .

هەرچەندە دکتۆری ب (بێهێز) ناڤ‌کرینە[٤] ، لێ هەکە ئەو پەیڤا یان ئەو مۆرفیا دگەل دهێ بۆ هەمان دەورێ ڕێزمانی (هەرچەندە باهرا پتر دگەل هندەك ژوان) ژوێ ب‌هێزتر بە و پتر وی دەورێ ڕێزمانی ڕۆنو ئاشکەرا بکە ، چما ئەو پەیڤ یان مۆرفیم دێ بە (تەئکید)و ئەوا بێهێزو نەشێ دەورێ ڕێزمانی بقەنجی بجی‌بینە دێ بە (ئەصل) ! . . هەلبەت یا یەکێ (ئەصل)ەو یا دووێ (تەئکید) .

٢ – هەرچەندە بۆچوونا دکتۆری تەموتەم ڕاستە دەمێ پاشی‌یێن کەسان (Personal ending) د کورمانجی‌یا ژووی‌دا بێی ئاوایی دەست نیشان‌دکە (م – ی –« . ، ە» – ن) ، لێ لبا من دەمێ دکتۆرێ هێژا ڤیای ڤێ یەکێ یان بۆچوونا خوە بۆ ڤان پاشی‌یان ئیسبات بکە بسەر هندەك نەراستی‌یێن هووردا چووی‌یە . . لەو ئەزێ نهو بدوورو درێژی (بۆچوونا خوە) لسەر ڤێ بابەتێ دیارکم :

هندی پاشی‌یێن کەسانن د دایالێکتا کورمانجی‌یا ژووری‌دا ، تەنێ کێش لسەر پاشی‌یا کەسێ سێ‌یێ کت هەیە ، لەو من دڤێ هوون هوور لێ کەسی بنێرن .

أ – هندی کارێ (verb) رستێ د دەمێ بووری (past temse) دابە «چ ڕەنگێ بە» ئەگەر هاتو پاشی‌یێن کەسان پێڕا هاتن – کەسێ سێ‌یێ کت چو وەرناگرە . بۆنموونە :

١ – بووری‌یێ ئیخباری‌یێ تێپەڕ . ئەگەر فۆنیما بەری پاشی‌یان کۆنسۆنانت (consonant)و (i)بە :

| | سادە | بەردەوام | تەڤاڤ | دوور |
|---|---|---|---|---|
| تە ئەز | خاندم | دخاندم | خاندی‌مە[٥] | خاندبووم |
| من تو | خاندی (xandiy) | دخاندی | خاندی‌یە | خاندبووی |
| تە ئەو | خاند ( . ) | دخاند ( . ) | خاندی‌یە ( . ) | خاندبوو ( . ) |
| تە ئەم / من هوون / تە ئەو | خاندن | دخاندن | خاندی‌نە | خاندبوون |

ئەگەر فۆنیما بەری پاشی‌یان ڤاولێ (Vowel) بە :

| | سادە | بەردەوام | تەڤاڤ | دوور |
|---|---|---|---|---|
| تە ئەز | هێلام | دهێلام | هێلایی‌مە | هێلابووم |
| من تو | هێلای | دهێلای | هێلایی‌یە | هێلابووی |
| تە ئەو | هێلا ( . ) | دهێلا ( . ) | هێلایی‌یە ( . ) | هێلابوو ( . ) |
| تە ئەم / من هون / تە ئەو | هێلان | دهێلان | هێلایی‌نە | هێلابوون |

٢ – بووری یێ ئیخباری یێ تێنەپەڕ . ئەگەر فۆنیما بەری پاشی یان کۆنسۆنانت و (i)بە :

| | سادە | بەردەوام | تەڤاف | دوور |
|---|---|---|---|---|
| ئەز | کەڤتم | دکەڤتم | کەڤتیمە | کەڤتبووم |
| تو | کەڤتی | دکەڤی | کەڤتییە | کەڤتبووی |
| ئەو | کەڤت ( . )[٦] | دکەڤت ( . ) | کەڤتییە ( . ) | کەڤتبوو ( . ) |
| ئەم / هوون / ئەو | کەڤتن | دکەڤتن | کەڤتینە | کەڤتبوون |

ئەگەر فۆنیما بەری پاشی یان ڤاولێ بە :

| | سادە | بەردەوام | تەڤاف | دوور |
|---|---|---|---|---|
| ئەز | فڕیم | دفڕیم | فڕیمە[٧] | فڕیبووم |
| تو | فڕیی (friy) | دفڕیی | فڕییە | فڕیبووی |
| ئەو | فڕی ( . ) | دفڕی ( . ) | فڕییە ( . ) | فڕیبوو ( . ) |
| ئەم / هوون / ئەو | فڕین | دفڕین | فڕینە | فڕیبوون |

٣ – بووری یێ ئینشائی یێ تێپەڕ :

| | سادە | بەردەوام | تەڤاف | دوور |
|---|---|---|---|---|
| تە ئەز | کوشتبامە (١) (Kustbame) | بکوشتبام (bikustbam) | کوشتبم[٨] (Kustibim) | کوشتبووبامە (١)[٩] (Kustbubame) |
| من تو | کوشتبایە (١) | بکوشتبای | کوشتبی | کوشتبووبایە (١) |
| تە ئەو | کوشتبایە (١) ( . ) | بکوشتبا ( . ) | کوشتبە، «یێ – یت – ت– ی . .» | کوشتبووبایە (١) ( . ) |
| تە ئەم / من هوون / تە ئەو | کوشتبانە (١) | بکوشتبان | کوشتبن | کوشتبووبانە (١) |

٤ - بووریێ ئینشائیێ تێنەپەر :

| سادە | بەردەوام | تەڤاف | دوور[١٠] |
|---|---|---|---|
| ئەز نڤستبامە (١) | بنڤستبام | نڤستیم | نڤستبووبامە (١) |
| تو نڤستبایە (١) | بنڤستبای | نڤستیی | نڤستبووبایە (١) |
| ئەو نڤستبایە (١) (.) | بنڤستبا (.) | نڤستـــیـــبـــە «ێ-یت-ت-ی . .»، | نڤستبووبایە (١) (.) |
| ئەم / هوون / ئەو نڤستبانە (١) | بنڤستبان | نڤستین | نڤستبووبانە (١) |

ب - هندی کارێ رستێ نەبووری (دەمێ نهو Present tense)و دهێ (Future tense)بە[١١] - و چی تشتێ دیبە د رستێدا (ناڤ - جهناڤ (جێناو) - پەسن (ئاوەڵناو) . . (تەنێ ئەدڤێربلێ (adverbial) جهی نەبە)، دەمێ پاشیێن کەسان پێرا دهێن - کەسێ سێیێکت دێ پاشییا (٥)یا کەسی وەرگرە .

بۆ نموونە :

١ - دەمێ نهو - تێپەر :

| ئەگەر ڤۆنما بەری پاشییان کۆنسۆنانت و (i) بە : | ئەگەر ڤۆنما بەری پاشییان ڤاولێ بە : |
|---|---|
| ئەز ێ(١) دچینم | ئەز ێ(١) دخوەم |
| تو وێ (١) دچینی | تو وێ(١) دخوەی |
| ئەو ێ (١) دچینە | |
| «ێ-یت-ت-ی . .» | ئەو ێ (١) دخوە (ت)[١٢] |
| ئەم / هوون / ئەو ێن دچینن | ئەم / هوون / ئەو ێن دخوەن |

٢ - دەمێ نهو - تێنەپەر :

| ئەگەر ڤۆنما بەری پاشییان کۆنسۆنانتو (i) بە : | ئەگەر ڤۆنما بەری پاشییان ڤاولێ بە : |
|---|---|
| ئەز ێ (١) دچم | ئەز ێ (١) دهێم |
| تو وێ (١) دچی | تو وێ (١) دهێی |
| ئەو ێ (١) دچە | |
| «ێ-یت-ت-ی . .» | ئەو ێ (١) دهێ (ت) |
| ئەم / هوون / ئەو ێن دچن | ئەم / هوون / ئەو ێن دهێن |

٣ - هندی دەمێ دهێیەژی چ تێپەرو چ تێنەپەر - چ ڤاولێ لبەری پاشییان بە یان کۆنسۆنانتو (i) ، هەروەك یێن دەمێ نهونە . . لێ بڤی رەنگی :

جهناڤێ جودا + دێ[١٣] + رەها (رەگ) نەبووریا کاری + پاشییا کەسی

وەکو : ئەز دێ چینم . ئەو دێ هێ . هوون دێ خوەن . . . .تد .

٤ - پێنەڤێ ئەم دگەل ناڤو جهناڤو . . . تد . بینن ، چکو دکتۆری باش دیارکرینە .

٣ - دکاروانا هژمار (٣٣)دا و ل لاپەرێ (٣٥)ێ دکتۆری گۆتییە : کو د دیالێکتا کورمانجییا ژووریدا (ێ) جهناڤێ کەسێ سێیێ کتە - و د ڤێرێژیدا (کاروانا هژمار «٣٨») ل لاپەرێ (١٣) ێ دیسا وە دبێژە ، لێ رۆن نەکرییە .

نبا من راستە (یٚ) هەیە ئو دبە جهناڤ‌ژی ، لیٚ جهیٚ ناڤ نەنیٚ ناگرە – بەلكو پیٚ : ناڤ (چ ناڤیٚ مرۆڤ بە یان پیٚ گیٚنەبەری) ، جهناڤیٚ جودا ، ئەدڤێربلی ، . . . تد . ژی دگرە .

ئەڤ (یٚ)یە ژبەر هندیٚ جهیٚ تشتەك دن دگرە ، دا بهیٚ ڤەشارتن یان ئەو بخوە ڤەشارتی‌یە ، لەو من ناڤیٚ ویٚ دانایە (جهگریٚ نەدیار) ، ڤێجا ئەگەر جهیٚ ناڤ بگرە دیٚ بە (جهگریٚ ناڤیٚ نەدیار» ئو هەکە بکەڤە جهیٚ ئەدڤێربلی دیٚ بە (جهگریٚ ئەدڤێربلیٚ نەدیار) . . و هوسا[14] . بۆنموونە :

– بیٚژیٚ ←——— بیٚژە ئازادی

– بیٚژیٚ ←——— بیٚژە وی . بیٚژە ئەوان .

– تێرا ←——— د رووباری‌را .

لبا من ئەو (یٚ)یا دکتۆر د گۆڤارا کاروانا هژمار (٣٤) لاپەریٚ (٢٣) خالا (٣)یٚ‌ژی‌دا بەحس ژیٚ دکە هەر ئەڤ (یٚ) یەیە[15] .

٤ – دکتۆری د لاپەریٚ (١٧)یٚ‌دا گۆتی‌یە : «لە راستیدا لە هەندیٚ حالەتدا جێناوە لکاوەکانی دەستەی دووەم (نەك یەکەم) بە کۆتایی کرداری تێپەری رابوردووەوە دەلکێن . هاتن‌و نەهاتنی ئەو جێناوە لکاوانەش بە بوون‌و نەبوونی بەرکارەوە بەندە» .

باشە پا د ڤیٚ رستیٚ‌دا کانیٚ پاشی :

– **من ناڤیٚ وی زانی .**

– **تە ناڤیٚ وی زانی .**

– **(وی/ویٚ) ناڤیٚ وی زانی .**

– **مە ناڤیٚ وی زانی .**

هەرچەندە کو (ناڤیٚ وی) بەرکارەژی . . لەو دڤیا دکتۆری گۆتبا : هاتن‌و نەهاتنیان بە بوون‌و ە نەبوونی دەستەی دووەمی جێناوە جوداکان (ئەز – تو – . . .) یان جێگرەکانیانەوە بەندە .

## پەراوێز :

(١) – ئەڤە نە (ئاخاوتن)ە ، لیٚ (ئاخڤتن)ە . . بنێرە :
بائیز عمر احمد – رۆنکرنەك – نووسەری کورد – ژمارە «١» – بەغدا – ئادارا «١٩٨٥»یٚ – ل «٩٩» .

(٢) – بنێرە :
D. M. MACKENZIE – KURDISH DIALECT STUDIES – I – LONDON – 1961 – P . 181. 182. 183...

(٣ ، ٤) – بنێرە :
د . ئەورەحمانی حاجی مارف – جێناوی کەسی لکاو لە دیالێکتی کرمانجیی خواروودا – کاروان – هژمار «٣٣–٣٤» – هەولێر – حوزەیران‌و تەمووزا «١٩٨٥» – ل «٣١–٣٨»یێن هژمارا یەکیٚ و ل «١٦–٢٥» یێن هژمارا دوویٚ .

(٥) – ١ – ل لاپەریٚ «١٥» یٚو د خالا هژمار «٣»دا دکتۆری نموونە بۆ ڤ فۆرمی ئانینە ، لیٚ ژکەسیٚ دوویٚ‌و سیٚ‌ییٚ‌کت دیار دبە کو نەدراستن . چکو لبا من ئەڤ فۆرمە بڤی ئاوایی پێك‌دهیٚ : پاستپارتیسپلیٚ (Past Pariciple) + پاشی‌یێن کەسان + (o) و پاستپارتیسپل‌ژی ژ رەها بووری (رەگی رابوردوو)و (ی (i) پێك‌دهیٚ .

هەرچەندە رەنگیٚ کەسیٚ دوویٚ‌و سیٚ‌ییٚ‌کت وەك‌یەکن ، لیٚ ئەو بخوە وەلیٚ نینە چکو :

أ – کەسیٚ دوویٚ ییٚ‌کت بڤی ئاوایی پێك‌دهیٚ :
پاستپارتیسپلیٚ + پاشی‌یا کەسیٚ دوویٚ ییٚ‌کت (ی (y) + (o) . وەکو : شاندی‌یە (Şandi +y+e)

جارنازی ئەگەر چو ددووڤرا نەهیٚ فۆنیا (o)یا دووماهیٚ ژیٚ دکەڤە – یان دبە (ی (i) . وەکو :
شاندی‌یی (Şandiyi)

ب – کەسیٚ سیٚ‌ییٚ‌کت بڤی ئاوایی پێك‌دهیٚ :
پاستپارتیسپلیٚ + پاشی‌یا کەسیٚ سیٚ‌ییٚ‌کت ( . ) + (ە) هەلبەت فۆنیا دووماهی‌یا پاستپارتیسپلی ڤاولەو فۆنیا (o) بخوەژی کو پێرا دهیٚ ڤاولە ، لەو فۆنیا سەمیڤاولاٚ (Semi – Vowel (ی y)) ناڤبەینا وان دگرە . بڤیٚ یەکیٚ وەکو یا کەسیٚ دوویٚ‌ییٚ‌کت دەردکەڤە . وەکو :
شاندی ( . )یە (Sandi + (.) + y + e)

د هندە پارچێن ڤیٚ دیالێکتیٚ‌دا ( ی (i)یا دووماهی‌یا پاستپارتیسپلی بۆ (i) دهیٚ گوهارتن . وەکو :
ئەز هاتمە (Hatime) . .)
تو هاتیە (Hatiye) . . .)
ئەو هاتیە Hatiye) . .)
ئەم
هون هاتنە (Hatine) . .
ئەو

٢ – هەروەسان خالا «١٨»یٚ ژی یا پەراوێزێن دکتۆری کو دکەڤە ل «١٩»یٚ ییٚ گۆڤاریٚ ، کو نموونەکە ژکاریٚ بووری ییٚ تەڤاف‌را ئانی‌یە راست‌نینە ، چکو نە ئەڤ فۆرمەیە (بووری ییٚ تەڤاف) لیٚ فۆرمیٚ بووری‌ییٚ سادەیە ، ژبەر پاستپارتیسپلیٚ تێدا نینە ، چکو ئەگەر ئەم ب تیپێن

لاتیێ بنڤیسن دێ بێ ڕەنگی بە : ..(Ketne)و . .» ئەڤە ژ چیرۆکێ دیاردبە .

نموونە بۆ ڤێ فۆرمێ :

– ئەوی (عەلی تەرماخی) بخوە بدەستێ خوە د نیڤا گوندی مزگەفتو مەدەرەسە بینا کرینە ، و موودەیەکێ بخوەژی دەرس گۆتینە . (رەشید فندی – عەلی تەرەماخی . . ل «٢١»)

– وەکی ژ هشقێ سۆتیبە

ئەڤ قەول بشێخی گۆتیبە

(صادق بهاءالدین ئامێدی – هۆزانڤانێت کورد . . ل «١٩٣»)

(٦) – ل لاپەرێ «١٤»ێو بۆ پاشییا (ە) دکتۆری ئەڤ نموونە ئانینە : «ئێڤارێ ، چاخێ ئەو هاتە مالێ . .»

هات) لڤێرێ کارێ بووری یێ ئیخباری یێ سادەیە – ئو وەکو مە دیارکریو دکتۆری بخوەژی دیارکری (بنێڕ گوتارێ مەبەست ژێ – ل «١٥») ، کەسێ سێیێ کت د ڤێ فۆرمێ و د ڤێ سیغەیدا چو وەرناگرە ، لەو ئەڤ نموونە نەڕاستەو پێکهاتییە ژ : کارێ بووری یێ سادەو (ە) یا سەمت دیارکرنێ (ئاراستە نیشانکەر – یان – (ئامرازی پەیوەندی) .

(٧) – لڤێرێ (ی (i) یا دووماهییا ڕەها بووریا «فڕین» یێو (ی (i)) یا پارتیسپلێ هەردوو جووتدبنو دبنە ئێك (ی (i))

(٨) – أ (ی (i)) یا ڤێ فۆرمێژی د هندە پارچێن دیالێکتێ دا دبە (i) ، وەکو :

– کوشتبم (Kustibim) – کوشتبی (Kustibiy) . .

– ، هەروەکی د گوهەکیرا چوبیتو د گوهێ دیرا دەرکەتبیت .

(صادق بهاءالدین – خانومان – . . . ل «٦٤»)

– رەنگە ژ بیرا من چوبیت ، من ئەو پارە دابنە ئێکی یان ژی دابنە ب تشتەکی ، . . (صادق بهاءالدین ئامێدی – خانومان – . . . ل «١٤١»)

ب – تەنێ د ڤێ سیغەیو د ڤێ فۆرمێ دا ئەگەر کارێ ڕستێ یێ بووریبە ، کەسێ سێیێ کت دێ پاشییا (ە)و فۆمێن وێ وەرگرە . بۆ نموونە :

. . ، یان ژ نشیڤەك کەتبە (Ketibe)و لنگێ وێ شکەستبە

(محمدامین بۆز ارسلانێ – مەیرۆ – و .عبدالکریم فندی دۆسکی . . . ل «٥٠»)

(٩) – (وو) یا ڤێ فۆرمێژی د هندە پارچێن ڤێ دیالێکتێدا دهێ گوهورین بۆ (i) .

(١٠) – أ دکتۆری ل لاپەرێ (١٥–١٦)ێ فۆرمێن ڤێ سیغەی نڤیسینە ، لێ لبا من بێ ئاوایێ من دانابن ڕاستترە . . هەرچەندە پرۆفیسۆر ك .ك . کوردۆییف د کتێبا خوەدا (ڕێزمانی کوردی بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجیو سۆرانی – و . د . کوردستان موکریانی . . ل «٢٥٣–٢٦٩»)

بڕەنگەك دن لێکدایە ، چکو وی ژپارچەك دن یا دیالێکتا کورمانجییا ژووری وەرگرتییە ، لێ لبا من ئەڤە پتر دکەڤە قالبێ ڕێزمانێ .

ب – پەراوێزا «٢٠»ێ یا کو دکەڤە لاپەرێ «١٩»ێژی نەڕاستە ، چکو کارێ وێ نەبووریبە (ڕەها بووریا (زانین) (زانی)یە ، لێ ئەڤە (زان)ە) ، ئەگەر بووریژی بە (ئەم یێن (ی) بوویە (i)) ، نە تێنەپەڕە وەکی دکتۆری دڤێ ، لەو (ئەوی . .) ژی ژ کۆما (من – تە – ئەوی / ئەوێ – . .) یە نە ئەو کۆما جهناڤێن جودا یێن پاشی یێن کەسان پێڕا دهێن .

نموونە بۆ ڤێ فۆرمێ :

– پاشی هەکو هزرێت خو کربانا دا هێتە بیرێ :

(صادق بهاءالدین ئامێدی – خانومان . . . ل «٥٠»)

– . . تە ئەز لبەر مژانا هەڕشاندباما .

(صادق بهاءالدین ئامێدی – خانومان . . ل «٦٤»)

(١١) هندی کارێ ڕستێ یێ نەبووریبە :

أ – ئەگەر فۆنیمەکا کۆنسۆنانت یان ڤاولا بێهێزا (i) لبەری پاشییێن کەسان بە ، کەسێ سێیێ کت دێ ڤان ڕەنگێن پاشییان وەرگرە (هەریەك لپارچەکا دیالێکتا کورمانجییا ژووری) (ە – یێ – یت ت ی . .) ، لێ ژبەر سڤلککرنا ڕێزمانا زمانی ئەمێ (ە) هلبژێرن ، چکو هەموو وەك یەك بکاردهێن د ڤێ حالەتێ دا – ئو د هندە حالەتێن دندا تەنێ (ە) بکاردهێ . دکتۆری ژی ئەڤ یەکە کرییە .

ب – ئەگەر فۆنیمەکا ڤاولێ لبەری پاشییان بە ، کەسێ سێیێ کت یان چو وەرناگرە (پاشییا ( .)) یانژی دێ تەنێ «ت» وەرگرە (دهند پارچێن دیالێکتێدا) ، لێ ئەڤ «ت»ەژی زێدەهییە – وەکی دکتۆری دیارکری ، چکو ئەڤەژی وەکو یا کورمانجییا خوارێیە . (بنێڕە پەراوێزا (٣–٤) L ژووی) .

لڤێرێ ژبەرکو فۆنیما دووماهییا کاری ڤاولەو (ە) یا پاشییا کەسێ سێژی ڤاولە – لێ ڤاولەکا بێهێز ، لەو هەردوو دێ تێکهلبنو دەنگێ وان دێ ڤەر دەنگێ (ە) کەڤە . لێ ئەگەر فۆنیما دووماهییا کاری (ە) بە ، هەردوو دێ بنەئێك (ە) .

(١٢) – أ لڤێری (ە)یا پاشییا کەسێ سێیێ کتو (ە) یا دووماهییا کاری جووتبووینەو بووینە یەك (ە) .

ب – د هندەك پشکێن دیالێکتا ژووریدا نابێژن (دخوەم) ، لێ دبێژن (دخۆم) کو فۆنیما (ا) یا (خوارن) ئەوا دبە (ە) ژ ڕەها نەبووری یا کاری دهاڤێنو لشوونا وێ فۆنیما (و) قەلەودکن . وەکو :

ئەزێ (ا) دخۆم . تو وێ (ا) دخۆی . ئەوێ (ا) دخۆ (ت) .

(ئەم – هوون – ئەو) یێن دخۆن .

(١٣) – هەرچەندە دکتۆر نموونا بۆ ڤێ دەمی ل لاپەرێ «١٥» بێ ئاوایێ دئینە : «ئەزێ بکەڤم – تویێ بکەڤی . . .»

لێ ئەز دبێژم وەکی من درستترە ژبەر :

أ – هندی مە نیشانەکا لێکدایو دیار د زمانیدا هەبە باشترە ژ ئێکا نەلێکدایو بەلاڤە .

ب – ئەو بخوە (نیشانا دەمێ دهێ) یا درست (دێ ب)ە ، (بنێڕە : جەگەرخوین – اواو دەستورا زمانی کوردی . . . ل «١٥١–١٥٢» و ل «١٧٠–١٧١») لێ لهندە پارچێن ڤێ دیالێکتێ فۆنیما (د) بوویە (و) لهندەکا کەڤتییەو لهندەك دن (ب) کەڤتییە ، و لهندەکا هەردوو کەڤتینە تەنێ (ێ) مایە .

ئەڤێ یەکێ دکتۆر ل لاپەرێ (١٥)ێ خەلەت کرییە چکو نڤیسییە :- تویێ بکەڤی

– ئەوێ (ئەو ، وێ) بکەڤە

ئەگەر لڤێری (د–یان–و) کەڤتیبە دڤیا دکتۆری بێ ئاوای نڤیسیبا :-- تو وێ بکەڤی

– ئەو ێ بکەڤە

چکو (و) یا (تو) ڤاولە لێ یا (ئەو) سەمیڤاولە .

لێ ئەگەر (د – یان – و) نە کەڤتیبە دڤیا بێ ئاوایێ هاتبا نڤیسین : – تو وێ بکەڤی

– ئەو وێ بکەڤە

(١٤) – بنێڕە : بائیز عمر احمد – «ر» و «ڕ» –کاروان – ژمارە «١٣» – هەولێر – تشرینی یەکەمی «١٩٨٣» – ل «٢٣» .

هەروسا بنێڕە : کوردۆییف – زێدەرێ بووری – ل «١٤٠–١٤١» .

(١٥) – دکتۆری (دامنێ) ئینایە دبێژە : ئەڤە واتا «من بە ئەوانم دا» ددە ، «م» بکەرەو «ن» بەرکارە – لەو (ێ) نە جهناڤە چکو چەوا دێ سێ جهناف بەڤڕا هێن .

باشە ئەز دێ پسیارەکێ کەم (من چ بە ئەوانم دا ؟) .

د بەرسڤێدا دێ بێژم (من کتێبەکەم بە ئەوان دا .)

لڤێدەرێ بۆ مە دیاردبە کو وێ (ێ) جهێ (کتێب)ێ گرتبوو کو بەرکارێ ئێکەرە (بەرکاری ڕاستەوخۆ) ، ئو (ن)ێ جهێ (ئەوان) گرتبوو کو بەرکارێ هاریکارە (بەرکاری ناڕاستەوخۆ) .

علی فتاح دزەیی

# « مەم وزین» ی خانی و بەراورد کردنی لەگەڵ داستانی مەمی ئالان دا «١»

**وەکو لە باسی مەمی ئالاندا گوتمان[*] ، بیری بنچینەیی ئەم داستانەی ئەڤینداریی ئێجگار کۆن بێتو هەروها دووریش نیە ، سەربردەیێکی دڵداری ، لە نێوانی دڵدارو دلبەرێکی خاوەن پایە رووی‌دابیٚو بەسەرهاتەکانی. لەگەڵ ناوەرۆکی ئەم چیرۆکە کۆنە تێکەڵاو بووبیٚ[٢] ، بەڵام هەرگیز ئەوە ساغ‌نابێتەوە کە ئەم داستانە . لە سەردەمانی هەرە لەمێژدا ، چ ناوێکی هەبوەو لە دوای ئیسلام‌بوونی نەتەوەی کورد ، لە چ وەختێکدا بەرگی تازەی کردۆتە بەرو بەم ناوەی پێوەی دەناسین ناوبانگی سەندوە .**

(شەرەفخان) ، لە دیباچەی (شەرەفنامە)یدا ، دەڵی :

فەرهاد ، کە سەردەستەی دڵدارانو سەرداری وەفاداران بوەو سەبارەت بەئەڤینی (شیرین)یٚ ، بەچەندان ئێشو ئازاری چیشتوە ، کوردێکی کەلهور بوە .)[٣]

ئەگەرچی مێژوونووسی گەورەمان ، لەم زەمینەدا ، پەنجەی بۆ داستانی خۆشەویستی (مەم‌وزین) درێژنەکردوە ، ئەمە ئەوە دەچەسپێنی کە لە سەردەمی ئەودا ، ئەم کارەساتەی دڵداری بەم ناوەیەوە نەناسرابیٚ .

(مەلای جزیری) سەد ساڵێك پێش لە (شەرەفخان) ژیاوەو خۆی خەڵکی ئەو شارە بوە کە شانۆی داستانەکەیە لە هەلبەستێکی دا دەڵیٚ :

**موویەکی ئەز ژێە نادەم ب دووسەد زینو شرینیٚ**
**چ دبت گەر مە حسێب‌کەی توو ب فەرهادو مەمیٚ[٤]**

سەد ساڵی خشت لەدوای دانان ی شەرەفنامە . کە دانەرەکەی لە ساڵی (١٠٠٥ ك = ١٥٩٦ - ١٥٩٧ز) لە نووسینی دوا لاپەڕەی بوەتەوە ، (خانی) هۆناندنەوەی مەمو زینی تەواوکردوە :

**لەورا کو دەما ژ غەیبیٚ فەك بوو**
**تاریخ هەزارو شەستو یەك بوو**
**ئیسال گەهیشتە چلو چاران**
**وی پێشرەوی گوناەکاران**

واتا لە ساڵی (١١٠٥ ك = ١٦٩٣ - ١٦٩٤) دوا بەیتی شاکارەکەی نووسیوە .

لەبەر ئەوەی (خانی) نەك هەر شاعیرێکی گەورە ، بەڵکو رابەرێکی دووربینی بیری نەتەوایەتی بوە ، هەستی بەهەبوونی کەلێنێکی گەورە کردوە ، لە ئەدەبیاتی نەتەوەکەیدا ، ئەویش نەبوونی داستانێکی شیعری ئەوتۆ بوە کە پەنجە لە پەنجەی شاکارەکانی شیعریی نەتەوەکانی دراوسی بدا .

ئەمجا بەم رامانەو بەم مەبەستەوە ، ویستوویەتی ئەو کەلێنە گەورەیە پڕ بکاتەوە :

**دا خەلق نەبێژن کو ئەکراد**

**بێ مەعریفەتن ، بێ ئەسڵو بنیاد**
**ئەنواعی میلەل خودان کتێبن**
**کرمانج تەنێ د بێ حسێبن**

نووسەرو رۆشنبیری گەورە (دکتۆر نووردین زازا) لە پێشگوتنە بەنرخەکەیدا کە بۆ (مەمی ئالان)ی نووسیوە ، رەخنەی لە شاعیرەکەمان گرتووەو دەڵێ : «ئەحمەدی خانی ب خوە ، مەوزووعی مەمو زینی ژمەمی ئالان بریەو گەلەك تشت ژی گوهیراندنە . . .) و ( . . . لێ شێخی خانی مە ، مات دهێلە گاڤا دنڤیسە کو هەر تشتێن مەمو زینێ ب تەنێ ژ سەری وی دەرکەتنە . . .) و ( . . . دە دیباچەی دیوانی خوەدا دبێژە :

**ئەلغازو مەعانی ئو عیبارات**
**ئینشاءو مەبانی ئو ئیشارات**
**مەوزووعو مەقاسدو حیکایەت**
**مەرمووزو مەناقبو درایەت**
**ئوسلووبو سیفاتو مەعناوو لەفز**
**ئەسلەن نەکرن مە یەك ژ وان قەرز**
**(فی الجملە نە تایجێد فیکرن**
**دوو شیرەوو نەو عەرووس و بیکرن**(٥)

ئەو بەیتە شیعرانەی کە (دکتۆر زازا) رەخنەی لێ‌گرتوە ، لە کۆتایی بەندی پێنجەمی داستانەکەدان ، بەڵام هەرگیز شاعیرەکەمان مەبەستی ئەوە نەبوە کە سەرچاوەی ناوەرۆکی شاکارەکەی بشارێتەوە . چونکە پێشی ئەم برە شیعرانەو لە هەمان بەندا گوتوویە :

**نەغمێ وە ژ پەردەیێ دەرینم**
**زینێ ئومەمێ ژ نوو ڤەژینم**
**هەندەك ژ فەسانەیێد بۆهتان**
**هەندەك د بەهانە هن د بوهتان ،**

کەواتا مەبەستی شاعیر ئەوەبوە کە ئەفسانەی دڵداریی هەرێمی (بۆهتان = بۆتان) زیندوو بکاتەوە . لام وایە دەستنیشان کردنی سەرچاوەی داستانەکەی ئەوەندە ئاشکرایە کە هیچ رەخنەیێك هەڵنەگرێ . جگە لەمەش ، دەشێ کە لە سەردەمی (خانی)و هەتا لە سەردەمی (مەلای جزیری)شدا ، ئەم داستانە هەر بەناوی (مەمو زین)ەوە ناودار بووبێ‌و ناوی (مەمی ئالان)ی لە دوای سەردەمی ئەواندا وەرگرتبێ . ئاشکراشە ، لە کوردستانی خوارووشدا ، هەر بەهەمان ناوی (مەمو زین)ەوە ناسراوە .

بەمەزەندەی خۆم ، مەبەستی (خانی) لەو برە شیعرانەی پێشەوەدا ئەوەبوە ، کە لاسایی هیچ شاعیرێکی نەکردۆتەوەو دەستی بۆ شوێنەواری کەسێکیتر درێژ نەکردوە :

**لێ من ژ رەمزان نەکر (تمتع)**
**ماندی دزان ب کەس (تتبع)**

مەسەلەی (شیعر دزین = السرقة الشعرية)ش ، هەمیشە رەخنەگرەکانی سەدەکانی ناوەراستی خەریك‌کردوە(٦) .

راستیەکەی ، (خانی) ، ناوەرۆکێکی ئەوتۆی بۆ شاکارەکەی هەڵبژاردوە ، کە موڵکی گیانیی نەتەوەی کوردبوەو لە پێش ئەودا ، هیچ شاعیرێك بەلایدا نەچوە . کەچی سەربردەی دڵدارانی وەکو (شیرین‌و فەرهاد)و (مەجنون لەیلا)و . . (یووسف‌و زولێخا) ، ببوون بەناوەرۆکی شیعری بۆ گەلێك شاعیرانی بەناوبانگی وەکو (فردوسی)و (نظامی)و (جامی) . . . زۆریتر .

هەڵبەت ئەوە ئاشکرایە کە شاعیرەکەمان گەلێك شارەزای ئەدەبییاتی عەرەبی‌و فارسی بوەو بەتایبەتیش ، گیرۆدەو سەرسامی کردارەکانی شیعریی (نظامی)و (جامی) بوە ، بۆیێکە نووسیویە :

**گەر عیلمی تەمام بدەی ب پوولەك**
**بفرۆشی تو حیکمەتێ ب سوولەك**
**کەس ناکەتە مێتەری خوە (جامی)**(٧)
**ڕاناگریتن کەسەك (نظامی)**(٨)

هەتا قالبی شیعری مەسنەوی‌ی لە شاعیرانی فارس

وەرگرتووە (مەم‌و زین)شی لەسەر هەمان کێشی (مجنون‌و لیلی)ی (نظامی) ڕێکخستوە ، کە کێشی (بحر الهزج المسدس الأخرب المقبوض المحذوف)ەو ئەمەش تەفعیلەکانیەتی (مفعول مفاعلن فعولن) .

جگە لەمەش ، زۆر سوودی لە بەرهەمەکانی شیعریی شاعیرەکانی گەورەی نەتەوەکانی موسولمان دیتوە ، بەلآم هەرگیز ئەمە ، بە (شیعر دزین) لەقەڵەم نادرێ‌و پێویستی بەپاکانە کردن نیە . بەڵکو ، ئەرکی سەرەکیی شاعیری گەورە ئەوەیە ، کە لە سەرچاوەکانی ئەدەبیاتی نەتەوەکانی دیکە بخواتەوەو ، لەنێو مێرگ‌و گوڵستانەکانیاندا گوڵچنی بکات‌و ئەمجا سەر لەنوێ ، بەزمانی نەتەوەیی خۆیەوە ، باخێکی ئەدەبیاتی تازە دابچێنێ‌و پەروەردەی بکا[٩] .

(خانی) ئەگەرچی ناوەرۆکی شاکارەکەی لە داستانی (مەمی ئالان) وەرگرتوە ، نەیویستوە داستانەکە بەگۆشت‌و ئێسقانەوە بڕنێتەوە . بۆیێکە دەستکارێکی زوری تێدا کردوە ، بەلآم وەك لە شوێنی خۆیدا روونی دەکەینەوە ، هەموو هەڵوێستەکانی درامایی پاراستوە . بێجگە لەمەش ، بەهۆی کەسەکانی داستانەکە ، ویستوویەتی بڕ لەبیرو باوەڕییەکانی خۆی بکات :

**شەرحا غەمی دل بکەم فەسانە**
**زینێ ئومەمێ بکەم بەهانە**

کەواتا ، بەرامانی (خانی) شیعر (هۆ) بوە نەك (ئامانج) ، بێگومان ، هەر ئەمەشە فەرمانی هەموو شاعیرانی رابەرو خاوەن پەیام .

ئەمجا ، بەم رامانەوە ، (خانی) ڕووداوەکانی داستانەکەی ئەوتوو کردوەو سەر لەنوێ لە (٢٦٥٥) بەیتە شیعراندا داڕشتۆتەوەو بەسەر (٦٠) بەندانداد ، دابەشی‌کردوەو دەتوانین بیکەین بە سێ بەشی سەرەکی[١٠] .

١ – دیباچە : حەفت بەندی خایاندوە . بەندی (١ ، ٢ ، ٣ ، ٤) کە سەرجەمیان (١٨٨) بەیتە شیعرن ، لەبارەی ئایین‌و فەلسەفەو تەسەووف‌و مەدحی پێغەمبەرن . بەندی (٥ ، ٦ ، ٧) کە (١٧٣) بەیتی شیعرن ، لەبارەی کوردایەتی‌و هۆی دانانی کتێبەکەی بەزمانی کوردی‌و ئاشنا کردنی خوێنەر بەداستانەکەیە .

٢ – ناوەرۆکی چیرۆکی : کە سەربردەی ئەڤینی دڵدارو دلبەرەکە دەگێڕێتەوە ، (٤٩) بەندی خایاندوەو سەرجەمی (١٩٤٨) بەیتی شیعرن .

٣ – کۆتایی : لە چوار بەندان پێکهاتوەو (٢٤٦) بەیتی پڕ کردۆتەوە .

هەڵبەت لەبارەی شێوەی قافیەکاری ، لەبابەتی شیعری مەسنەوی‌یە ، واتا دوو میسراعی هەر بەیتە شیعرێکی لەسەر یێك قافیەن .

بێگومان لە ئەندازەبەدەر ، ووشەو زاراوی بێگانەی تێدا هەیەو شاعیر ، گەر بیویستایە ، دەیتوانی لەجیاتی بەشی هەرە زوریان ووشەی کوردی پەتی بەکار بهێنێ . هەر چۆنێك بێ ، لە خوێندنەوەی (مەم‌و زین) ئەوە ئاشکرا دەبێ کە شاعیرەکەمان شارەزای هەموو شێوەکانی زاری کرمانجیی سەردەمی خۆی بوەو سوودی لە هەموویشیان وەرگرتوە :

**بۆهنی ئو مەهمەدی‌و سلێفی**
**هن لەعل‌و هنەك ژ زێرو زیفی**
**خەمر موهرەوو مۆرەك‌و مراری**
**هندەك دە شەفاف‌و هن دەتاری**
**تەرسیع کرن وەکی بچووکان**
**ئینانە ب قەیسەری ئو سووکان**

ڕاستیەکەی سەرتاپایانی مەم‌و زین ، بەزمانێکی ئەوتۆی کوردی نووسراوە ، کە ئەو خوێنەرەی بەشێوەی کرمانجی خوارووش دەدوێ ، دەتوانی بەئاسانی لێوەی حاڵی‌بێ . لەم بارەوە لە شیعری (مەلای جزیری) ، زۆر پتر ، شێوەی یەکیەتی زمانی ئەدەبیی کرمانجی دەنوێنێ .

بۆ پشتگرتنی ئەم ڕایە ، ئەم وێنەیە دەخەینە بەرچاوی

خوێنەر : ئێستا ، لە زاری کرمانجی ژووروودا ، بەرامبەر بە ووشەی (باب)و (مام)ی کرمانجی خواروو ، ووشەی (باڤ)و (ئاپ) بەکار دەهێندرێن . کەچی (خانی) هەمان ووشەکانی شێوەی خوارووی بەکار هێناوە :

**ئـەمما وی ژ جومـلـە خـاس‌و عـامـان**
**ژ ئـەو چـەنـدە بـراوو (بـاب)و (مـام) ان**

هەروەها :

**مـەم ژی لـەوی عـاشیـقـەك تـەمـام بـوو**
**تـەشبیهـی بـراوو بـاب‌و مـام بـوو**

ئەم لایەنە گرنگەی زمانی شیعری‌ی (خانی) ، وەنەبێ بەرێکەوت بووبێ ، بەڵکو ، بەمەبەست بوە ، بۆیێکە ، بەشێوەیێکی بەرچاوتر ، لە فەرهەنگی (نەوبەهار)یدا خۆی دەنوێنێ .

گوتمان ، (مەم‌و زین) ، لە (٦٠) بەنداندا هۆنراوەتەوە . لێرەدا دەبێ ئەم لایەنەش بخەمە پێش‌چاو ، کەهەر بەندێکی ، عینوانێکی هەیەو لە رستەیێك یان پتری ، گەلێك شیرین‌و سەجەعداردا ، دارژراوە . بەداخەوە ، لە چاپەکانی چاپخانەی (کوردستان) ، سەرناوەکان ، بەکورت‌کراوەیی خراونەتە سەر شێوەی خواروو . هەتا ، لە هەر دوو چاپەکانی تازەی (ئەستەمبۆل) کە مامۆستا (محمدامین بوز أرسلان) ، بەتیپی لاتینی چاپی‌کردوون ، دیسان دەستکاری هەموو عینوانەکانی کردوە . بۆیێکە کاتی ئەوە هاتوە ، کە دەزگایەکانی رۆشنبیری کوردی ، بەبێ دەستکاری کردن ، چاپێکی تەواوی ئەم شاکارە ، بخەنە بەردەستی خوێنەران . ئیتر ، بۆ ئەوەی بزانین تا چ رادەیێك شاعیرەکەمان ، پێڕەوی داستانی (مەمی ئالان)ی کردوەو ، هەروەها بۆ ئەوەی بتوانین ، هەردووکیان لەگەڵ یەکتر بەراوورد بکەین ، پێویستە کورتەی چیرۆکەکەی (خانی)ش ، بەخوێنەر بناسێنین :

**کورتـەی مـەم‌و زین - ی- خـانی**

● (میر زێندین) ، میری (جزیرێ بۆتان) بوەو دووخوشکی زۆر شۆخ‌و شەنگی هەبوە ، گەورەکەیان ناوی (ستی)و ئەوی دیکەیان ناوی (زین) بوە :

**یـەك زێدە شرین‌و زیـادە مـەحـبووب**
**یـەك رووحی قـلووب‌و حووری مـەقـلووب**
**یـەك ئـەسمەرو یـا دووێ زەری بوو**
**یـەك حۆری ئو یـا دووێ پـەری بوو**

● لە سەراو بارەگایدا ، چوار لاوی ئازاو رەشید هەبوون . (تاجدین‌و عارف‌و چەکۆ) ، برا بوون‌و کوری (ئەسکەندەر)ی وەزیری میر بوون . چوارەمیان ناوی (مەم) بوەو کوری دەبیر (سکرتێر)ی میر بوە . (تاجدین)و (مەم) دوو برادەری گیانی بەگیانی‌و گەلێك دلسۆزی یەکتری بوون .

● دەرگەوان (حاجب) ، یاخود گزیری میر ناوی (بەکری مەرگەوەڕی) بوەو پیاوێکی لەئەندازە بەدەر خراپ‌و بەدکار بوە :

**شاگردی شەئـامـەتـا وی شەیـتـان**
**شەرمـەنـدە ژگۆهـتـنـا وی بوهـتـان**

● بەپێی دەستووری هەرە لەمێژی ئەوسا ، لە رۆژی (جەژنی نەورۆز)دا ، هەموو خەڵکی (شاری جزیرێ) ، دەست لە ئیش‌و کاریان هەڵدەگرن‌و دووکان‌و قەیسەری‌یان دادەخەن‌و بۆ گەشت‌و سەیران روو لەباخ‌و مێرغوزاران دەکەن :

**دەورا فـەلـەکێ ژ بـەختی فـەیـرۆز**
**دیسـان کو نومـا ژ نووڤە نـەورۆز**
**مـەبنی لـەوی عـادەتی موبـارەك**
**شەهـری ئو سوپـاهـیـان ب جـارەك**
**بـاژێرو کـەلات‌و خـانی بـەردان**
**تـەشبـیـە ب نـەژدیـان‌و جـەردان**
**سەف سەف دەمـەشیـنـە کۆهو دەشتـان**
**رەف رەف دەخشـیـنـە سەیـرو گەشتـان**

● (ستی‌و زین) بۆ ئەوەی نەناسرێن ، جل‌و بەرگی پیاوانە

دەکەنە بەرو (تاجدین‌و مەم)یش ، بۆ هەمان مەبەست جل‌و بەرگی ژنانە لەبەردەکەن . هەر چواریان لەنێو حەشاماتی شاردا تووشی یێکدی دەبن . یەکسەر ، (تاجدین) گیرۆدەی (ستی)و (مەم) گرفتاری (زین) دەبێ . بۆ نیشانەکردن ، هەر دلدارێك ، ئەنگوستیلەی لەگەڵ هی دلبەرەکەی دەگۆرێتەوە . ئیتر هەر چوار دڵدارو دلبەر بەدەری ئەڤینێ نەخۆش دەکەون ، بەلام دەردی(مەم)و (زین)ێ ، گەلێك لەدەردی (تاجدین)و (ستی)یێ ، دژوارترو کوشندەتر دەبێ .

● دایەنی (ستی‌و زین)ێ ، پیرەژنێکی ناو (حەیزەبوون) بوە ، ئاگاداری رازی هەردوو نازدارەکان دەبێ‌و سەری لەوە سوردەمینێ کەچۆن کچ گیرۆدەو دلبەندی کچ دەبێ ! دەیەوێ ئەم رازە نهێنە بدۆزێتەوەو ئەم گرێیە ئالۆزە بکاتەوە .

● بەیارمەتی پیرەمێردێکی فالگرەوە ، سۆراخی دڵدارەکان دەکاو دەزانی کەناویان (تاجدین)و (مەم)ە . ئەمجا هەر چواریان ئاگاداری هەواڵی یێکتر دەکا .

● (تاجدین) داخوازیی (ستی)یێ لە (میر) دەکاو ئەمیش رازی دەبێ‌و بووك دەگوازرێتەوە . (تاجدین) هەولێدەدا کە (میر) لە بارەگای خۆی (بەکر) دووربخاتەوە ، بەلام (میر) نەسەلمێنێ بەبیانووی ئەوەی کە مرۆڤی کاربەدەست‌و فەرمانرەوا ، ئەگەر بەدەستێکی داد ببەخشێ دەبێ بەدەستی دیکەی زۆرداری بکا . بۆیێکە ، هەر میرو فەرمانرەوایێك ، پیاو خراپێکی وەکو (بەکری مەرگەوەری)ی ، پێویستە ، دەنا ، فەرمانرەوایی بۆ ناکرێ .

● (بەکر)یش ، خەریکی ئەوەدەبێ دلی (میر) لە (تاجدین) برەنجێنی‌و ئەوەی بە بەرگوێیدا دەچرپێنی کە نەدەبوو (ستی) بداتە یەکێکی وەکو (تاجدین) چونکە هەموو شازادەکانی دەوروبەری وولاتی (جزیرێ) بەهیوای هێنانی بوون . جگە لەمەش لەوەتی (تاجدین) بوە بەزاوای (میر) ، لەخۆی بایی‌بوەو ، هەتا ، بەبێ پرسی میر ، گوفتی بە (مەم) داوە (زین)ی بۆ بخوازێ .

● (میر) بەم قسانەی (بەکر) گەلێك پەست‌و دڵگیردەبێ‌و پیێ‌ی دەڵێ : ئەگەرچی لە دڵی‌خۆیدا وای تەمابوە کە (مەم) بەم شەرەفە سەر بڵندبکا ، بەلام ئیتر تاهەتا (زین)ی لێ حەرام دەکا .

● گڵپەی ئەڤینداری (مەم)و (زین)ێ رۆژ بەرۆژ توندتر دەبێ‌و کار لە تەندروستی‌و لە ژیانی رۆژانەیان دەکاو ، بەم دەردەوە بەتەواوی نەخۆش دەکەون .

● رۆژێك ، میر بەدەست‌و پێوەندەوە بۆ راووشکار دەچێ‌و شاری جزیرێ نیوە چۆل دەبێ . (زین) ئەم دەرفەتە بەهەل دەزانی‌و دەیەوی ماوەیێك لەنێو باخەکەی میردا بگەرێ .

● (مەم)یش ، لە تاوی جۆش‌و خرۆشی ئەڤینداری ، بۆهەمان شوێن دەچێ‌و دەیەوی کەمێك لەنێو باخی میردا ، بگەرێ‌و بحەسێتەوە . (دڵدار)و (دلبەر) ، لەنکاو روو بەرووی یەکتردەبن‌و بەم رێکەوتە گەلێك بەختیاردەبن . دەست لەنێو دەست بۆ شانشینە شووشەبەندەکەی نێو باخەکە دەچن . خەریکی هەڵرشتنی رازو نیازی دڵداری دەبن ، بەلام هەرگیز لە سنووری ئەڤینی پاك دەرناچن :

**عـــیشــــقـــا کو ژ سەر حـــەدی کـــەمــــالـــە**
**ئـــــاڤا کو ژ مـــــەنــــبــــەعی زولالــــــە**
**ئــەلــبــەتـــە خوە دێ بــکــەت حــراسەت**
**نـــاکـــەت چ قـــەبوولـــیـــا نـــەجـاسەت**

● کاتی هێوارێ (میر) ، بە لەشکرەوە لە راوو شکار دەگەرێتەوە . فەرمان بەنۆکەرەکانی دەدا نێچیرەکان بەرەللای نێو باخەکەی بکەن‌و پیاوە ماقوولەکانیش لەگەڵ خۆی بۆ شانشینەکەی نێو باخەکەدەبا .

● (مەم‌و (زین) ، لە دەنگ‌و هەرای سواران لە خەوی شادومانی رادەچلەکێن . مەم ، (زین)ێ لەپشت خۆیداو لەژێر عەباو فەروەی سەرشانیدا دەشارێتەوە .

● کە (میر) بەژوور دەکەوێ ، هەست‌دەکا شوێنەکە چۆل‌نیە ، بەدەنگێکی بەرز دەپرسێ ، داخوا دەبێ کێ‌بێ پرسی

ئەو هاتبێتە ئەم شوێنەی کە قەدەغەیە ! (مەم) وەڵامی دەداتەوە کە ئەم هاتۆتە نێو باخەکە ، لەتاوی دەردەکەی گرانیو سەبارەت بەوەی نەیتوانیوە لەگەڵیاندا بۆ راوو شکار بچێو تکای بەخشینی لێدەکا .

● (میر) تکاو عوزری (مەم) قەبوول دەکاو لێی دەپرسێ ئایا هیچ نیچرێکی لەنێو باخەکەدا راونەکردوە ؟ (مەم) وەڵامی دەداتەوە ، کارمامزێکی ئەوتۆی لەنێو باخەکەدا دیتوە کە لەدەشتی (خوتەن)ێدا هاوتای نیە .

● (تاجدین) ، لەوڵامەکەی (مەم) حاڵی دەبێو دەزانی لەگەڵ (زین)ێدا بوە ، بۆیێکە بە (میر) دەڵێ : وادیارە (مەم) هێشتا دەردەکەی سووک نەبوەو وورێنان دەکا .

● (مەم) لە قۆڵی عەبایەکەیەوە ، کەزی (زین)ێ نیشانی (تاجدین) دەدا . ئەمیش بێ وەستان ، بەپەلە کۆڕەکە بەجێ دەهێڵێو دەگەڕێتەوە ماڵی خۆیو بە (ستی)ی خێزانی دەڵێ :

**تـــفـــلێ خوە خـــەلاس کـــە دێ بچـــیت مـــال**
**مـــــال بۆ من و هـــا ژ بۆ تـــــە مـــــندال**
**سەرمـــــایـــــەیێ عومـــــرو زیـــــــندەگانی**
**یـــــــــەعنی مـــــــــەم و زین ب دل گرانی**
**مـــایـــــیـــــنـــــە د وەرتـــــەیـــــا بـــــەلایێ**
**من قـــــەسدە کو ئـــــەز بـــــدەم رەهـــــایێ**

ئەمجا ، ئاگر لە ماڵی خۆی بەردەداو ، لە شاری جزیرێ دەبێتە بانگو هاوار .

● (میر) لەگەڵ هەموو خەڵکی شار ، بەهاواری (تاجدین)و (ستی)یێوە دەچن . (زین)یش ، بەپەلە دەگەڕێتەوە حەرەمسەرایێ .

● کەچی ئەم رازە پەنهان نامێنێتەوە . (بەکر) هەواڵەکە بە (میر) دەگەیێنێو ئەمیش ئاگری رکو کینەی بەرامبەر بە (مەم) دادەگیرسێ .

(بەکر) ، (میر) هێمن دەکاتەوەو پیلانی لەناو بردنی (مەم)ی بەم چەشنە بۆ دادەنێ : (میر) ، بۆ دیوەخانە (مەم) بانگکێش بکاو لەسەر دڵخواز یاری شەترەنجی لەگەڵدا بکا . ئەمجا (مەم)یش کە شێتی ئەڤین بوەو هۆشی لەسەرخۆ نیە ، بێگومان یارییەکە دەدۆڕێنێو لەسەر داخوازی (میر) رازی دڵی خۆی دەدرکێنێ ، ئەمیش بیانووی بۆ دەبێ کە بەشێوەیێکی هۆشمەندانە سزای بدا .

● (میر) ، لە شانشینەکە ، کە بەرامبەر بەکۆشکو سەرای (زین)ێ بوە ، کۆڕی بەزمو ئاهەنگ سازدەکاو فەرماندەدا (مەم)ی بەتەنیا بۆ بانگبکەن بێئەوەی تاجدینو برایەکانی پێبزانن ، چونکە بێ ئەدەبێیکی گەورەی کردوەو دەیەوی جەزرەبەی بدا .

● یەکێك لە ئەفسەرە لاوەکانی بارەگای (میر) ناوی (گورگین) بوەو زۆر دلسۆزی (تاجدین) بوە ، خێرا ، لە هەواڵەکەی ئاگاداردەکا .

● تاجدینو برایەکانی خۆیان بۆ شەرکردن ئامادە ، دەکەنو بۆ بارەگای (میر) دەچن . (مەم) کە چاوی بە هەڤاڵەکانی دەکەوێ سەودای دەبێتەوەو لەسەریەك ، سێدەست یارییان لە میر دەباتەوە .

● لەوکاتە دا ، (بەکر) لە پەنجەرەی کۆشکەی بەرامبەریا ، کە (مەم) پشتی لێیەوەبوو ، (زین) دەبینێو بەمیر دەڵێ : بە پێی دەستووری یاری شەترەنج دەبێ ئەمجا جێگاتان بگۆڕنەوە :

**گۆ : بـــەنـــدو لـــیـــزو جێ ب دۆرن**
**هوون هـــەردوو جـــەهـــان ب هـــەڤ بگۆڕن**

● (مەم) لە شوێنی تازەیدا ، لە دوورەوە (زین) دەبینێو بەخەیاڵی یارەوە ، شەش دەست یاری دەدۆڕێنێ .

● (میر) – داوای لێدەکا ، کە مەرجەکە بەجێ بهێنێو رازی دڵیخۆی بۆی ئاشکرابکاو ناوی دلبەرەکەی هەڵبدا . (بەکر)یش بۆ ئەوەی (مەم) بوورژێنێو رازەکەی پێ بدرکێنێ بەمیر دەڵێ : میرم ، دلبەرەکەی (مەم) ئافرەتێکی ئەوتۆ نیە کە لە پێش ئێوەدا ناوی بهێندرێ ، چونکە بەخۆم دیتوومەو

قولەرەشێکی لێو کوتراوی رەنگ وەکو قیرە .

● (مەم) ، بەم قسەیەی (بەکر) دەماری دەگیرێ‌و هۆشی لەسەردا نامێنێ‌و قسەکەی بەکر بەدرۆ دەخاتەوەو دەڵێ ، یاری ئەو جوانترین ئافرەتەو شازادەیێکە بەناوی (زین) .

● (میر) یەکسەر فەرمان بە سەربازان دەدا (مەم) بگرن‌و بیکوژن . تاجدین‌و برایەکانی ، لەسەر (مەم) بەدەنگ دێن‌و بەناچاری (میر) لەجیاتی کوشتنی ، فەرمان‌دەدا دەست‌و پێ‌ی زنجیر بکەن‌و بیخەنە نێو زیندان .

● (مەم) لەنێو زیندانێدا ، بە دینداری‌و خوداپەرستن خەریك‌دەبێ . ئاگری ئەڤینی رۆژ بەرۆژ گەشتردەبێ‌و لەخڵتەی ئارەزووی جهانی پاك دەبێتەوەو لەگەشتی گیانبازیدا بەقۆناغی زانایی دەگاو دەرگای غەیبی بۆ دەکرێتەوە . (زین)یش بەهەمان رێگادا هەنگاو دەنێ‌و بەرە بەرە ، بەرەو ئەڤینی خودایی بەرز دەبێتەوە .

● تاجدین‌و برایەکانی ، دەیانەوێ بەخۆشی بێ یان بەناخۆشی ، (مەم) لە زیندان رزگاربکەن‌و دەرمانی دەردەکەی بکەن . بۆ ئەم مەبەستە ، جوامێرێك ، بۆ بارەگای (میر) دەنێرن :

**گوتێ ، هەمرە بێژە میرو ئاغان**
**بێنەندە ڤەنا کوژن چراغان**
**میری مە ، ئەگەرچی دووربینە**
**ئیرۆ وی دچاڤ نووز نینە**

● (بەکر) هەست بەمەترسی دەکاو دەزانێ کە تاجدین‌و برایەکانی ئەو هەموو کارەساتە لەئەو دەناسن بۆیێکە ئامۆژگاری (میر) دەکا ، کە (مەم) ئازادبکاو گوفتی (زین)ی‌ی پێ‌بداو لەپاشاندا ، بەفنجانێکی ژەهراوی چارەی‌بکا .

● (میر) ، (مەم) دەبەخشێ‌و رێگای (زین) دەدا بچێتە زیندان‌و بەدەستی‌خۆی دڵدارەکەی ئازادبکا . لەو کاتەدا ، (زین) بێهۆش دەکەوێ‌و گیانی ، لەگەڵ گیانی (مەم) ، لەنێو تاریکایی زینداندا وەك دوو برووسکەی زیوین‌و زێرین ، بەیەکتر دەگەن‌و بەرەو ئاسمان بەرزدەبنەوە .

● کە (زین) بەهۆش دێتەوە ، ئەم هەواڵە بۆ (میر) دەگێرێتەوە ، ئەمیش باوەری بەپاکی‌و خاوێنی ، ئەڤینەکەیان دەکا .

● کە (زین) بۆلای دڵدارەکەی دەچێ ، دەبینێ بێهۆش کەوتوە . کە بانگی دەکا ، یەکسەر بەخۆدێتەوەو ، لەوەی حاڵی‌دەکا کە کار لەکار ترازاوەو کاتی مردنی نزیك بوەو ، شایی‌و زەماوەندی ئەوان لەو دنیادا دەبێ‌و مارەیی ئەوان لە ئاسمانا براوە . ئەمجا ، لەگەڵ دلبەرەکەی باوەش لە یەکتر دەگرن‌و لە ئامێزی یارەکەی گیانی دەسپێرێ .

● لە دووای شێوەن‌و گریان ، بە دەبدەبە (مەم) دەشاردرێتەوە . (تاجدین)یش بەکر دەکوژێ‌و لەنێو دارستانێکدا لاشەکەی فرێ دەدەن . کە (زین) بەمە دەزانێ ، وەسیەت‌دەکا ، لاشەی (بەکر) لە نزیکی گۆری ئەم‌و گۆری (مەم) بشاردرێتەوە ، چونکە ئەو بوە بەهۆی ئەوەی کە ئەڤینەکەیان بەرەو ئەڤینی خودایی بەرز بێتەوە .

● (زین) بۆ سەر گۆری (مەم) دەچێ‌و کێلەکەی لە ئامێزدەکاو بەشیوەنە بەناوبانگەکەی دەیلاوێنێتەوە :

**روونیشت ل بەر سەری مەمی ژار**
**مەم کر ب تەکەلوومی خەبەردار**
**کای مالکی مولکی جیسم‌و جانی**
**ئەمز باغچەئو تو باغەبانی**
**باغی تە گەهاندی بێ خودانە**
**بێ رووبی تە ئەو ژ بۆ چرانە ؟**
**ئەڤ خاڵ‌و خەت‌و عوزارو گوڵزار**
**ئەڤ حوسن‌و جەماڵ‌و باغی روخسار**
**بادامی سیاو چەشمی شەهلا**
**نارو بەهو سێی شاخی بالا**
**خۆش رەنگ‌و ب لەززەت‌و ب تامن**
**بێ شوبهە ل غەیری تە حەرامن**

**نـــــــــــەخلا بــــــــــەدەنــــــــا خوە راوەشینم**

**قێ مـــــــــێوەیێ جومـــــــــــلــــــــــە داوەشینم**

ئیترگیانی پاکی دەردەچیٚو بەماتەمو شیوەن ، لەنێو گۆڕی مەمو لەنێو تابووتی ئەمدا دەیسپێرن .

لەسەر گۆڕی مەمو زینیٚ ، دوو درەختی سەروو سنەوبەر دەروێنو لە نێوانیاندا درەختێکی درکاوی هەڵدەچیٚو لقو پەلەکانی لە لقو پەلەکانی هەر دوو داری سەروو سنەوبەرەکە دەئاڵیٚو ناهێڵێ تێکەڵی یێکدی بن .

● پیرەمێردێکی پیاوچاك ، لە خەونێکیدا ، (بەکر) لە شێوەیێکی نوورانیدا دەبینیٚو لەبەر دەرگای کوشکێکی هەشت نهۆمیدا راوەستاوە . کە لە ئەحواڵی دەپرسیٚ ، وەلاٌمی دەداتەوە کە بوە بەدەرکەوانی بارەگای (مەم) و (زین)و لە کۆشكو سەرای ئەواندا ، نهۆمێکی بۆ تەرخانکراوە ، چونکە ئەو بوە بەهۆی پاکیو پیرۆزیی ئەڤینەکەیان . هەروەها ، (پەروەردگار) (تاجدین)یشی لە تاوانی کوشتن بەخشیوە ، سەبارەت بەوەی کە خەڵکی لە بەدکاری ئەو رزگار کردوە .» .

## بەراووردکردنی ناوەرۆکی (مەمو زین)ی (خانی) لەگەڵ ناوەرۆکی داستانی مەمی ئالان

لە بەراووردکردنی ناوەرۆكو رووداوەکانی هەردوو چیرۆکەکان ئەوە ئاشکرادەبیٚ کە (خانی) دەستکارێیکی زۆری لە ناوەروکی داستانەکەی فۆلکلۆری کردوە ، بەلاٌم زۆر بەهووردی بیری بنچینەییو هەلوێستەکانی درامایی پاراستوە ، سەرەرای ئەوەی کە بەرگێکی سۆفییانەی لەبەر کردوەو نموودێکی تازەی پیٚ بەخشیوە .

چیرۆکی (مەمی ئالان) هەروها شێوەی کرمانجی خوارووی کە بەیتی (کاکەمەمو خاتوونە زین)ە ، لە بابەتی شیعری داستانین (epic) ، ئەم بابەتەش وەك (ئەرستۆ)ی دانا روونی کردۆتەوە ، یەکیەتی (کردارو کاتو شوێن)ی نیەو مەیدانی خەیاڵبازی لەبەردەمی شاعیری داستانیدا بیٚ سنوورە .

کەچی ، بەپێچەوانەی ئەمە ، شیعری (درامیکی تراژیدیك) ، یەکیەتی کردار (فعل)و یەکیەتی شوێن (مکان)و یەکیەتی کات (زمان)ی هەیەو دەبیٚ هەشبیبیٚ . مەبەست لەیەکیەتی کاتْ ، کە رووداوەکان ، ماوەی شەوو رۆژێك بخایێنیٚ»(١٢) .

(مەمو زین)ی (خانی)ش ، گەرچی چیرۆکێکی شیعرییە نەك دراماییکی شیعری ، بەلاٌم نزیکترین بابەتی شیعری کوردییە لە درامای تراژیدیو ، وەکو ئەم بابەتەش ، لە سەرچاوەی ئەفسانەی کۆنەوە ، وەرگیراوە .

داستانی (مەمی ئالان) ، هەروها دەقی کرمانجی خواروویشی ، لە بارەی کات (زمان)ەوە ، لەپێش لەدایكبوونی (مەم) دەستپیٚدەکاو نەك بەمەرگی (دڵدارو دلبەر)ەکان ، بەڵکو بەوێران کردنی شاری (جزیریٚ) کۆتایی دیٚ .

لە بارەی شوێن (مکان)ە وەش ، لە شاری (مەغریبیٚ) یاخود ، (لە شێوەی خواروودا — لە شاری یەمەنیٚ) سەری هەڵداوەو لەشاری (جزیریٚ) کۆتاییهاتوەو بەئەنجام گەیشتوە ؛ کە مەودای نێوانیان شەش مانگ رێگابوە .

لە بارەی ناوەرۆك یاخود کردار (فعل)یش ، سەرەرای سەربردەی دڵدارو دلبەر ، ئەفسانەی کچەکانی شای پەریانو چیرۆکی (خواجەی خدر = خدری زیندە)یان لە دەقی خوارووودا (وەیسەلقەرەنی)و ئەفسانەی (بۆزی رەوان)یشی کۆکردووتەوە لە یێك قالبی داستانیدا دایرشتوون .

کەچی ، چیرۆکەکەی (خانی) ، لە رۆژە جەژنێکی نەورۆزدا دەستیپێکردوەو ، رووداوەکانی ماوەی ساڵێکی خایاندوەو شاری (جزێریٚ)ش ، شانۆی رووداوەکانیەتیو ناوەروکێشی سەربردەی دڵداریی (مەمو زین)ە .

لەمەدا ، دەردەکەویٚ ، کە شاعیرەکەمان ، لە داستانەکەی فۆلکلۆری هەلوێستە گرنگەکانی وەرگرتوەو ، لە

دیمەنی سەر (کانی ی قەستەلی) دەستی پی کردوە ، دوای ئەوەی گەشتو سەیرانەکەی کردوە بە ئاهەنگو کەرنەڤالی جەژنی نەورۆزو بەهۆی تەکنیکی جل گۆڕینی هەر چوار یارەکان ، روخسارێکی دراماپی شیرینی داوەتی .

رووداوی چوونی (میر) بۆ راوو شکار ، لە رووداوی چوونی (میر) بۆ شەری عەجەمانی وەرگرتوەو ، لە هەر دوو حالاندا ، مەبەست چۆل کردنی شانۆی داستانەکەیە – کە شاری جزیری – بوە ، تاوەکو دلدارو دلبەر بتوانن دوور لە چاوی بەدکاران بە یەکتر بگەن .

لێرەدا ئەوەش دەخەینەروو ، کە لەدەق شێوەی خواروودا ، رووداوی شەری عەجەمان نیە ، بەلکو لەمیشدا ، (میر) بۆ راوو شکار دەچی‌و (مەم) سەبارەت بەنەخۆشی ی بەشداری ناکا . رووداوی بەیەکترگەیشتنی (مەم)و (زین) ، لە شانشینەکەی نێو باخی (میر)دا ، هەمان رووداوی بەیەکترگەیشتنی دلدارو دلبەرە ، لە حەرەمسەرای (میر)دا .

(مەم)ی (خانی)ش ، وەکو (مەم)ی هەموو دەقەکانی فۆلکلۆری (زین)ی لەژێر عەباو فەروەی سەرشانیدا دەشارێتەوە ، کە (میر) بەغافلەتی بەسەریاندا دەچی ، هەروەها ، لە قۆلی فەروەکەیەوە ، کەزی زینی نیشانی (تاجدین = حەسەن = قەرەتاژدین)دەدا .

(تاجدین)ی (خانی)ش ، وەکو (حەسەن)ی مەمی ئالان یاخود قەرەتاژدینی شێوەی خواروو ، ئاگر لە مالی خۆی بەردەدا لە پێناوی رزگارکردنی دلدارو دلبەرەکە .

بەلام ، ئەوەندە هەیە ، لەم هەلوێستەی دواییدا ، چیرۆکی (مەمی ئالان) دەگاتە پلەی گۆران (نقطة التحول)و ئاورێژی لووتکەی (climax) ، کەچی (خانی) ، ئەم هەلوێستەی بۆ رووداوی (یاری ی شەترەنج) هێشتۆتەوە ، ئەم رووداوەش ، لە هەموو دەقەکانی ئەم داستانە ، دەبێتە هۆی زیندان کردنی (مەم)و لە ئەنجامدا ، مردنی خۆی‌و دلبەرەکەی . هەروها ، لە هەردوو دەق چیرۆکەکەدا ، پەشێمان بوونەوەی (میر) دوای ئەوە دەبی کە کار لەکار دەترازی‌و سەرەنجامی (بەکر)یش ، وەکو (بەکۆیی ئاڤان) بەکوشتن هاتوەو ، لەگۆریشدا ، بوە بەدرکی نێوانی دلدارو دلبەرەکە .

کەواتا شاعیری گەورەمان ، لە داستانی سەرزاریدا ، ئەو هەلوێستو رووداوانەی وەرگرتوە ، کە یێك سەربردەیەو لەماوەی سالێکداو لەیێك شوێندا قەوماوەو کردوویە بە کردارێکی ئەدەبی ی ئەوتۆ ، کە یێك سەرەتاو یێك لووتکەو یێك کۆتاپی هەبی[13] ، ئەمەش تەواوترین هەیکەلی هونەری رۆمانو دراماپە[14] .

## لیکدانەوەو شی‌کردنەوەی کەسەکانی (مەمو زین)و (مەمی ئالان) :

(دکتۆر زازا) لە پێشگۆتنی (مەمی ئالان)یدا ، هەندی لایەنی مێژوویی‌و هەندی لە ئاکارو سایکەی کەسەکانی شی‌کردۆتەوەو هەلوەستێکی تایبەتیشی لەسەر ناوی (میر ئەزین) کردوە .

(خانی) ، (میر ئەزین)ی فۆلکلۆری ی کردوە بە (میر زێندین – زین‌الدین)و رچەلەکی بردۆتەوە سەر (خالیدی کوری وەلید) . راستیەکەی میرەکانی (جزیری بۆتان) ، بەم چەشنە رچەلەکی خۆیان دیاری کردوەو (شەرەفخان)یش ، لە (شەرەفنامە)یدا ، هەمان شتی تۆمار کردوە . کەچی ، (ئەمین زەکی بەگ) ، ئەوەی روون کردۆتەوە ، کە نەوەی ئەم پالەوانەی ئیسلام ، بەووجاخ کوێری مردوونو میراتگریان لەدوا بەجی نەماوە[15] .

کەواتا ، هەر دوو ناوەکان خەیالین‌و هیچ میرێك بەناوی (ئەزین) یان (زێندین – زین‌الدین) ، لە وولاتی (بۆتان)دا ، فەرمانرەواپی نەکردوە ، مەگەر (میر عزالدین)ی کوری (میر ئەبدال) نەبی کە هاوچەرخی (تەیموری لەنگ) بوە . شەرەفنامە ، سالی مردنی ئەم میرەی نیشان نەداوە ، بەلام کە (تەیموور) ، لە سالی (١٤٠٥)دا مردبی‌و ، (مەلای

جزیری)ش ، داستانی دڵداری (مەمو زین)ی کردبێ بەنموونەی ئەڤینی پاکو پیرۆزو لەتا تەرازووی داستان دڵداریی (فەرهادو شیرین)ی دانابێ ، ئەوا هیچ ڕای تێ ناچێ کە ئەم (میر عزالدین)ە ، هەمان (میر ئەزین)ی فۆلکلۆری یان (میر زین‌الدین)ی خانی بێ .

(تاجدین)ی (خانی)ش ، بەرامبەر بە (حەسەن)ی (مەمی ئالان)و هەر وەها ، بەرامبەر بە (قەرە تاژدین)ی شێوەی کرمانجی خوارووە . بەڵام بەهەر سێ ناوان ، هەمان کەسایەتی هەیەو ، پەیکەری زیندووی (پیاوەتی – ئازایی – جوامێری)یە ، بەم واتایانەی کەسایکەی نەتەوەیی کورد ، لە مێژووی دوورو درێژیدا ، تەشخیسی کردوە ، بۆیێکە دەوری هێزی لایەنگری سەرەکیی داستانەکە ، واتا (مەم)و (زین) دەبینێ ، ئەمەش لە هونەری چیرۆکو ڕۆماندا پێی‌دەگوترێ (Protagonist) .

دژو بەرامبەری ئەم کەسایەتییە ، (بەکۆیی ئاڤان)ی فۆلکلۆری یان (بەکر مەرگەوەری) خانی وەستاوە ، کە هێزی بەرانگژی ئەڤینی (مەم)و (زین)ە ، ئەمەش وێنەی زیندووی (قسەی بەدو بیری بەدو کرداری بەد)ە ، کەسایکەی نەتەوەی کورد ، لە مێژووی لە مێژەوەی ، بەم چەشنەی تەشخیس‌کردوە . دیارە ، ئەمیش ، بەپێی هونەری ڕۆمانو دراما ، دەوری هێزی بەرانگژ (ضد)ی کەسەکانی سەرەکی چیرۆکو داستانەکە دەبینێو پێی دەگوترێ (Antagonist) .

(چەکۆ) ، لە هەموو دەقەکاندا ، هەمان کەسە ، بەڵام (عارف)ی (خانی) بەرامبەر بە (تاجین)ی مەمی ئالانە .

(ستی)ش ، لەهەموو شێوەو دەقەکانی ئەم چیرۆکەدا ، وێنەی ئەو ئافرەتە دەنوێنێ ، کەسایکەی نەتەوایەیان ، بەسەر دەستەی ڕەگەزی ئافرەتی دەناسێ : جوانو دلۆڤانو کابانو داوێنپاکو هێمن ، بەڵام دەوری لەداستانی فۆلکلۆریدا ، گەلێك بەهێزترە .

کەسایەتی (مەمی ئالان) گەلێك لە کەسایەتی (مەم)ی (خانی) بەرچاوترەو ، دەورێکی زیندووترو فراوانتری هەیە ، هەرچەندە هێشتا بەمێردمنداڵ دەژمێردرێ ، کەچی لەبارەی ڕەووشتەوە ، لەهی ئەم‌نزمترە .

(زین)ی (خانی)ش ، لە (زین)ی فۆلکلۆری ، هێمنترو شەرمنترو لەسەرخۆترەو ، هەرگیز ئەوەی بەبیردا نەهاتوە ، لە سنووری دەستوورو نەریتی خانەوادەکەی دەربچێ . دیارە ، ئەم دڵدارو دلبەرەش ، وێنەی ئەو عاتیفەی بەرزی خۆشەویستین ، کە نەتەوەی کورد ڕیزی‌گرتوەو بەپیرۆزی زانیوە .

کورتەی قسە ، هەموو کەسەکان لەهەردوو شێوەی چیرۆکیو داستانیدا یێکن‌و هەمان دەوری خۆیانیان دەبینن . هەر بۆیێکەش ، بیری بنچینەیی (مەم‌وزین)ی (خانی) ، وەکو هی (مەمی ئالان) لەسەر بناخەی زۆرانبازی لەنێوانی (چاکی)و (بەدی)دا ، دامەزراوەو ئادەمیزادی بەرامبەر بەهێزی (چارەنووس) ، بەندەوار (مسیر) کردوە .

هەتا شاعیرەکەمان ، عاتیفەی ئەڤین‌و خۆشەویستیشی داوەتە پاڵ هێزی بێ‌سنووری (پەروەردگار)و بەم چەشنە ، سەرچاوەی ئەم هەستە بەرزو ناسکەی لێکداوەتەوە :

**لەورا کو جنوودی جان (موجەننەد)**
**چێ بوونە د عیلمی حەق (موخەللەد)**
**هن موئتەلیفن هنەك موخالف**
**هن موختەلیفن هنەك موئالف**
**وان موئتەلیفان ب یەکڤە ئولفەت**
**ئاخر وەکرن ، نەماچو کولفەت**

ئەمەش دەستنیشان‌کردنی ئەم فەرموودەیەی (پێغەمبەر)ە کە دەفەرموێ (الارواح جنود مجندة ، فما تعارف منها ائتلف ، وما تنافر منها اختلف .)

سۆفیێکی نەزەرباز (ابن أبي داود – لە ٢٦٩ك مردوە) ئەم فەرموودەیەی بەم جۆرە لێکداوەتەوەو دەڵێ :

(پەروەردگار) ، لە سەرەتاوە ، لە جهانی لاهووتیدا ،

گـێنی مرۆڤانی لە شێوەیێکی خڕدا دروستکردوەو هەر یەکێکیشی کردوە بەدووکەرت . ئەمجا ، گەر لەم جهانەدا ، دووکەرتەکانی هەر گیانێك ، لە لاشەی دوو مرۆڤاندا ، بەرەورووی یەکتربوون ، ئەوا یەکتری دەناسنەوەو هەردوو کەسەکان گیرۆدەی یەکتری دەبن(١٦) .

راستیەکەی یۆنانییەکانیش ، گەلێك لەوە لەپێشتر ، هەر بەم چەشنە ئەم سۆزو عاتیفەیان لێکداوەتەوە :

بەگوێرەی ئەفسانەیێکی یۆنانی ، ئەندرۆجین Androgne) یێکەمین بابەتی رەگەزی مرۆڤ بوە . مرۆڤی ئەندرۆجنیش هەم نێربوەو هەم مێ . (زەیۆس – گەورەی خوای یۆنانیەکان) ، لیّی دڵگیربوەو کردوویە بەدوو پارچە . ئیتر لەوساوە هەردوو پارچەکانی هەر مرۆڤێکی ئەندرۆجینی بەشوێن یەکتری دەگەڕێن و پەرۆشی بەیەکدی گەیشتنن . ئەمجا کە لەم جهانەدا ، لە لاشەی پیاوو ژنێکدا تووشی یەکتربوون ئەوا عیشقی یەکتر دەبن و دەیانەوی ببنەوە بەیێك کەس(١٧) .

تاوەکو ئێرە باسمان لە سەرچاوەو لە ناوەرۆکی چیرۆکی ی شاکارەکەی شاعیرەکەمان کردوە ، بەلاّم مەبەستی (خانی) هۆناندنەوەی داستانێکی دڵداری نەبوەو بەس ، بەڵکو مەبەستی لەمە گەلێك هەورازتربوە .

وەك لە پێشەوەدا گوتمان ، هەڵبەست و وێژە ، بەرامانی ئەو (هۆ) بوە بۆ ئامانجێکی پیرۆز . هەر ئەم راستیەش شاعیرەکەمانی بۆ ئەودیوی سنووری کات و شوێنی خۆی بەرز کردۆتەوەو کردوویە بەشاعیرێکی جهانی .

(خانی) لە دانانی (مەم و زین)دا دوو مەبەستی سەرەکی ی هەبوە .

یێکەم : ئەوەبوە کە بەهۆیەوە بڕ لەبیرو باوەڕ ییەکانی خۆی بکا ، چ لەبارەی فەلسەفەوەبی و چ لەبارەی تەسەووفەوە .

دوەم : ئەوە بوە ، کتێبێکی وها بەزمانی کوردی پێشکەش بەسامانی بیری مرۆڤ بکا . تائەوە بچەسپێنی ، کە نەتەوەی کوردیش ، خاوەنی میراتێکی گیانی ی ئەوتۆیە ، لە میراتی گیانی ی نەتەوەکانی دراوسی کەمتر نی یە

## پەراوێزەکان

* – «بنوارە – نووسەری کورد – ژمارە «٣» – ساڵی ١٩٨٥» .
١ – ئەم ووتارەش بەشێکی دیکەی دەسنووسێکمانە لەبارەی (مەم و زین) .
٢ – بنوارە ووتاری (مەمی ئالان)ی نووسەر ، لە ژمارە (٣)ی گۆڤاری نووسەری کورد – دا ، ساڵی ١٩٨٥ .
٣ – شرفنامە – تعریب – محمد علی عونی – ج ١ – ص ١٥
٤ – دکتۆر زازا ، لە پێشگۆتنی مەمی ئالاندا ، ئەم بەیتە شیعرەی دەستنیشانکردوە .
٥ – مەمێ ئالان – پێشگۆتن – ل – ٧
٦ – النقد المنهجی عند العرب – الدکتور محمد مندور . ص : ٤٨ ، ٣٥٤ .
٧ – جامی – عبدالرحمن (٨١٧ك – ٨٩٨ = ١٤١٤ز – ١٤٩٢ز)
٨ – نظامی – الیاس نظام‌الدین یوسف (٥٣٥ك – ٥٩٩ = ١١٤١ز – ١٢٠٣ز)
٩ – دور الأدب المقارن – ص ٩٣ الدکتور محمد غنیمی هلال
١٠ – لە چاپی (حەلەب)دا ، کە لەسەر چاپی یێکەمی (ئەستەمبۆل) چاپکراوتەوە ، بەندی (موعاتەبەیا زینێ د گەل ستی‌یێ ، گلزندا حۆری ژ پەریێ) کە لەنێوانی بەندی (٢٨) و (٢٩) ی چاپەکەدایە ژمارەی بۆ دانەندراوە . بۆیێکە ژمارەی بەندەکانی چاپەکە بوەتە (٥٩) . کەچی مامۆستا سوجادی ، ژمارەی بەندەکانی بە (٩٥) نووسیوە (مێژووی ئەدەبی کوردی – ل ٢٠٣) . رەنگێ بێ ئەمە هەڵەی چاپ بێ . هەروها ژمارەی بەیتەکانی بە (٢٦٦١) لەقەڵەم داوە . مامۆستا (شاکر فتاح)یش ژمارەی بەیتەکانی گەیاندۆتە (٢٦٧٣) بەیت (مەم و زین) لە تەرازوودا – ل ١٤ .)
١١ – ئەم رامانە ، لە رامانەکانی (میکیاڤیلی) دەکا ، کە لە کتێبی (میر)یدا دەربڕیوە .
١٢ – فن الشعر – ارسططالیس – تعریب الدکتور عبدالرحمن بدوی : ص ١٧
١٣ – هەمان سەرچاوەی پێشوو – ص – ٢٣
١٤ – النقد الأدبی – احمد امین ، ج ١ ، ص : ١٤٦ – ١٤٧
١٥ – خلاصەیەکی تاریخی کوردو کوردستان – ئەمین زەکی – جلدی دوەم – پەراوێزی – ل – ٣٥٧ – ٣٥٨ .
١٦ – النقد الأدبی الحدیث – الدکتور محمد غنیمی هلال – ص : ٢٠٣
١٧ – هەمان سەرچاوەی پێشوو : ص – ٢٠٤ – الحاشیة .

# درەختێکی گوڵ سپی

شیعری هیدایەتی عەبدوڵلا حەیران
١٩٨٥/٤/٨
سلێمانی

بەفری کامە ، ئاسمانی
ئەشکەنجەیە
وا تەمەنتی گرتۆتە خۆ . . .
زریانی کام وەرزی سەختە
لەژینگەی خۆت ،
نامۆی کردووی . . .
داخم ناچێ ، ئەی ئافرەتی شەنگ‌و هێمن
تەوری رۆژگار
دەستی لەتۆش وەشاندووە . . .
بەفری (غەمە) باریوەتە ،
سەر ترۆپکی بەژن‌و باڵات
پرچەکانی سپی کردووی . . .
تۆش سێبەری مەینەتییەك ،
بۆتە تاپۆی تەمەنێکی بێزاریی بۆت . . .

ئەی شۆرە ژن ،
تۆش لەناختەوە ئەجەنگێی ،
خۆت لەگەڵ خۆت . . !

دیمەنێکی دڵ والایە ،
لەناو چرە دارستانێك
درەختێکی گوڵ سپی رەنگ . .
ببێتە ئاشیانەی غەمی
پەلەوەرێکی تەریدەو
نامۆ لەگەڵ (درەختەکان) . . !

تۆ سەرچاوەی ، گریانێکی ،
لەدڵە پاکەکانەوە ، هەڵئەقوڵێی . . .
کەشە هەورێکی بێ‌دەنگی
جار جار تورەی ،
جارجار رێژنەی بارانی پایزانێکی
بەسەر گەڵای
زەردی خەزانا ئەبارێی . . .

دەپێبکەنە ،
ئەی درەختە گوڵ سپی‌یەکە . .
حەزم لەپێکەنینتە
دەپێبکەنە ، پێکەنینت
تاڤگەی بەرزی سۆز بارینە
ئەرژێتە سەر دەشتی رۆحی
وەشکەوە بووم . . .
دەپێبکەنە
ئەی درەختە گوڵ سپی‌یەکە . .
ئەوە منم ، شەوان لەگەڵ ئەستێرەکان
بەژوور سەرتەوە ئەوەستم . .
ئەوە منم ،
شەوان لەگەڵ فریشتەکان ،
گوێت لێ ئەگرم . . .

## تول

محمد حسن بناڤی

١٩٨٥/٢/١٢

«دنیا دهەژیت
خراب نابیت
چیا دلەقن
لێ ژ بن ناچن»
گەرمەگەرما هاڤینێ‌ژی
گیا دبەییت
هشك‌و پویچ دبیت
ژ سەر بنێ خوە
دکەڤیتە خار
ژ تێهنا گەرمێ چەند ئاخ بکەلیت
نەشێت بکوژیت
وێ ڕهیکا وەك داڤا موی
تەڤ ئاخ‌و بەر
بۆ بوینە ڕوی
دناڤ ئاخێدا .
خوە بەردای خار
گەل بهار هات
باران لسەر هات
دێ گیان ڤێدا
چیتەڤە خار
وەکی بەرێ
لسەر بنێ خوە شین بیتەڤە
شین بتەڤە
مەزن دبێژن :
«خوین نامریت»
ڤێجا چاوە ؟
ئەو زاروکێ باب لێ کوشتی
تولا بابێ خوە دێ هێلیت ؟
یان دێ مریت ،
یان دێ مینیت ،
یان دێ تولا بابێ ڤەکەت .
دا کەسەك دی
خوە د لەپادا فهێت نەکەت
فهێت نەکەت

---

## ئاگرێ ڤیانێ

کامیران بەرواری

١٩٨٥/٤/٦

ڤیانا تە . .
ئاگرەك هلە
بێ‌ی دارو قرش‌و قەوال
دلێ من کریە ئێتونەك
بەر تێدا بێ دبنە ئار
ئاگرێ عەشق‌و ئەڤینێ
ل من سوتن جەرگ‌و هناڤ
وەرە جانێ . .
دل برینێ
تە خوینا من کرە ئاڤ
ئەو چ تەڤنە ؟
تە ڕاچاندی
کریە دوزو خەفك‌و داڤ
وەك بلبلەك . .
ژار کەڤتمێ
ل من بو ز ئارو هەوار .
تورڕینا من
چاك بزانە
ئەڤ ئاگرە
دێ هەر مینیت هل‌و دژوار
بلا هزاران دلێن گەنج
لسەر بێن سوتن‌و برژان
ئەز ئەڤینا تە ناهێلم
هندی مابن جان‌و ژیان
وی دەمی ئەز دێ تەنابم
تا دهێتن بارانەکا بوش
جوك‌و ڕوبار
پێ تژی ببن
سەرژێتوی ڤەژیتن بهار
ئەو خویسارا
لسەر کولیکا
ب‌حەلیت‌و بیتە خوناڤ
هینگێ ئەزو تو دێ بینە . .
هەڤ‌دل‌و ژیان‌و یەك بزاڤ

# نێرگزفرۆش

ئازاد دڵزار

١٩٨٥

کێوی – قەشقە (١) –
دەڵێی گۆڕی فیرعەونێکی رووتکراوە .
– کۆسرەت (٢) – هەروەك
بەردەنووسێکی کەونینە ،
وەك بڵێی بەختەتی مێخی
داستانی تۆفانی خوێنی لێ نوسراوە .
لە دوورەوە
لەناو دارستانو تەما
دەیخوێنمەوەو ، نایخوێنمەوە .

بەهاری وڵاتەکەمان
چەند هەوەس بازو بێشەرمە ،
قەدری دڵی شکستی ئێمە ناگرێ .
سەیری والەدیوی دۆڵێ
بەهەزار گوڵ سەمادەکا ،
قاقا شەتاو پێدەکەنێ .
لە عاستی دێی – شێخ مەنسووریان (٣) –
مێرد منداڵێك ،
وەك مەلێکی باڵ هەڵپاچراو

هەروا پەلە کوتێیەتی
بۆرێبواران .
ئامێزێك نێرگزی پێیە
چەپك چەپك دەیفرۆشێ ،
لەگەڵ غەمێکی پەنهانی
لەرەشکێنەی تۆخی چاوان .
ئای نێرگزی رووقایمی – شێخ مەنسووریان – !
چۆن لەناو خۆڵەمێشەوە
هەڵسایتەوە
ئاوا گەردن کێڵو چاو جوان ؟ ! .

دیسانەوە
لەزارکی گوندی – خەلەکان – ،
وا تارماییەك دەست هەڵدەبڕێ .
لە نزیك کوخێکی نزما
هێواش وەستاین .
تا سەربازە رەشتاڵەکە
لە پێناسەکان وردبۆوە ،
تا جانتاکانی پشکنی ،

من لە نێرگزجاری چاوی
کچی ناو جێبەکەی تەکیان ،
چەپکی نێرگزە کێویلەی
تێکەڵاوی غەمم چنی !

دووبارە کەوتینەوە ڕێ ،
هەر کێوەو لەباوەشی کێو
هەر گردەو لە کۆڵی گردێ .
شاخی – کۆسرەت – لە دوامانا
وەك کڵافەیەك دووکەڵی شین
قووچ بۆتەوە .
خەریکە پشتەو شکێنێ
ڕوەو باکووری خۆرنشین .
لەسەری لۆفەکانی ڕێی
گۆلی (دوکان) ،
هەروەك ئاوێنەی دەستگێری
بەردەمی بووك
چریسکەی دێ ،
وەك بڵێی پارچەیەك ئاسمان
داکەوتوە ،
دەستەودامێنی چیاکان ! .

چەپکە نێرگزی کوریژگەی
شێخ مەنسووریان وا لەدەستما ،
ئێستاکە بەدرێژایی ڕێ ،
پەستوزگار
هەرکە بۆنی پێوەدەکەم
وەك بڵێی وردە شووشەیەو
دڵم دەبڕێ ! .
کە گەیشتمە – سلێمانی –
نازانم دیاریی بۆکێ ،
بیبەم بۆ گردەکەی – سەیوان – ؟
یا لەگەڕەکی –٠جوولەکان –
بیبەشمەوە
بەسەر هاوسێکانی جاران .
کە سەردەمێك
لە سەرەتای پەنجاکانا ،
بەنهێنی
لە ژوورێکی نماك دەژیاین .
نا . . ئێستا بیرمکەوتەوە ،
منی تەنیای بێ خانەخوێ ،
کە دابەزیم
لە ئوتێلێکی نمرە سێ ،
دەیدەمە دەست
ئەو خزمەتچی‌یە بێ کەسەی
نیوە شەوان ،
خەوی دەزرێنی خەیاڵی
لانەوازیو ، تاڵی‌ژیان .
چرکە چرکی
سعاتە گەورەکەی دیوار ،
زەنگی ناکاوی ژوورەکان
مشتو مری
سەرخۆشانی شەودرەنگان .
تا گیانی ئارامکاتەوە
بۆی نێرگزی
کوریژگر دڵ غەمگینەکەی شێخ مەنسووریان .

(١) قەشقە لوتکە شاخێکە لەزنجیرە چیای –هیت سلطان – شێوەیێکی قووچەکی هەیە .
(٢) کۆسرەت : شاخێکی ماهی ولێرەوارە لەپشت چیای – هیبت سلطان – لە نێوان هەردووکیانا دۆڵی پاراوی – خەلەکان – هەیە کە شەقامەرێی سلێمانی – پشدەری پێدارەت دەبێ .
(٣) شێخ مەنسووریان : گوندێکە لە دۆڵی خەلەکان .

بۆ نووسەری نەمر
غازی فاتح وەیسی

# تەرمێکی لەسەر سفرەی سەفەردا..

شەوی یەلدایە یا دەیجوورە ئەم شەو
کە دیدەم دوور لەتۆ بێنوورە ئەم شەو
«نالی»

—١—

دێوەرە بوو
بە تیرگی پڕ لە ووشەوە
لە شارو دەرو دەشتایی
لە هەورازو لە نەورایی
لە گشت لایەکی نشتمان
تێدەپەڕیو بانگی دەکرد
وەرنە ووشان
وەرنە ووشان

—٢—

پێنووسەکەی ،
ئەسپێکی خورتو رەسەن بوو
بەچۆکدا هات ، نسکۆی هێنا
سواری مێرچاك ،
گەوزیدا لە خڵتو خوێنا
فرندەکان ، لە هێلانەکانیان تەرین
(سیروان) کەوتە ، هاژەو پێچدانو کەفچەرین
بەردەقارمان هەستایە سەرپێو راما

ئەسپەکەیش لە کۆرژەنیدا
گریاو گریا
تا سمەکانی شکان هەر پیکۆلەی کرد
خرتو خۆڵو . .
تلە بەردی ئەم ناوەی بێشت
شۆرە سواری بەجێ نەهێشت
خۆی کردە دیواری سەر بە درکە کۆنار
بوو بەزرێو
بازنە پەرژینێکی خاردار
نەك درندە گۆشت خۆرەکان
باڵندە چرنووك تیژەکان
لە هەوار نزیك بنەوە
تەرمەکەی بەسەرکەنەوە
لەسەر لاشەی راکشاودا
تروسکە تروسکی خوێن ئاڵی گەش
دەیسمی دڵی تاری رەش
لەسەر لاشەی راکشاودا
تێکرا دەیانجریواند ئەستێرەی سەرکەش
لە وادەی بەرەبەیانیش ،
سرووەی فێنك ،
قژەتێك ئاڵاوەکانی ،
وەکو تەلە گیاکان دەلەراندەوە
گولیلکە پونگەجاری تەر
بۆنو بەرامی خۆشیان بلاوکردەوە
ئەسپ پاسەوانی رژدو ، بەوەفا بوو
لەو شەودا چاوی دانەخست
بەتەنیا ڕێگای دانەگرت

—٣—

— گەر سوورە هەتاوی ناوەراستی ئاسمان
بەربێتەوەو ، بکەوێتە ، کۆشی دەریا

ـوی دەریا ، گەرم دەکات
ـخود خۆی سارد دەبێتەوە . . ؟
– دەڵێم : ئاوی شڵەتێن‌و
ـۆپێك خەڵوزی گەورە بەسەر سەریەوە
ـۆی هەیە هەر هەمان خەڵوز
گر بگرێ‌و بگەشێتەوە
بەڵام ئەنجام ،
چاو هەڵدێنێ ، لە قولایی ، خەڵتانی خۆڵەمێشەوە
کەچی ئاگردانی نووسەر
ـن‌بڕ بێ‌و کوێریش بێتەوە
ووشەکانی هەر گەشاوەن
ـبن بە (هیچ)و (خۆڵەمێش)
ئەگەر زەریاشیان بێتە پێش

–٤–

گەر هاتوو پەرتوکێکت گرت‌و دادوەشاند
وا بزانە ،
ناوقەدی درەختێکت گرت‌و ڕاتوەشاند
گەر کەڵە دیوارێکی بەووشە هەڵچنراوت. رووخاند
وا بزانە ،
میوەو گەڵای زۆرت وەراند
خۆ ئەگەر نووسەرێکیش سەری‌نایەوە
وا بزانە ، گەڕی دەستار
خولگەیەك بە نائاسایی سوڕایەوە

**پەراوێز :**

- دێوەرە = بەو کەسە دەگوترێت کە بە دێهاتەکاندا دەسوڕێتەوەو کەل‌وپەلی رۆژانە دەفرۆشێ ووشەکە خۆی لێکدراوە ، پێك هاتووە لە (دێ) + (وەرە) ، کە هاوار دەکات وەرنە ( ؟ ) ، واتە بۆ کڕینی ئەو شتەی کە ناوی دەبات .
- نەورابی = ڕاستانێك لە لێژاییکدا
- درکە کۆنار = درکێکی نووك تیژەو درێژە لەسەر دیوارەکاندا دادەنرێ تاکو ڕێ لە ڕێوی‌و دالاش‌و دزان بگرێ .
- زرێ = قەلغان بە عەرەبی (درع)

# دۆزە . .

نەوزاد عەلی

لەبیرت چوو
کە خەمە خەماوی‌یەکانت لەکۆڵ دەنا
بۆ هەورازو نشێوی تووش .
ڕێگام دەکوتا
لەبەر ژیلەمۆی سپاتدا .
چەندان نامەی مەم‌و زینم
لێ دەسووتا .
هەموو شەوێ
لەگەڵ بوتەی زیندە خەودا دەتوامەوە
جارنا جارێ تەختەی ڕەش بووم
دەسرامەوە
هەموو ڕۆژێ
کۆشم دەکردە بەندەری خەمەکانت
دەزانی بۆ ! ! . . .لەبیرت چوو ،
کە پێم وتی . . .
هەرمن دەبمە پاسەوانی چەمەکانت
گوێم بۆ بگرە
ووشەی ڕاستی وەك ملوانکە
لە گەردنت دەئاڵێنم
لە پێناوی دۆزەکەتدا دەسوتێنم

# كه شیعر له سێداره ئەدرێ

محمدأمين پێنجوێنی

**پێشكەشه بەگیانی شاعیری نیشتمان‌و میللەت پەروەری ئەفەریقایی «بنجامین ملویسوس» كه رەگەزپەرستەكانی رژێمی خوارووی ئەفەریقا ووشەیان له گەروویدا تاساند**» .

ئەی «بنجامین» ، ئەی پێست رەش
دڵ‌و دەروون ، بەفری بێ گەرد
ووشەی هەڵبەستەكانت گڕ
وەك گولله تیژ ، وەك پشكۆ گەش
ئەی «بنیامینی» قوله رەش ،
تاوانەكەت . . .
رەشی‌ی پێست‌و ئازایی‌و مەرد
خۆشەویستی‌ی نیشتمان‌و یەكسانی پێست
دیاره ئەنجامی «وا» ئەبێت
لای رژێمی جانەوەران
لای زێرو ، دۆلار پەروەران
ئەی قولەرەش ،
كاتێ تۆیان بەدارا كرد
چ رژێم‌و دەزگا هەیەو . . به ویژدانه
چ ئێستگەو رۆژنامەی «سپی»و پاكه ! !
لەم جیهانه . .
رقیان هەڵسا ،
هاواریان كرد . .
شاعیر نابێت بخنكێنرێت
شاعیر فریشتەو پەیامه
گوڵی هۆشی بژاكێنرێت

شاعیر شۆڕش‌و ئارامه . .
ئەی «بنیامینی» قولەرەش . .
به پێست تاریك ، به باوەڕ گەش
منیش هەروەكو تۆ خولیام
حەزو شیعرەو ، هەم جوانی‌یه . !
مرۆڤ‌و خاك باوەڕمه
شیفتەم . ژین‌و ئازادی‌یه
خۆزگەم بەخۆته سەرئەنجام
چونكه كاتێ ووشه ئەمرێ
یاخود زینده بەچاڵ ئەكرێ
ئەم گێتی‌ی‌و هەندەرانه
گەورەو پانه
گوێیان به مس ئاخنراوه
مەلاشوویان كاس بۆی نەوته . . ! ؟
زمانیان لاڵ‌و جەڕاوه
له ئاستی«ژان»
من گەنم رەنگم تۆیش قولی
لای رەگەزپەرستان گولی
«نەفرەتی» گەردوون له گەردن
داناماڵرێ «وا» به ئاسان . . !
هەتا «پەت» نەچێته ملمان
تا گڕ وەك تۆ ببێته خەڵوز»
«گوریس»«گوڵ»خەفەكا نوز . . . !
ئەی «بنیامین» ، باتێر بگرین
تۆ بۆ چارەو پێستی رەشت
من بۆ دڵی ساف‌و بەفرین
با یەك بگرین له گریانا . . !
له فرمێسكمان تێر بنۆشین
له جێی باده . . .
لەناو «كاسەی» كۆڵ نەدانا . . ! !

# دابارینێ

سەباح ڕەنجدەر
١٩٨٣/٤/٢٤

...نی هەوا گۆڕینی من
...نەی تەنگی قوژبنی ئەشکەوتەکانە
وورد بەرەوە
... هەورە سلك پڕەکانی حەسرەتی ئەم پایزە
...ی سەر پەڵەی مژدە . . .
... ئەم جۆخینە ووشکانە
...دەنو . . .
...کی ئەو کێڵگە ڕووتانە
... دەکەن
...خوڕ بەسەر گۆیکەی هەرچی درەخت هەیە
...ە
... چەند بەخوڕ دابباری
... نەوەندە
... ێرمەی چۆڕاوی برینتا
... تەزووی ڕامان دەرژێ !
... هەوارە ، لە داوەتی نازی تۆدا
...ەی ئێشە بەناو ساڵدا کەوتووەکانی هەڵگرتوە
... بویە مێخەك بەندی بەربەرۆکت
...ی دانە دانەی سۆزم
... وی مێرگی نێوان مەمکۆلانت هەڵدەچنم
... جارەیان دەبم بە قردێلەی کەزیت
...متا شۆڕ دەبمەوە
...م بە شاعیرێکی ریش سپی مەینەت
...نو داستانی ڕەزو بارانی ئەراراتت دادەچمەوە
...و بەدیار باریکە دەنگی ژانگرتووەوە
...ی شەقار شەقاری
...قامەکان دەخوێنمەوە
...کوێستانی نغرۆی وونی گەرمەسێردا
...یێ ئاوی لۆچی هەنیەی
...نو ورمێ دەخۆمەوە

دەتێم بگەو هەنسکی نەی ئەو ئاوازە
شانەکانت دەجوڵێنێ
لە پاڵ فرچکی گۆڕ قەرەج
ئەستێرە شەدەلارەکانم خستە خەو
ئاکاری ئەو قوبەی تەکیەی مەولانەیم
بەگەردەلوولی تێکسوڕای ئاهی کۆن دەگەشێتەوە
چی دەبینم ! ؟
لەرەی مەشخەلانی چرایێکی ڕۆشن دەشنێتەوە !
ئەم شەو لەدەم گۆڕستانی دێکەی تەکیان
مرۆڤێکی گەڕاوەی دونیای گۆڕەوشار
هاتە کەلاوەکانی دێ
نواڵە نشین ، گرد بوونەوە ، ناسیانەوە
ئاشقێکی ئەمەکداری ساوای دەنواند
مۆری یادێکی تەزێنی هەڵگرتبوو
دادەماو تا هەناوی تیابو دەیقیژاند
ڕەگی شیعر ، لە ڕەگی دڵی دایکایە
ژانی قووڵایی غوربەتیان
لە ئامێزی هەردووکایە !
کزەی جەرگم ئارام بەوە
ئێستا لێرە
فێنکە شنەی پەمەیی ڕەنگ
بەکێوی ژوانت ئاشنایە
پێڵوی خەواڵووت لێکەنێ
تادێ شلکە شەنگەبی جەنگەڵی تەڕت
گەلا دەگرێ !
گەرچی لەولاش
زێرو بنی تێنووی دایتو
تۆش لە ئاو زینگدانی مردندایت !
قۆناغ دوورەو لەم بیابانە گرژەشدا
گەلی شەوی تووشم بێنی

ڕێگاکان تێکیان کردەوە
کاتیزانیم کات قووتی دام
شانم گرانبوو لە نێوانی مەمکی دوو کێو لێی ڕاکشام
کوڵینگی باش جۆگەی شکاند
لە گۆلی فرمێسکی کولم
ڕێژنەی تەزرەش ئاگری کزی جگارەمی کوژاندەوە
دەنگی نزیك هاتە بەرگوێم
کاتێ کە چاوم هەڵبری
ئەشکەوتێ باڵی وەفایی کردۆتەوە
– ووتم : تۆکێی ؟
+ ووتی :من دەروێشی شاخو دەشتو دەرو بەندەنانم
لەو کاتەوە بەئاگامەو کە لە پشکۆی ئاگردانم !
کارمامزی ڕاچەنیوی کۆڵوانە تەم
وەرە`پێشانگای سینگی گڕ
تابلۆی ڕووی تۆم لە چاوانی
شەوگاری تۆخ هەڵکەندووە
بۆچی تاکو ئێستاکەش پێت نەزانیوە
دارمێوی کەژی بەهاریو
لە نشێوی کانیلەی جەستەم ڕواوی
هێشووی فەرامۆشی دەگریت
ئەی خولیای شیرینی تەمەن
ڕوژی چەند جار
پەپوولەی تاسەی مەزنم
بۆ شیلەی هەنگوینت دەفریت !
ڕازت شەپۆلو بەبەکهەڵشاخانی زامی بێخاڵەو
(«سەراپام تیای هەڵکێشراوە») (*)
نەء : ناتوانم جیا ببمەوە
تەریم نەوتی فانۆسی گشت هۆبەکانەو
لە شەوادەی
دڵی کراوەی زارۆکاندا داگیرساوە !

# چەند پارچە

## بێرتولت برێخت Bertolt Brecht

«ئۆیگن بێرتولد فریدریش برێخت» نووسەرو شاع دەرهێنەری ئەڵەمانی بەناوبانگە ، ئەم نووسەرە لەشار «ئاوگسبۆرگ»ی ئەڵەمانیا لەرۆژی ١٠ شووباتی ١٨٩٨ لەدایك بووە ، باوکی بەرێوەبەری کارگەیەکی بچووك بووە هەر لەو شارەشدا قوتابخانەی سەرەتایی و ئامادە تەواوکردووە .

لەساڵی ١٩١٨دا لە زانکۆ وەرگیراوە لە شاری «میونیخ» بۆ خوێندنی زانیاری و پزیشکی ، بەڵام زیاتر ئارەزووی لەشا شانۆگەری بووە .

وەکو برینپێچێك بەشداریی یەکەمین جەنگی جیهانی کردووە تاوەکو کۆتایی بەجەنگەکە هاتووە بەردەوام ئەم کارە کردووە .

دوای تەواوبوونی جەنگەکە یەکەمین بەرهەمی شانۆگەر نووسیووەو ، هەر ئەو شانۆگەریەیش سەلماندوویەتی کە ئ مرۆڤە چەند نیشانەیەکی دیاری تێدایەو . بەرەو قوتابخانەیەک نوێ لەبواری شانۆگەریدا هەنگاو دەنێ .

● لەساڵی ١٩٢٢دا شانۆگەرییەکی نووسیوەتەوە بەناو «دەهۆڵ لێدان لەشەو»داو ، پاداشتی لەسەر وەرگرتووە لەساڵی ١٩٢٣دا لەشانۆی «میونیخ» کاری کردووەو ، لەسا ١٩٢٤دا شاری «میونیخ»ی بەجێهێشتووەو چۆتە شار «بەرلین» ، ئیتر لەوێ لەشانۆی ئەڵەمانیدا Deutschem Theater) دەستی بەکارکردن کردووە لەگەڵ دەرهێنە

سەردار میران
لەئەڵمانی یەوە وەریگێراوە

# شیعرێکی برێخت

...وبانگەکانی ئەو شانۆیە .

● لەساڵی ١٩٢٨دا «ئۆپرای سێ قروش – (Dreigro schenope...)ی نووسیوەتەوە کە ناوبانگێکی چاکی ...کردووەو ، تائێستاش لەووڵاتانی جیهاندا هەر پێشکەش ...کرێو ، چەند جارێکیش کراوە بە فیلمی سینەما .

● دوای ئەوەی نازی یەکان لەئەڵمانیا هاتوونەتە ...رحوکم ، دەستیان کردووە بە ئازاردانیو ، ئیتر ئەوە وای ...کردووە لە ساڵی ١٩٣٣وە ئەڵمانیا جێبهێڵێو بەرێگای جیکۆسلۆڤاکیاوە بچێتە سویسراو ، لەوێش چووەتە فەرەنساو ...ارکو سوێدو فینلەندە ، لەساڵی «١٩٤١»شدا چووەتە ...مەریکا تاوەکو ساڵی ١٩٤٧ ، ئەو چەند ساڵانەش باشترین ...بووە بۆی بۆ نووسینەوەی بەناوبانگترین دوو ...گەری یەکەی : «کۆراجی دایكو منداڵەکانی – (Mutter Courage U. ihre Kinder –)و ، ژیانی گالیلۆ – (Leben des Gali...) .

● پاش تەواوبوونی شەڕی جیهانیو لەناوچوونی ...ی یەکان ، «برێخت» هەر لەئەمەریکا ماوەتەوە تاوەکو ساڵی ١٩٤٠ کە گەڕاوەتەوە شاری «زۆریخ»ی سویسراو ، لەساڵی ١٩٤٨»دا چووەتە شاری «بەرلین»و ، لەگەڵ «هێلینا ...یگل»ی ژنیدا شانۆیەکیان دروستکردووەو تیپێکی ...نۆیی یان داناوە بەناوی (Berliner Ensemble) کە لەهەموو جیهاندا دەنگی دایەوەو ، تا ئێستاش ئەم دەنگدانەوەیە هەر ...ردەوامە .

برێخت هەر خۆیشی بەرێوەبەرو دەرهێنەری ئەو تیپەبووەو ، لەگەڵ ئەو تیپەدا تیۆرەکانی لەشانۆدا تاقی دەکردەوە ، تا لەرۆژی ١٤/ئابی/١٩٥٦دا کۆچی دوایی کردووە .

● برێخت بە مەزنترینو باشترین شاعیرو نووسەری سەدەی بیستەم دەژمێردرێ ، جگە لەنووسینی شانۆگەریی ، شاعیرێکی بێوێنەش بووە ، ئەوەتا «دەزگای سورکامب» شیعرەکانی ئەوی لەنۆ بەرگدا بلاوکردۆتەوە ، هەروەها چیرۆك نووسیش بووەو چەندەها نووسینی تری هەیە دەربارەی ئەدەبو هونەر .

● لەراستیدا برێخت زوربەی نووسینەکانی دەربارەی کێشەیەك بووەو ویستوویەتی بیسەلمێنێ کە «ئایا ئادەمیزاد بۆی هەیە بەسەربەستیو بەشەرەفو بەپاکی لەژێر سایەی رژێمی سەرمادارێدا بژێ یان نا ؟» .

ئەوەی شایانی باسیشە شیعر لەلای برێخت ساڵ بەساڵ لەهەموو لایەنەکانی – فۆرمو ناوەرۆكو بیرو زمانەوانی دا ، پەرەی سەندووەو ، بەرەو ساکاریو سادەیی مرۆڤایەتیو سرووشت هەنگاوی ناوە .

### ● گۆرانی ی شاعیر[1] Lied der Lyriker

ئەوەی ئێوە لێرە دەیخوێننەوە
من بەشیعر نووسیومە
بۆیە ئەمە دەڵێم ، رەنگە بێ نەزانن
شیعرو شاعیر چی یە . . بەراستی ئێوە ، لەگەڵ ئێمەی «شاعیر» ،
جیاوازیتان لەوەدایە ،
ئێوە بەگەرمی خۆتان خەریك نەکردووە .
* * * * * * * * *
قسەبکەن ، هیچتان رەچاو نەکردووە ؟

هیچتان نی‌یە ، بۆپرسیارکردن ؟
سەرتان سوڕنامێنێ ، نایەتە خەیاڵتان ،
کەزۆر لەمێژە هیچ پارچە شیعر چاپ‌نەکراوە ؟
دەزانن بۆچی ؟
ئێستا من پێتان دەڵێم :
پێشان مرۆڤ شیعری دەخوێندەوەوەو حەقی دەدا .

* * *

ئێستا هیچ نادەن بۆ شیعر ،
ئەوە ڕاستی‌یەکەیە .
بۆیە لەم ڕۆژانەدا هیچ شیعر نانووسرێ !
شاعیریش دەپرسێ ؟
نەك تەنیا کێ شیعر دەخوێنێتەوە ،
بەڵکو کێ حەقی تەواوی شیعر دەدا ؟
ئێوەش هەر هێندە بیرتان لەئێمە کردۆتەوە ،
شاعیر گەر پارەی نەدرێتێ ، شیعر نانووسێ !

* * * * * * * * *

چەند شتی ناهەقمان بۆ ئێوە کردووە !
بەلام هەرگیز تەمبەڵیمان نەکردووە ،
هەردەم دەست‌بەسری ئێوە بووین !
ئەگەر قسەشمان کردبێ ، گوتوومانە :
هەقی شیعرمان بدەن !
لەپێناوی ئێوەدا چەند تاوانی گەورەمان کردووە ،
بەڵێ ، لەپێناوی ئێوەدا !
کەچی بۆ خۆیشمان بەبەرماوەی ئێوە ڕازی بووین !

* * *

ئاخ ، کاتی کە عارەبانەکانتان لە پیسایی‌و ،
خوێن نقوم دەبێ . .
ئێمە ووشەی مەزنمان بۆخۆمان دەهۆنیەوە !
ئێوە گۆڕەپانی قەسابخانەتان هەیە
بەلام ئێمە گۆڕەپانی شەرەفمان هەیە .

## ● قسەی نەستەق (٢) Zitat

شاعیر گوتی :
چۆن شیعری نەمر بنوسم ، کەمن خۆم نەناسراوم ؟
من چۆن وەلام بدەمەوە ،
کەکەس هیچی لی‌نەپرسیوم ؟
لەوە دەترسم ، ماوەیەکی زۆر ڕەت‌بی‌و ،
پێشنیازەکانم جی‌بەجی‌ نەکرێن . .
دەبێ من بەزمانێکی ڕەسەن‌و نەمر بنووسم ،
گەر بتەوێ بەئامانجی گەورە بگەی ، دەبێ گۆڕانی گەورە
ڕووبدات ، گۆڕانە بچووکەکان دوژمنی گۆڕانە گەورەکانن» .
من دوژمنم هەیە ، من دەبێ ناسراوبم .

## ● وەلام (٣) Die Antwort

کوڕەلاوەکەم ، لی‌ی پرسیم :
پێویستە فێری ماتماتیك بم ؟
ویستم پی‌ی بلێم بۆ ؟
خۆ بەبێ خوێندنیش دەبی ئەوە بزانی ،
کە دوو پارچە نان ،
لەپارچەیەك زیاترە !

کوڕەلاوەکەم لی‌ی پرسیم :
پێویستە فێری زمانی فەرەنسی بم !
ویستم پی‌ی بلێم بۆچی ،
ئەم دەوڵەتە بەرەو نەمان دەڕوا .
بەدەستەکانت سکت بگوشەو بناڵێنە ،
هەمووکەس تی‌دەگا چیت دەوێ

کوڕەلاەکەم لی‌ی پرسیم :
پێویستە مێژوو بخوێنم !

ـيستم پێی بڵێم بۆچیته ،
فێربه سەرت لەنێو خاکدا بشارەوە . .
ـەنگـێ زیاتر بژی ! !

«بەڵام پێم‌گوت» : بەڵێ ، فێری ماتماتیك‌بە ، فێری زمانی
ـەرەنسی‌بە ،
فێری مێژوو بە . .

● **هەست(٤) Wahrnehmung**

ـێ کەگەڕامەوە ،
ـێ سەرم هێشتا مووی ڕەشی تیادا مابوو
ـۆر دڵخۆش بووم . .
ـەندووبوونی چیاکان کەوتنە دوامان
ـەندووبوونی دەشتەکانیش لەبەر دەممان ماوەتەوە

● **مامۆستا فێربە(٥) Lehrer, Lerne!**

مامۆستا ، هەردەم مەڵێ تۆ ڕاستی !
بهێڵە با قوتابی‌یەکان خۆیان بزانن‌و تێ‌بگەن !
بەزۆرەملێ ڕاستیەکانیان بەسەردا مەسەپێنە :
«ڕاستیەکان » وەهایان ناوێ‌و ،
پێویستی‌یان بەوە نی‌یە .
ـەکاتی قسەکردندا ،گوێ ڕاگرە . .

**من پێویستیم بەکێل نی‌یە :**

**Ich benotige Keine Grabstein**

من هیچ ئیکیلێکم ناوێ بۆ سەر گۆڕەکەم ، بەڵام گەر ئێوە
بەپێویستتان زانی ،
«بۆمی دابنێن» !

پێم‌خۆشە لەسەری بنووسن :
ئەو چەند پێشنیازێکی بۆمان‌کرد ،
ئێمەش وەرمان گرت‌و بەجێهان گەیاند . .
بەم‌جۆرە ڕێز لە هەموومان نرا .

● **شتە دڵ ڕفێنەکان(٦) : Vergnugen**

یەکەم ڕوانینی بەیانیان لەپەنجەرەوە ،
دۆزینەوەی کتێبێکی کۆن .
ڕوخسارە پڕتاوەکان ،
بەفر ! گۆڕینی وەرزی ساڵەکان
ڕۆژنامە ، سەگ
خۆشۆڕین ، مەلەکردن
مۆسیقای کۆن ، پێلاوی فەڕاح
هەست‌کردن . .
مۆسیقای نوێ .
نووسین ، چاندن . .
گەشت‌و گوزار ، گۆرانی گوتن
ڕوویەکی خۆش . .

* **پەراوێز :**

«١» ساڵی «١٩٣١» نووسراوە . .
«٢» ساڵی «١٩٣٧» نووسراوە . .
«٣» ساڵی «١٩٤٠» نووسراوە . .
«٤» ساڵی «١٩٤٨» نووسراوە . .
«٥» ساڵی «١٩٥٣» نووسراوە . .
«٦» ساڵی «١٩٥٦» نووسراوە . .

• سەرچاوە :
**Bertolt Brecht**
**Ausgewahlte Gedichte**
**edition Suhrkamp**

# دەستار

ئیسماعیل ڕۆژبەیانی

هەر چۆنێك بووبەلۆژە لۆژ خۆی بەکێش کردو کۆڵانە تەنگەبەرەکەی گرتەبەر . ئەو دوو سێ گاوخانە ڕێیەی لێ ببوە شاخی (هەورامان) هەر چەندێك هێزو گوڕی بەخۆی دەدا پێیەکانی لەوە زیاتر لە شوێنی نەدەڕۆیشتن . بە ناچاریەوە پشتی‌دا بەدیواری خانووەکەی ماڵی هاپۆ (شاسوار)ەوە .

هەناسەیەکی لە ئاخ‌و ئۆف . . قانگ دراوی هەڵکێشا . جغارەیەکی لە قوتووە ژنگاویەکەی گیرفانی کەوا پینەکراوەکەی دەرهانی‌و دایگیرساند . . زۆر بەئەڵهاوە قومێکی لێ‌دا . لەبەر خۆیەوە کەوتە قسەکردن .

- توخوا من ئێستا ڕۆژی ئەوەمە بکەومە دمای منال‌و هەڵپەی پەیداکردنی ئاتاجی پێویستی بۆیان . بێژم چی . ئاهـو نووزەمان بچێتە بارەگای خۆی . . مردم ئەوەندە بلاڵێمەوە . . ئێستا نەبێ خۆزگە بەخۆزگەداری ئەو خوایە خۆم‌و هەردو کورەکەیشی بەقوربانی پەنجەیەکی بوایەمان . دایکەکەیانیش بمابایە هەر باشترێك بوو .

مژێکی تری لە جغارەکەی داو ووتی :

- زۆر شوکور بەبەشی بەس نیە بەیەکجاری کوانووم کوێر نەبوەوە . کردم کورەکەم بچوکەوە بووە . ئەوسا یەکێك بوو ئێستا دووانن . «کەسێك نەمرێ دەوەنیش بەدار ئەبێ» .

دەنگێکی نەفرەت لێ‌کراو لە ناخیەوە لێ‌ی‌کرد بەهەرا بەنیازی ئەوەی تۆوی تەوەللایی بخاتە کێڵگەی دڵە بەسۆزو میهرەبانەکەیەوە :

- هۆ پیرەی خلآفاو ئەو پرچەت لەبەر خۆر سپی‌کردووە وەسا خەریکی ڕێ لەخۆت تێك ئەدەی . ئەی نازانی پێشینان ووتویانە :

«کوڕ بوو بە کوڕەزا ،
کار لەکار ترازا» .

پیرەژنەکە نۆلی مارگەستە لە شوێنەکەی وریزاو پڕ بەدەم هاواری‌کرد :

- نا ئەمانە لە یەکێك نەبوونەتەوە نمەك حەرامی‌یان لێ بوەشێتەوە . باوکیان لە پێناوی دایە گەورەییدا سەری نایەوە . . دایکیشیان هەر هەمان هۆ تیق پێ‌کرد . باشە ئیتر چۆن ڕاست ناگیرسێن . . چۆن . . ؟

دەك شەیتان بەنەحلەت بێ . کچەکە ئەخۆ خەریکە لە خشتەم بەرێت .

پاش ئەوەی ناوی دەمە برك مردووەکەی بەتەواوی هەڵمژی ئینجا تۆپەڵێك تێ کۆکردەوەو کردی بە نارنجۆکێك‌و لەنێوانی لێوە شەقار بووەکەیەوە ئاراستەی دوژمنەکەی ناخەوەیی کرد :

- تف لە چارەت ئەوە دەتەوێت لە خشتەم بەری ئەی قورم‌دا بەدەمتدا بۆ ئەقڵت .

دۆتەکەی هاپۆ -شاسوار - بەدەم ورینەکەیەوە هاتە دەرەوەو لێ‌ی پرسی :

- ئەیەرۆ نەنە (فاتم) ئەوە چیتە ؟ !
- هیچ نیە کچم ئەوە دەمویست بڕۆم بەدمای مناڵەکاندا
- هێشتا زۆری ماوە بۆ دەرچوونی قوتابخانە ، حەز دەکەی وەرە دانیشە تاوەکو ئەو دەمە .
- کچم بێژە بچۆ بەلای ئیش‌و کارتەوە .

پیرەژنەکە شوێن پێیەکانی خۆی جووت باقی‌کردەوە . . بەهەرچی حاڵێك بوو گەیشتە ماڵەوە . بەنقەنق دەستارەکەی لەسەر جاجمە شڕێکی ڕاخراو دانا . چوو دوو سێ گوێل ساوەری هێنا . وەکو جاخی جارانی پێ‌ی لێ دڕێژکرد . . بەدەستە چرچو بێ هێزەکانی قورگی دەستارەکەی پڕکرد . زۆر بەزەحمەت خستیە گڕ .

ئینجا ئەم بالۆرەیەی تێکەڵ بەدەنگی دەستارەکە کرد :

«دەستـــــار هــــەی دەستــــار ،
دەستــــــــاری بێ زمـــــــان
بــبــە بــەشایــەت لــە ئــاخــر زەمــان .
ئــەو ڕێــەی وەسا تــاقــانــەی هــەنــاو
پــێـدا ئــەڕۆیشت بـۆ کــێڵگەی هــەتــاو
زۆر چــاك ئــەیناڵم بــەبــرژانگی چــاو .
مــەرج بێ دوو کـۆرپــەم وا بــێـنــمــە نــاو
تــازەی کــەنــەوە کــەلاوەی ڕووخــاو
گۆڕی بــاوکــیشــیــان پــڕکــەن لــە گوڵاو» .

باڵۆرەکە بوو بە تاڤگەیەکی ساردی بێ خەوش و ڕژایە ندۆڵی دڵ و دەروونە ئاور تێبەربووەکەیەوە .

ئەوەندەی زانی دیمەنی بیرەوەریەکانی بەسەر شانۆی ژیانیدا دەستیانکرد بە نمایش کردن . ئەو ڕۆژانەی هاتە پێش چاو وەسا ەمەنی جوانی خۆیی کرد بەمۆم بەدیار شەوە زەنگی تەنیا ەنکەکەیەوە . هێشتا بەتەواوی لە سەیر کردنیان نەببووەوە ەنگی کوڕەزاکانی پەردەی شانۆکەیان پێوەدا ، ئەمیش ەستی لە دەستارەکە بەرداو گوتی :

– هاتنانەوە گلێنەکانم . . وەرن باجاریێ تێر هەڵتانمژم . . پاش ەوەی ئاهی دڵی لێیان شکاند ڕووی دەمی لێ کردنەوە :

– وەرن نانەکەتان بۆ دانەم هەی کەسەکانم . .

۱۹۸۵/۱۲/۱۰

**ووشەی گران**

ەڵها : ئارەزووی بەتین
ەمای : دوای
ۆلی : وەکو
وریێزا : هەستا
دۆتە : کچ
زەندۆڵ : قلیش

# دوژمنێد هەڤالینیێ

**صدیق خالد هروری**

هەڤالێد من . . باپیرێ من بۆ مە گەلەك چیرۆك و سەرهاتی دگوتن ، ئەم ژی هەردەم ل دۆرا کۆم دبووین و مە بۆخۆ قەنجی ژێ دگرت و ژێ فێر دبووین . . .

ڕۆژەکێ ژ ڕۆژێد زڤستانێ ئەم هەمی چوو بووینە د ناڤ جهێ خۆداو هێشتا مە نەڤیابو بنڤین ، لەوا باپیرێ من ژی ڕۆناهی نەڤەمراندبو و هێشتا نەڕازابوو . .

من هزرا هەڤالینی‌یا خۆ دگەل هەڤالا دکر ئو من هزرا هندەك هەڤالێد شەڕۆکەو شەڕێد وان دکر . . هەروەکی باپیرێ من ئاگەهـ ژ هزرێد من هەی ، پشتی بێدەنگیەکا کێم ، باپیرێ من گەرکا قەلونیا خۆ داقوتاو بەرێخو دامە ئو گوت :

بابو . . بەریکو ئەم بهێینە ئەڤ گوندی ، ئەم د گوندەکیدا دژیاین باب و باپیرێد مە ئەوی گوندیدا ژیابوون . . دگەل هەمی خەڵکی گوندی ب هاریکاری و ب ئێك دەست و دل ئەو گوند ئاڤا کربوو ، مە دوژمناتی نەدزانی ، ئەم هەمی هەڤال بووین و مە هەڤالینی‌یا ئاخا خۆ دکر .

ڕۆژەکێ ئەز دگەل بابێ خۆ چوومە نك پەزی ، من دیت چەوا گورگەك هات و خۆ دکاڤرکەکێ وەرکرو بر ، هەردوو صەیێد لبەر پەزی ژی دەمێ ئاگەهە ژ بار بارا کاڤرکێ بووی ددەڤ گورگیدایەو لێ دبەت ، پێکڤە هەردووکا پازداو ڕاهێلا گورگی ، گورگ ژ ترسا هەردوو صا نەگەهەشت کاڤرکێ ببەت ئینا کاڤرك بەرداو ب ڕڤا خۆڕا نەگەهەشت .

پاشی هەردوو صا کاڤرك دا بەرێخو و ئەوان ژی وەکی بەری هینگێ ملێد خۆ دانەئێك و هەروەکی ب هەڤالین و شیانا خۆ دخۆرین ئو هاتنە د ناڤ پەزیدا .

دویماهیا سەرهاتیا خۆ باپیرن من گوت : کوڕێد من . . ئها هینگێ من زانی ژبلی هەڤالینیێ ، دوژمناتی ژی هەیەو بەهرا پتر ژی دوژمنێد هەڤالینیێ‌نە . .

لەوا ئەز گەلەك ترسیام ژ هەڤالینی‌یا مە دگەل ئاخا مە ، ئو من زانی دێ هەر دوژمنەك بۆ ئەڤێ هەڤالینیێ هەبیت .

بەغدا ۱۹۸٤/۱/۱٦



# کەوش

**بەکر باراوی**

هەر ئەوەندەت زانی هات و هاوارێکی سەیر و لە ناکاو لە ڕیزە دوکانەکانی ئەو لاتەوە بڵند بۆوە . دڵت داخوڕپا . هەستت کرد کە ئەوەی ڕوویداوە پەیوەندی بە تۆوە هەیە ! .

حاجی دوکاندار لە پێشەوە بە هەڵە داوان و ، ئەوانی تر بە دوایدا ڕووەو کەلاوەکەی بەرانبەریان هەر هەنگاوێکیان دەکرد بە دوان و هاواریان دەکرد :

– کورە پیاوی چاك بن مەهێڵن ڕابکات .

– مەترسن پێشی لێ بگرن .

– ئەها . . . کەوت .

منداڵانی گەڕەکیش وەك موویان بۆ هەڵکروزابێت ، هەر یەکە (کەلا)ی خۆی ڕفاندو ، شاری چاو شارکێیان بە چۆڵی جێ هێشت و ، دوی ئەوان کەوتن . کەچی تۆ بە پێچەوانەی ئەوانەوە . پووش و پەلاشەکەی دەستت تور داو ، وەك هەموویان دوای تۆ کەوتبن بە پەلە خۆت لە گەرووی کۆڵانە تەنگەبەرەکان توونْد کردو ، دوور کەوتیتەوە .

«ئەمشەو لە خەومدا ڕاویان دەنام . هەنگاوم دەنا و ، لە جێی خۆم نەدەجولام . هاوارم دەکرد و دەنگم دەر نەدەهات . لێم نزیك دەبوونەوە . هێرشیان بۆ هێنام . دەستیان درێژکرد و ، ڕاچڵەکیم !» . ڕات دەکرد و ، دڵت لە سێ و دوری ترسێكدا یەك بینی لێی دەدا .

«– باشە کێ دەزانێت من بووم ؟

– چۆن نازانن ؟

– ئەی (شلێر)م لە گەڵدا نەبوو ؟

– ئەو لای کەس قسە ناکات ! . . .

بڵێی قسە بکات ؟» .

بێ دەنگ دەڕۆیشتیت . کۆڵانەکان یەك یەك هەڵیاز

...وشیت . (بۆکوێ ؟) .

خۆشت نەتدەزانی . لە نێوان دوو مەشخەڵی گڕو ترس‌دا ...ە پڕوکایت . دڵت قوڵپی دەدا . لەوەدا بوویت لە پەنا ...ێك دا چیچکە بکەیت و ، ملت بنێیت بە لارەوە . ...یتە پرمەی گریان . گەرەکە ماڵێك لە خۆت گرد بکەیتەوە . ... دێن دەستت دەگرن و بە زۆر بەرەو ماڵەوەت دەبەنەوە .

«هەر ئەوەندەش بزانن لە ماڵەوەم . دێنە وێزەم . تێر تێرم ...کوتن و ، تا بەندی خانەش نامگیرسێننەوە !»

گڕی چاوەکانی دایکیشت هێندەی تر دەیهێنایەوە یێك . ...ترانی چاوت بۆ دەگێرێت . لەمندالان دەپرسێت تا ...مەکەی دەستگیر دەبێت . دەزانی تۆ کەتنەکەت کردوە . . دەرۆیتەوە پیشت لێ دەخواتەوە .

— نەء . . نارۆمەوە . . . . ئەچمە ماڵی ( . . . ) .

- ئەی شەو ؟

- ... توانم !» .

تەواو ئاڵۆز بوو بوویت . ڕەنگت بوو بووە بەیانەی زەرد . ...ت وەك ئەو پیاوە ڕەنگ دێزە دەم و لووت هەڵپێچراوە ...تە پێش چاو کە پێش ماوەیەك مامۆستاکەی کە تۆی لە ...خانە وەرگرت ، لە چەقی شەقامەکەدا بە هەڵە خپ کرد و ، ...ئ بەرزەکی بانان خۆی لە تەنگی کۆڵانەکان ترنجاند ! .

(بڵێی مرۆڤ لەوە بە دوا بتوانی ئاسوودە بژی ؟ . . بڕوا . کەم !)

هەنگاوەکانت وەك جەستەت شێواو ، بەڵام شارەزایانە ...ڵانەکانیان دەدایە دەم یەك . ئەو کۆڵانانەی کە تا خۆر خۆی ...کردایەتەوە بە ئاسۆی ماڵی خۆی‌دا ، تۆ و شلێرو ئەوانی تر بە جو شارکێ و شار گرەوە لە کۆڵیان نەدەبوونەوە .

ئالوودەیی تۆ و ئەو لە مێژ بوو سەرنجی دایکتانی کێش ...کردبوو . زۆر جار لێتان دەبیستن :

— لە ئێستاوە چەند یەکتریان خۆش دەوێت ؟

— دڵ لە دڵ مەدە ، کە گەورە بوون وانامێنن .

— خوا بیکات ئەیکەم بە بووکی خۆم !

بە پێچەوانەوە . تەنها کەسێك لەو ساتەدا کە ڕقت لێ دەکێشا (شلێر) بوو ! چونکە بەلاتەوە تا کە کەسێك بوو کە لە هەموو شتێك وەئاگا بوو . زۆر جار کە دوور دەکەوتنەوە دایکت ئەوی بانگ دەکرد و لێی دەپرسی :

— ئەوە لە کوێ بوون ؟ چیتان کرد ؟

ئەویش ڕاستی دەووت و ، بڕوای پێ دەکرد . «خۆم ئەزانم ! ئێستا هەموو شتێکی گێڕاوەتەوە . هەمووشیان دەووروژێنێت . چەندان کەس دەکەونە ئەم کۆڵانانە . چەندانی تر ماڵە و ماڵ بە دومدا دەگەڕێن !» .

هێندە ئاوڕت دایەوەو ، ئەملاو لای خۆت بەسەر کردەوە . بەر چاوەکانت تاریك داهاتن . ڕووناکی هیچ ماڵێکیش دڵی ڕۆشن نەدەکردیتەوە . شاریش بەرگە ئاڵ و والاکەی ئەو ڕۆژەی فڕێ دا . وەك دایکێکی جگەر سووتاو کفنی ڕەشی شەوی دەپۆشی .

پیاوانی بازاڕیش بە دەستە سری پڕ میوەوە بەلاتا تێدەپەڕین . بێ خەم خۆیان دەکردەوە بە ماڵەکانیاندا . دەرگاکانیان لەو دیوەوە کلۆم دەدا ! .

«ئێستا باوکیشم هیلاك و ماندوو دەگەڕێتەوە . لە ڕێوە هەواڵی من دەپرسێت . لە ماڵ نیم . دەرگاکە کلۆم دەدات . ناهێڵن پشوویەك بدات لە نوکەوە بۆی دەگێڕنەوە . چاوی دەپەڕێتە پشتی سەری . هەڵدەستێت و ، بەر پێی خۆی بەدی ناکات . هەرەشەی سەر هەڵکەندنم لێ دەکات !»

دوا چەرخەت کرد . ناچاری ملی ئەو شەقامە لارو لەوێرەی پێ گرتیت کە دەتداتەوە دەست ماڵەوە . هەنگاوەکانت پاڵیان پێوە دەنایت . تا زووتر خۆت بکەیت بە سەر شاری ماڵەوەداو ، خۆت گڕر بدەیت . گەیشتیتە ئاستی دیوارە بێ توێخەکەی ماڵی خۆتان . چەند کەسێکی گەڕەك بە دەم مشتو مڕەوە ، بەرەو ڕووت هاتن :

— کاکە من خۆم دەزانم . . لەو زیاتر کەس نی‌یە .

– ئینجا وا ئەویش بوو . بڵێ چی ؟ حەز دەکات . . . ؟ پڕ بە دڵ حەزت دەکرد ببیتە لەتە خشتێکی کاڵ و ، بچیتە چینی دیوارەکەوە . جێت بە خۆت نەدەگرت . تا گەیشتنە ئاستت دەنگی دڵت دەهات . هەناسەت سوار بوو بوو ! کەچی ئاسایی و ، بێ هیچ گرنگیەك بەلاتا ڕەت بوون . بە دویدا کەمێك هێور بوویتەوە . هەناسەیەکی سەرفەرازیت هەڵمژی .

«ڕەنگە ئەمانە ئاگایان لە هیچ نەبێت !»

کەوتیتەوە پەلە کردن . لە سووچی دیوارەکەوە نامۆیانە بە کۆڵانەکەدا هەڵتروانی . وات دەزانی ئەمە چەند ساڵە و لیّی براویت . تا خۆت گەیاندە دەم دەرگاکە هەستت دەکرد کە لە درزی دەرگاکانی ئەمبەر و ئەو بەرتەوە هەر چاوەو لێت زیت دەبێتەوە . بە پەلە پاڵت پێوە نا .

نەکرایەوە . بەگران سەرت بڵند کردەوە . بە قفڵێکی ڕەش کلۆم درابوو .

«دایکم لە کوێ بێت ؟ ئەی باوکم چۆن نە هاتۆتەوە ؟ ئەبێ ئەوانیان لە جیّی من ڕاپێچ کردبێت !»

ویستت پڕ بە خۆت هاوار بکەیت . جارێکی دیکە هەڵبێیت و ، سەر بە دەریا تاریکەکەی شەوەوە بنێیت .

«چی بکەم ؟ بەم شەوە بچم بۆ کوێ ؟» .

– بۆ کوێ دەچیت ؟

بە دوایدا دوو پەنجەی ڕەق و زبر لە دواوە گوێچکەیان گوشیت . جەستەت بوو بە نەمامێکی ساواو بە ئاسانی بە دەستیەوە دەهات و دەچوو .

ڕووی بۆلای خۆی وەرگێڕایت . کەسەیرت کرد مامە حاجی دوکاندار بوو . سەیرێکی ئەم لاو ئەولای خۆی کرد . بە هێمنی ووتی :–

– جارێکی تر نەتبینم ئاگر بکەیتەوە . . ئەوە باشە ؟ تێگەیشتی ؟

گەرووت بەیەکدا نوسا بوو . ڕێی بە دەربازبوونی وەڵامەکانت نەدەدا . دەتوویست بڵێی :–

(– بەڵێ تێگەیشتم . بەڵام خۆزگە دەمزانی چی بووە ؟) .

مامە حاجی ئەوەندەی ووت و ، ڕێی خۆی گرت . تۆش لەپێ نایە شوێن ئازارەکەو ، ڕێشت بە قسەکانی نەدەدا سارێژ بین ! دڵت پڕ بوو بوو . چاوێکت بە دەرگاکاندا گێڕا .

خڕ داخرا بوون . چاوەکان تیایدا نیشتبوون .

لە دوورەوە دایکت بەدی کرد لە ماڵی (شلێر)ەوە وەدەرکەوت . بە چاوێکی پڕ ڕقەوە بەرەو رووت هات . بە دەستێکی لەرزۆکەوە دەرگاکەی ترازاند . لە پێش ئەودا خۆت کرد بە ژووردا . بەخێرایی گەیشتە سەرت . ئەویش هەموو هێزی لە بادانی گوێتا تاقی کردەوە .

– بێ گوێ ! چەند جارم ووت ئاگر بازی مەکە ؟ هەبێ و نەبێ ئەمە کەتنی تۆیە ! لەو کچە داماوە نەبوویتەوە تا سکی دایکیت سوتاندا !

ئەو داماوە بەدەم گرەوە ڕای کرد . کە کەوتیش وەك بووکە شووشە توایەوە . .

وەرە تاکەس نەیزانیوە تۆ بوویت یان نەء ؟ ! قسەکانی دایە ئاگرێك بوون لە ناخەوە جۆشی دەدایت . چاوەکانت بوونە دوو گۆمی خوێن و ، ڕق و خۆشەویستی تیایدا تێکەڵ بە یەك بوو بوون . پیشت دەخواردەوە . ئازارو گریانت پێچایە ناخی خۆتەوە . خۆت بە پێوە نەدەگرت . بە خێرایی خۆت کرد بە ژوورەکەدا لە پەو ڕوو کەوتیت . هەنسکت هەڵدەدا .

کە گوێت لە دەنگی باوکت بوو ، ڕاچڵەکیت . بۆ لێزمەی ڕقی ئەویش خۆت ئامادە کرد . بەڵام نەهاتە ژوورەوە . هەر لەدەرگاکەوە بانگی کرد :

– ئافرەت گورج کە ئەو چەرخەم بۆ بێنە . ئەمرۆ لە بیرم چوو بوو ! ! با بچم بەلای ئەو ماڵەوە . وەبیرت هاتەوە . لە چاو تروکاندنێکدا چەرخەکەت لە گیرفانی شەرواڵەکەت دەرهێنا و ، لە شوێن جێگەکەی باوکت داتنایەوە . هێدی هێدی هێور بوویتەوە و ، خەوت لێ کەوت . ئیتر لەو ساوە ئاگرو سوتان بوونەتە دوو خەونی ناخۆش و شەوانە یەخەت پێ دەگرن . .

# پیاوکوژ

**نووسینی ئاگاتا کریستی**

**وەرگێرانی لە ئینگلیزیەوە**

**ئازاد پێنجوێنی**



لەناکاو ، «بۆنورمۆر» هەستی‌کرد ئەو پێخەفەی پێش چەند سەعاتێك ، فێنك‌و خۆش پیی نوستبوو ، گەرم‌داهاتووەو ەواو بێ تاقەتی‌کردوە ، بۆیە بە پێ فڕی‌داو لە جێگەکەی خۆی ستبوەوە .

ڕۆشنایی مانگ کە لە پەنجەرەکەوە دەهاتە ژوورەوە ، ژوورەکەی ڕووناك کردبوەوە . بۆنور سەیرێکی لەشی زلی خۆیی کردو ئاخێکی هەڵکێشا ! .

«بۆچی وەرزشە ئاسایی‌یەکەی پشت‌گوێ خستوە ؟ خۆ ەشی یەکپارچە بۆتە گۆشت‌و بەز ! . کەچی خۆیشی ڕقی لە قەڵەوی‌ی ژنەکەی‌و پانی‌ی سنگ‌و ناوشانی دەبوەوە» .

ناواخنی سەرینەکەی لە پەڕی قازبوو . . . ئەو قازانەی کە بە تایبەت لە هەندەرانەوە هێنرابوون . هەرچەند زۆر گرانیش کەوتبوو ، بەڵام لەبەر قورسی‌ی سەری ، سەرینەکەی وەك بەردی ڕەق دەهاتە پێش چاو ! . بە دەستێکی گرنی‌و بەوی‌تر بەتووڕەیی‌یەوە بەر مشتەکۆڵەی‌دا . . . بەڵکو ئەمە خوایە کەمێك نەرم‌بێتەوە ! ! . پاش ئەو زرم‌وکوتە ، خەوی لی‌زڕاو هەستی‌کرد وازوو خەو ناچێتەوە چاوی .

ئەری بەڕاست . . . چی بەخەبەری هێنا ؟ ؟ . . تۆ بڵێی هەوای ژوورەکە . . یان گەرمی‌ی پێخەفەکە بووبێت ؟ خۆ ژوورەکەی ئەمیش ، وەك ئەوەی «جوسیلینی» ژنی فێنك کەرەوەی تیایە . . . کەواتە هۆیەکی تر هەیە . . . ئا ! دۆزیەوە ! . . . ئەو تەقەیەی لە نهۆمی خوارەوە هات . گوێی هەڵخست» . . . (بێ گومان ، ئەوە جۆسیلینە ، لە خەو هەڵساوەو بەم نیوەشەوە بۆ شتێ ئەگەڕێ بیخوات .) . . ئۆف لەم ژنە نەوسنە هەرگیز تێر نابێت ! ! . ڕاستە ئەو دەنگەی نهۆمی خوارەوە ، دەنگێکی نزم بوو . . بەڵام ئەم وا ڕاهاتبوو کە زۆر جار جۆسیلین لە قافا بگرێ (ئەوکاتەی لە چێشتخانەکەدا بۆ خواردن دەگەڕێ‌و وەك سەماکەری بالێ لەسەر نووکی پەنجەدە ڕوا ، تاوەکو مێردەکەی پیی نەزانێ .)

جێگەکەی جێ‌هێشت . . . دەرگای ژوورەکەی کردوەو گوێی گرت . . . (بەبیری نایەت کەی بوو بڕیاری ئەوەیان دا بەجیا بنوون ، هەر یەکەیان لە ژووری خۆی ، جۆسیلین لە نهۆمی خوارەوە ، ئەمیش لەسەرەوە .) . . . بڕیارێکی زۆر لەباربوو ، چونکە ڕزگاری‌کرد لە نارەحەتی‌ی نووستنی شەو ، کاتێك هەناسەی گەرمی جوسیلین خەریك‌بوو ملی ئەسووتاند ! وەیان کە دەیبینی وەك فیلێك لەپاڵیا ڕاکشاوە ! ! . هەرگیز

ئەوەی بەخەیاڵدا نەدەهات کە پاش پانزە ساڵ ژنو مێردایەتی ، ئەو ژنە ناسكو ڕێكو پێکەی ، دەبێتە گرمۆڵەیەك گۆشتو بەزی ڕەزاقورس ! .

لەسەر جیاکەرەوەی ئەو قادرمەیەی کە هەردوو نهۆمی پێکەوە دەگەیاند ، سەیرێکی ژوورەکەی جۆسیلینی کرد . بینی ی تاریکە ! زۆر سەری‌سوڕما ! چونکە نەك هەر ژوورەکەی ئەو ، نهۆمی خوارەوە هەمووی تاریك بوو . لە دڵی خۆیا وتی : «ئەگەر جۆسیلین لە خەو دابێ ، ئەی ئەو دەنگە دەنگە یانی چی ؟ !»

(قسەی هاورێیەکی بیرکەوتەوە لەبارەی دزێکەوە کە لەم شەوانەی دوایی‌دا چووبوە سەر چەند ماڵێکی گەڕەکەکە . «تۆ بڵێی دز هاتبێتە سەرمان ؟ !» . بڕیاری‌دا بزانێ مەسەلە چی‌یە . لە قادرمەکە هاتەخوارەوە . . . لەپڕ وەستا ! . . . زۆربەی دزان چەك بەکاردێنن . بۆکوشتن یان ترساندن . . . دوودڵ بوو لەوەی بچێتە خوارەوە یان بگەڕێتەوە ژوورەکەی ، . . نێوچەوانی ئارەق لێ دەتکا . . . دەنگەکە نەماو خامۆشی باڵی بەسەر ئەو ناوەداکێشا . « تۆ بڵێی گوێی زرنگا بێتەوە ؟ .» . هاتە خوارەوەو لەبەر ژووری میواندا وەستا . دەرگاکەی کردەوەو وتی :—

— کێ لێی‌یە ؟ . . . (خشپەیەکی هاتەگوێ) . . . دیسان وتی :—

— ئەوە کێیە ؟ . . . شەوقێکی بەتین دای لەچاوی ! . بەکێك بەدەنگێکی گڕ وتی :—

— ڕاوەستە لەجێی خۆت ! . . . هەنگاوێکی تر بێیتە پێشەوە کوژراوی ! . (لە شوێنی خۆی ووشكبوو ! . ئارەق نێوچەوانی دەبریقایەوە . لە خۆیەوە هەردوو دەستی بەرزکردەوە . وای هەست‌دەکرد لوولەی دەمانچەی ئاراستەکراوە !) .

— وەرە ژوورەوە :

(شەوقە بەتینەکە هی لایتێك بوو لە وانەی دز بەکاریان دێنێ ! .)

بونور چووە ژوورەوە ، ویستی شتێ بڵێ ، بەڵام دەنگی دەرنەهات ! .

کابرا وتی :

— دانیشە .

— چی ؟ ؟

— وتم دانیشە ! . (بازنەی ڕووناکیەکە لەسەر دەم‌وچاوی بونورەوە گوێزرایەوە بۆسەر کورسیەك .) بونور لەسەر لێوارەکەی دانیشتو بەترسەوە وتی :—

— هەرچیت ئەوێ بیبەو ئەم ماڵە بەجێبێڵە .

(کابرا دەرگەکەی داخست)و وتی :

— لەراستیدا ، چاوەڕێی ئەوەم نەدەکرد لێرە کەس ببینم ! بەڵام وا تۆ هاتیت ، بۆچی سوودت لێ وەرنەگرم ؟ ! بۆنموونە . . . ئەتوانی شوێنی پارچەکانی خوانە زیوینەکە نیشانبدەی .

— لە هۆڵی (نان خواردن)ن ، حەزدەکەی هەموویان بەرە کورە هەرچیت دەوێ ببە . بەتەنگەوە نایەم ! چونکە ماڵەکە «تەئمین» کردوە .

— بەڕاست ؟ ! . کەوابێ ئیشەکەم ئاسانبوو ! . ئەڵێی چی ، پێکەوەو لەسەرخۆ ڕێكبکەوین ؟ ! ! .

(بونور ئەوەندی لە تواناندا هەبوو ڕازی بێ) . . وتی :-

— لەسەرخۆ ! .

(سەیرێکی کابرای دزەی کرد . . بینی کورتە باڵایەکی ناشیرینە ، دوو چاوی بریقەدار . . . جووتێك دەستکێشی لە دەستایە) . — چیت ئەوێ ؟ . . . (دزە پێکەنی)و وتی :-

— چیم بوێت ؟ . . . ئەمەوێ دەستکەوتێکی باشم بێ‌و تۆش بەشی خۆت مسۆگەر بکەیت ! ! .

— بەشی خۆم ؟ !

— ئا . . . (جارێکیان ، ماڵێکم بری ، خاوەنەکەی داوای لە کۆمپانیای تەئمین کرد کە پارەی شتە دزراوەکانی بۆ بژێرن

نەوانە پارەی زۆر شتی‌تر کە من نەم دزیبوون‌و نەشم دیبوون !) . کۆمپانیا بێ چەندو چوون داواکەی بەجیّ‌هێنا ، جا تۆش ئەتوانی هەمان شت‌بکەیت .

– باشە . . . . تکات لیّ‌ئەکەم هەر چیت ئەویّ بیبەو برۆ .

– گوێ‌بگرە ! ئەوەی پێم وتی سوودی تۆی تیایە ، جا پێویستە هەرچی شتێك کە بەنرخ‌و گرانەو بەئاسانی هەڵدەگیریّ ، نیشانمی بدەیت .

بونور ترسەکەی رەوەیەوەو هاتەوە سەرخۆ ، چونکە دزە وەك بازرگانێك مامەڵەی‌دەکرد .

– کەوای لیّ‌هات ، هەندیّ قاپ‌و قاچاخ‌و ئامرازی زیوینی خواردنمان هەیە کە ژنەکەم لە دایکیەوە بۆی بەجیّ‌ماوە ، زۆرم پیّ‌خۆشە هەموویان ببەیت .

هەروەها هەندیّ خشڵ‌و ئاڵتوونیشی هەیە بەلاّم نازانم لەکویّ شاردوویەتیەوە . پارەش تەنها پەنجا دۆلارمان لەماڵەوە هەیە ، چونکە ئێمە پارە لە بانك دادەنێین .

– ناشیّ نیازی ئەوەت هەبیّ چەکێکم بدەیتیّ ؟ . . . . نا . . نا . . من شتی وا قبوولّ ناکەم ! .

– تۆ بوەستە . . . پەلەمەکە . . . . شتێك هات بەبیرما . . .

– ها چی‌یە ؟

– کارێکی تایبەتیم هەیە ، ئەگەر بۆمی بکەیت ئەوا چەکێکت ئەدەمیّ بە پارەیەکی باش ! ! .

– قسەی هیچ ! ! . . .

– کورە بەراستمە ! وایشی رێك‌ئەخەین کە تۆ بەئاسانی پارەی چەکەکەت دەست‌بکەویّ بیّ‌ئەوەی من بتوانم رێگیریت لیّ‌بکەم .

– باشە ئەو کارە چی‌یە ؟

(بونور بۆ پێشەوە چەمایەوە)و بە دەنگێکی نزم وتی :–

– ئەوەی من ئەیڵێم . . . نا . . نا . . . لەوانە نیە بتوانی بەجیّ‌ی بێنی . . . چونکە لە (دزی‌کردن) مەترسی دارترە ! ! . . .

– کورە کار نیە نەتوانم بەجیّ‌ی‌بێنم ! من لە شانزە ساڵیەوە دزیّتی ئەکەم‌و تا ئێستا چوار جار بەندیخانەم دیوە . . ! .

– تۆ تێناگەی ! من ئەڵێم چی ؟ . . . بەکورتیەکەی زەلامێکم ئەویّ دەمانچە هەڵبگریّ‌و بزانێت بەکاری‌بێنیّ ! .

(دزە کەمێك بیّ دەنگ‌بوو . .) پاشان ووتی :–

– ئا . . . تیّ‌گەیشتم ! تۆ ئەتەویّ لە کەسێك رزگارت‌بێت . . . ژنت هێناوە ؟

– بەڵیّ .

– وەئەتەویّ بیّ ژن بمێنیتەوە ! . . . (سەرێکی بۆ خوراند)و وتی :–

– کارێکی گرانە ! . . . تا ئێستا دوو پیاوم کوشتوە ، بەلاّم ژن . . .نا ! .

– خۆم وتم ناتوانی .

– نا . . . بەپێچەوانەوە ! . . . . . بەلاّم بزانم مەرجەکانت چی‌یە ؟

– جاریّ پێم بڵیّ ، چۆن هاتیتە ئەم ماڵەوە ؟

– لە پەنجەرەوە .

– کرابووەوە ؟

– نەء . . . . شوشەکەیم شکاندو کردمەوە . . . بۆچی گوێت لە هیچ بوە ؟ ؟

– نەخێر ! ! ! .

(بەفیزەوە . . . زەردەخەنەیەك گرتی)و وتی :–

– من دڵنیام کە گوێت لە هیچ نەبوە ! .

– ئەوەی پێم ووتی ، پێویستی بە پیاوکوژێك هەیە . جا تۆ ئەتوانی وا بکەی کە پۆلیس‌و لێکۆڵەرەوەکان وا بزانن ئەمە ئیشی پیاوکوژێکە ؟ ؟

– لەو باوەرەدام بتوانم . .

– دە زۆر باشە . . . ژنەکەم لە دوایین ژووری ئەم نهۆمەدا نووستوە ، زۆر خەوی قورسە . . . لەوە ئاسانتر نیە کە بچیتە ژوورەوەو بە فیشەکێك ساردی بکەیتەوە .

کابرا سەیری دەمانچەکەی دەستی کردو وتی :—
— ئەوە دەنگێکی زۆری لێوە دێو خەڵکی سەر جادە گوێیان لێ‌دەبێت . دوای ئەوەش ئەم دەمانچەیە فیشەکی تیانیە ! . من لە دزی ئاوەهادا پەنا نابەمە بەر تەقەو خۆم تووشی بەلاّ ناکەم .
— ئێ کەوای لێ‌هات . . . بەهەر شێوەیەك دەبێ بیکوژە . ئەتوانی سەرینەکەی بەکاربێنی‌و هەناسەی لێ ببریت .
— وایە . . . وایە . . . ئەوە چاکترین ڕێگەیە . نەئەبێ بەهۆی دەنگەدەنگ‌و نە قیژەو هاواریش . بەلاّم بۆ ئەمە چەندم ئەدەیتێ ؟
— هەزار دۆلار چۆنە ؟
— حای ! نوکتەیە ! . . . هەزار دۆلار ؟ . . . من ئەتوانم هەرچی شتی بە نرخی ئەم ماڵەیە ببەم ، کە نرخیان لە دوو هەزار دۆلار زیاترەو خۆیشم تووشی بێنەو بەرە ناکەم .
— باشە با دوو هەزار بێت .
— نەخێر . . . پێنج هەزار !
— پێنج هەزار ؟ شتی وا نابێت ! .
— ئەوەیە کە پێم وتی . پێنج هەزار ئەویش لەبەر ئەوەی مەسەلەکە کوشتنەو ئەوەش کارێکی وا ئاسان نیە !
— باشە . . . چەکێکت ئەدەمێ بەو نرخە . . . وەدڵنیابە کە پارەکەت لە باخەڵایە . . .
چونکە منیش بەشدارم لەم تاوانەداو . . . هەر کاتێ پارەکەت دەست‌نەکەوت ، ئەتوانی ڕاستیم لێ‌بڵێی !
— زۆر چاکە ، کەواتە ڕیك‌کەوتین .
— دە ، هەر ئێستە دەست‌پێ‌بکە . هەروەك وتم ، دوایین ژوور بەلای دەستە ڕاستا . هەر کاتێ لێ‌بوویتەوە ، وەرە سەرەوە لەوێ چاوەڕێت دەکەم .
بونور چوە ژوورەکەی خۆی . جگەرەیەکی داگیرساند ، دەستی‌کرد بەهاتوچۆ . . . جگەرەی دوەمی داگیرساند ، پاشان سێ‌یەم . . . «خنکاندنی جۆسیلین ئەوەندەی ئەوێ ؟ ؟ . . . ئاخۆ چی ڕووی‌دابێت ؟» . جگەرەکەی کوژاندەوەو لەسەرخۆ بە قادرمەکەدا هاتەخوارێ . . . گەیشتە بەر ژووری جوسیلین‌و گوێی نووساند بەدەرگاکەوە ، هیچی نەبیست ! . . . بە ئەسپایی کردیەوەو سەری بردە ژوورەوە . بینی دزەکە لە تەنیشت جێگەی ژنەکەیەوە ، بەپێوە وەستاوە .
بەچرپە لێی پرسی :
— ها . . . . چی‌یە ؟
— هەموو شتێك براوەتەوە !
بونور لە ژنەکەی نزیك‌بوەوەو سەیرێکی‌کرد . بەسەریا چەمایەوەو چرپاندی :—
— جوسیلین . . . ! .
(لە چاو تروکاندنێکا . . . بە مشتەکۆڵەیەکی بەهێزو خێرا بونور کەوتەسەر زەوی‌و پێش ئەوەی لە هۆش خۆی بچێ ، هەستی‌کرد کەوا دەستێك ئەیجووڵێنێ تا لەسەر پشت بکەوێ . . . پاشان وەك خەوبینی . . . شتێکی گەورەی سپی لە ڕووی نزیك دەبێتەوە) . . . بەوجۆرە سەرینەکە لەسەر دەم‌وچاوی ئارامی‌گرت ! !
لەم کاتەدا ژنەکەی لە جێگەکەی ڕاست‌بوەوەو پرسی :
— هەموو شتێك تەواوە ؟
(پاش ئەوەی دزە هەناسەی لە بونور بری هەڵساو وتی :—
— بەڵێ خانم . . . خۆشبەختانە . . . هەموو شتێ بەدڵی تۆیە ! .
— زۆر . . . زۆر سوپاس ! . . .
(پاش ئەوە چەکێکی حەوت هەزار دۆلاری دایە دزەکە . . ! !)

**سەرچاوە**

Eleven short stories
U. K. 1979 London
The Killer, (Agatha Chr)

# چەند تێبینییەك لەسەر «بەرەو سایكۆلۆژیا»

**جەلال خەلەف ژالەیی**

لە گۆڤاری «كاروان»ی ژمارە(٣٦)ی ساڵی ١٩٨٥دا ، ـمۆستا مستەفا پەژار ، بە ناونیشانی «بەرەو سایكۆلۆژیا» ووتارێكی بڵاوكردەوە . ووتارەكە بە گشتی بە كەڵكە چونكە لە ـەی كورتەیەكی ژیانی دەروون زانی‌یەوە دەدوێ ، هەر لە سەروەختی ئیفلاتوونەوە ، تا دەگاتە ئەم سەردەمە ، هەرچەندە ووتارەكە پچڕپچڕی‌یەكی تێداهەیە . . ئەویش چونكە لە ـوسینێكی وەها كورتدا ، نەیتوانیوە ، باسی بابەتێكی فراوان بە ێكرایی بكات .

جا لەبەر ئەوە مامۆستا مستەفا ، لە كۆتایی ووتارەكەیدا ـ وای پتەوكردنی بنچینەی دەروون‌زانی كردووە ، و كورتە ـسێكی پەرتووكەكانی هەردوو مامۆستایان حمە كەریم هەورامی‌و عەبدولستار تاهیر شەریف‌و منی كردووە ، و لە بۆ ئەوە هەوڵ بدەین زێدەتر زاراوە گونجاوەكانی دەروون زانی ـەكار بێنین .

لەبەر ئەو سێ هۆیەی كە باسم كردن ، دەمەوێ چەند ێبینی‌یەك لە بارەی ووتارەكەی كاكی نووسەرەوە دەربڕم .

**یەكەم :**

مامۆستا مستەفا لە لاپەڕە (٧٥)داو لە ئەستوونی (١)دا چەپكێك زاراوەی بۆ (دەروون زانی) پێشنیار كردووە ، وەك ئەمەی كە دەڵێت : «بۆ زاراوەی سایكۆلۆژیا بە كوردی ئەم زاراوانە پێشنیاز دەكرێن ، رەواناسی ، دەروووناسی ، گیاناسی ، رەوانزانی ، دەروون‌زانی ، وگیانزانی» .

هەر لە هەمان شوێندا پێشنیارەكەی هەڵدەوەشێنێتەوە ، ولی‌ی پەشیمان دەبێتەوە ، و بە جۆرێ ووشەی (سایكۆلۆژیا) – شی تێدەخات كە ناونیشانی نووسینەكەی خۆیەتی و دەڵێت .

(بەڵام لەبەر ئەوەی ئەم زانستە . نە سایكۆلۆژیایە ، و نە رەواناسی ، و گیاناسی ، و رەوانزانی ، و دەڕوونزانی ، و گیانزانی ، و (علم النفس)ە ، وامان لەلا بارترە زاراوەكە وەكوو خۆی چۆنە ئێمەی كوردیش بەكاری بێنین) .

راست‌وابوو هەر لێرەدا هۆی ئەوەی باس بكردایە كە بۆچی ئەم زاراوانە هیچ كامێكیان پڕ بە پێستی زانستی‌یەكە نین ، هۆكەشی ئەوەیە ، ئەم زانستی‌یە باسی (دەروون – نفس) ناكات ، بەڵكو باسی كرداری دەروون دەكا كە ئەویش

(ڕەووشتە – السلوك)، هەرچەند زاراوەی (سایکۆلۆژیا)ش ئەو ناتەواوی‌یەی هەیە، و زاراوەی (علم النفس)یش کە عەرەبەکان، بۆ ئەم زانستی‌یە بەکاریان هێناوە هەڵەیە، بەڵام ئەوان دەڵێن هەڵەیەکی بە ناوبانگ، لە شتێکی ڕاستی بێ ناوبانگ باشترە.

برای مامۆستا ئەگەر پێش ئەوەی یەکێك لە زاراوە کوردی‌یەکانی بچەسپێت پێشنیاری بکردایە، چێتر دەبوو، چونکە:

١ – وەك خۆی دەڵێت، تائێستا من دوو پەرتووکم بلاوکردۆتەوە لەسەر بەرگەکانیان (دەروون زانی) نوسراوە.

٢ – دکتۆر هیوا عومەر ئەحمەد کتێبەکەی (و.ب. گۆتەریچ)ی گوریوە بۆ سەر زمانی کوردی‌و زاراوەی (Psychology)ی گوریوە بۆ (دەروون زانی)، کە دەزگای ڕۆشنبیری‌ی کوردی لە زنجیرەی ژمارە (٩٣)ی ساڵی ١٩٨٣ بلاوی کردۆتەوە.

٣ – وێڕای ئەوانەش (دەروون زانی) لەسەر زمان خۆش‌و ساناترە، و لەسەر کێشی زیندەوەرزانی، و کۆڕپەلەزانی، و . . . هتد هاتووە.

٤ – زاراوە کە دانراو کەوتە سەر زاراوەو ماوەیەکی بەسەردا تێپەڕی، ئیدی لەلای خەڵکی دەچەسپێنرێ، بۆیە لە هەچ ڕۆشنبیرێ بپرسی (دەروون زانی) چی‌یە؟ دەست بەجێ لە وەڵامدا دەڵێ. (علم النفس)ە.

٥ – کارێکی ئاسایی‌یە، ئەگەر هەر جۆرە زانستی‌یەك لە ئینگلیزی‌یەوە بگۆردرێتە سەر زمانی کوردی، پێش ئەوە زاراوە لاتینی‌یەکان بگۆردرین، بەکار دێنرێن، وەك شیزۆفرینیاو «هیستیریا»، دواجار نوسەر ڕێی لێ نەگیراوە بەکاری بێنی[١].

**دووەم**: ئەگەر[*] پێناسەی پێنجەمی (دەروون زانی) دەخوێنینەوە، ئەم سێ‌خاڵانەی خوارەوە تێ‌بینی دەکەین:
١ – گۆڕینەکەی دەقاو[٢] دەقە.

٢ – ووشەی (الحیوان)ی بۆ (ئاژەڵ) گۆریوە، لە دەروون زانی‌دا باشتر وابوو بڵێت (گیانەوەر)، چونکە لە کوردی‌داو نەخوازەڵلاش لە کوردەواری‌دا، تەنها ئەو گیانلەبەرانە دەگرێتەوە کە چوارپێن‌و گۆشتیان دەخورێ، یان بۆ گواستنەوە بەکار دێنرێن، و مەیموون‌و سەگ‌و مشك‌و پشیلە . . ناگرێتەوە.

٣ – ووشەی (المجتمع)ی گۆریوە بۆ ووشەی (گەل)یش واتای (الشعب) دەگەیێنی بە زمانی عەرەبی، دروست‌ترو باشتر وابوو ووشەکەی بۆ (کۆمەڵ) بگۆڕرایە.

**سێیەم**: لە باسی دابەش‌کردنی لقەکانی (دەروون زانی)دا کە لە لاپەرە (٧٦)و لە ئەستوونی (١) دان:
١ – (علم القیاسات العقلیە)ی گۆریوە بۆ: (پێوانەکانی هۆش)، ڕاست‌وابوو بڵێت: (زیرەکی پێو)، یان هیچ نەبێ بیگۆرایە بۆ (ئەزموون پێو)، چونکە (العقلیة) چاووگی دەست‌کردە (مصدر صناعي) مەبەستی زانستی پێوانە هۆشێکانە) نەك پێوانەی (هۆش)، دووبارە (عقل) خۆی ناپێورێت، بەڵکو کرداری (عقل)[٣]و توانای کە (زیرەکی)یە، دەپێورێت، بۆیە ڕاست وابوو بگوترێ (زیرەکی پێو)، چونکە زاراوەی (العقل) لە پەرتووکەکانی بیرکاری‌و دەروونی‌دا، گۆڕاوە بۆ (ژیری)، وتواناکەی (الذکاء) گۆڕاوە بۆ (زیرەکی)، زاراوەی (الوعي) گۆڕاوە بۆ زاراوەی (هۆش)، چونکە ئەگەر کەسێك لەسەر خۆی بچێت یان بخرێتە ژێر بەنجی نەشتەرگەری‌یەوە، پێی دەگوترێ (بێ‌هۆش‌بووە)، نەك (بێ عەقڵ بووە).

٢ – نازانم مەبەست چی‌یە لە (سایکۆلۆژیای ناسین – سـایکولوجیة التعرف) ، کە لە دێری (١٩) دا باسی ێوەکردووە ، تۆ بڵێی مەبەستی (سەرناسین – الفراسة) بێت ؟ ...ن مەبەستی (کەسێتی پێوەکان – اختبارات الشخصیة) بێت .
٣ – گۆڕینی (سایکولوجیة الشخصیة)[٤] بۆ (سایکۆلۆژیای کەسایەتی) ڕاست نی‌یە ، چونکە (کەسێتی) زیاتر بەکار هێنراوە ، و کەسایەتی‌یش لە واتای خزمایەتی‌یەوە نێزیکترە .
٤ – (علم النفس الکبار)ی گۆڕیوە بۆ (سایکۆلۆژیای گەوران) ، ئەگەر بیکردایە بە (سایکۆلۆژیای گەورە) باشتربوو چونکە (گەورە) واتای (کۆ)یش دەبەخشێ ، بەڵام لە عەرەبی‌یەکەدا (الکبیر) سیفەتی (مشبهە)یە ، بۆیە کراوە بە (الکبار) .

**چوارەم** :

١ – لە لاپەرە (٧٧) ئەستوونی (١) لە دێری (٤)دا دەڵێت : (هەر لە کاتی ئەفلاتوون‌و ئەریستۆوە ، زانیاری‌یەکانی سایکۆلوژیا ، خۆیان خستۆتە ناو بابەتە سەرەکی‌یەکانی فەلسەفەوە) ، کرداری «خۆیان خستۆتە» وادەگەیێنێ کە دەروون زانی لە پێشاندا زانستی‌یەکی سەربەخۆ بوو‌بێت .
٢ – لە هەمان ئەستووندا ، لە دێری (٩)دا ، دەڵێت : (ئەریستۆیش لە بارەی فرمانی هۆشەوە چەند بنچینەیەکی باس کردووە ، کە ئەمانەن :
١ – پێکەوەبوون ٢ – لە یەکچوون ٣ – دژایەتی . وەك من بزانم یاساکەی ئەریستۆ کە بۆ شت بیرهاتنەوە ، دایناوە (پێکەوەبوون – المعیة) یان (التجمع)ی تێدانی‌یە ، بەڵام (لێك نزیك‌بوون – التجاور)ی تێدا هەیە .
٣ – هەر لە هەمان لاپەرەداو لە هەمان ئەستووندا لە دێری (٢٩)یەمدا دەڵێت : (سایکۆلۆژیا مێژووەکەی لە ساڵی ١٨٧٩دا ، بەرەژوورتر ناروات ، ئەو ساڵەی کە (ڤۆنت) ئەزمونگەی) . . کەچی دکتۆر ئەحمەد[٥] عیززەت ڕاجح دەڵێت : ڤۆنت تاقیگەکەی لە شاری لێبزك ساڵی (١٨٩٧) دامەزراند ، بەڵام دکتۆر فاخر عاقل[٦] لە کتێبەکەیدا (مدارس علم النفس) ، دەڵێ ڤۆنت ساڵی ١٨٧٩ تاقیگەکەی دامەزراندووە ، دوور نی‌یە هەڵە هەڵەی چاپ‌بێت .

**پێنجەم** : لە باس‌کردنی قۆناغەکانی گەشەکردندا ، کەوتۆتە چەند هەڵەیەکەوە : ١ – دەڵێت : (قۆناغی بەر لە دایك‌بوون : لە سك کەوتنەوە دەست پێ‌دەکاو بە بوونی کۆتایی دێت‌و ماوەکەی نۆ مانگە) .

وێڕای ئەوە کە ئەم ڕستانە کرچ‌و کاڵن ، ڕاست‌وابوو بڵێ : قۆناغی پێش لە دایك‌بوون (لە پیتێنەوە – لە دایك‌بوون)ەوە ، چونکە هەموو کۆرپە لە یەك ، بە (٩) مانگی لە دایك نابێت ، بەڵکو هی واهەیە بە (٧) مانگ ، هی واش هەیە بە (٤٠) هەفتە کە دەکاتە (٢٨٠) ڕۆژ ، و هەندێ زانا دەڵێن : کورپەلە نێزیکەی (٢٦٥) ڕۆژ لە سکی دایکیدا دەمێنێتەوە .
٢ – هەر لە پاش چەند دێرێکیش دەڵێ : (٧ – قۆناغی پیاوەتی ، یان دایکێتی) ، ڕاست وابوو بڵێ : قۆناغی کامڵی ، چونکە (مرحلة الرجولة والأمومة) تائیستە نەبیستراوە ، لەبەر ئەوەش مەرج نی‌یە پیاو لە (٢٤) ساڵی بە دوواوە پیاو بێت ، و کە پیریش‌بوو ، پیاو نەبێت ! ! یانیش ئافرەت لە (٢٤) ساڵی بە دواوە بیێ بە دایك لە پاشانیش نازانم لە بەرچی کۆتایی ئەم قۆناغەو سەرەتای قۆناغی پیری‌ی دیاری نەکردووە ؟ ! یانیش کە ووشەی پیاوی بەکار هێناوە ، ئەی باشە ووشەی ئافرەت ، یان ژنی لە بری (دایکێتی) بۆ چ بەکار نەهێناوە ؟ یانیش کە دایکێتی بەکار هێنا ئەدی (باوکێتی) بۆ بەکار نەهێنا لە جیاتی ئەوەی بڵێ (پیاوەتی) ؟ . . وێڕای هەموو ئەمانەش (پیاوەتی) چاووگی دەست‌کردە ، واتای چاکەکردن‌و پیاوەتی دەگەیێنێ ، بێجگە لەوەش واتای هێزو تووانای (توخمی)یش دەگەیێنێ .

**شەشەم** : مامۆستا مستەفا کە لەو پەرتووکانەوە دەدوێ کە بە کوردی لە بارەی منداڵەوە نوسراون ، دیاردی[٩] بۆ یەکێك لە پەرتووکەکانی من کردووەو ووتوویەتی : (لێرەدا وابەپێویستی

دەزانم تەنیا لە بارەی پەرتووکەکەی مامۆستا جلال سرنجی خوێنەر بۆ ئەوە رابکێشم کە ئەم ناونیشانە هەڵەیەکی زانستی‌یە»

لە وەڵامی ئەمەدا دەتوانم بڵێم راکەی کاك مستەفا هەڵەیەکی زانستی‌یە ، نەك ناونیشانی پەرتووکەکەی من ، ئەویش لە بەر ئەم هۆیانەی لای خوارەوە .

١ – ناونیشانی پەرتووکەکەمی بە هەڵە نووسیوەتەوە ، پەرتووکەکەی من بە ناونیشانی (منداڵ لە قۆناغی دوا منداڵی‌و هەرزەکایدا)یە ، نەك : (منداڵ لە دوا قۆناغی منداڵی‌و هەرزەکاری‌دا) .

٢ – تەنها لە بارەی توخمی‌یەوە ، مامناوەندی‌ی تەمەنی منالْ لە (١٢) ساڵی‌دا ، یان لە (١٥)[٧] ساڵی‌دا ، کۆتایی دێت ، بەڵام گەشەی لەشی بە شێوەی گشتی تا (١٨) ساڵی ، بەڵکوو تا (٢٤) ساڵی گەشەی ناوەستێت ، مامناوەندی‌ی گەشەی ژیری لە (١٨) ساڵی‌دا دەوەستێت ، تەمەنی ئابووری تا (٢٠) بیست ساڵی ، بگرە تا (٢٥) ساڵی بەردەوام دەبێ .

زۆر لە زانا دەروونی‌یەکانی ئەم چاخە ، ئەو رایەیان هەیە ، یەکێك لەو بەڵگانەی کە ئەم رایە دەسەلمێنن ئەم رستانەی دکتۆر «عزیز هنا»یە کە مامۆستای دەروون زانی‌یە لە زانکۆی «عین شمس» لە قاهیرە .

**العلاقة بين الطفولة وبعض الظواهر الأخرى :**

(١) – تختلف فترة الطفولة من جنس لأخر اختلافا كثيرا فطفولة الانسان اطول من طفولة أي كائن حي أخر ، في حين آن طفولة الكائنات الدنيئة ليس لها وجود بالمرة . وعند الحشرات تكون مدة الطفولة قصيرة جدا وتزداد هذه المدة عند الطيور ثم عند الثدييات وتبلغ أقصاها عند الانسان اذ يبلغ حوالى ١٥ سنة . اذا نظرنا اليها من ناحية القدرة على التوالد ، أما من ناحية القدرة الاقتصادية على الانفصال عن الأب فقد تصل الى العشرين واحيانا الى الخامسة والعشرين ومن هذا يستنتج ان مدة الطفولة ورقى الكائن الحي يسيران معا بنسبة مطردة .

(٢) – ويلاحظ أيضا وجود علاقة بين طول مدة الطفولة وظاهرة المرونة في السلوك أو تعدد

٣ – لە پاش ئەوەش من لە کتێبەکەمدا ، باسی دوو قۆناغی دوای یەکی ژیانی مرۆڤم کردووە (قۆناغی دوا منداڵی‌و قۆناغی هەرزەکاری) ، پێویست‌بوو ، یان ناوم بنایە هەرزەکار لە قۆناغی دوا منداڵی‌و هەرزەکاری‌دا ، ئەوکاتە (مجاز) دەبوو بە گوێرەی داهاتوو ، ناوم لێ‌نا (منداڵ لە قۆناغی دوامنداڵی‌و هەرزەکاری‌دا) ، (مجاز)ە ، بە گوێرەی رابوردوو ، چونکە (هەرزەکار) بە تەمەنی منداڵی‌دا تێپەڕیوە ، بە پێی (زانستی رەوانبێژی) ئەمەیان رەوانترە .

٤ – جاوەك ئەو دەڵێ : (علم النفس الطفل) کە ناوی چەندەها پەرتووکەو باسی تەمەنی هەموو مرۆڤ دەکا هەڵەیەکی زانستی‌یە ، چونکە (الطفل) تا (١٢) ساڵ دەگرێتەوە ، نەخێر وانی‌یە لە نووسیندا ریسایەك هەیە پێی دەگوترێ (تغليب – گرتنەوە) ووشەیەك دەوترێت دووەشەی نێزیك یەك ، یان زیاترت مەبەستە .

لە کۆتایی‌دا زۆر سوپاسی مامۆستا مستەفا دەکەم ، ئومێدەوارم تێ‌بینی‌یەکانم بە دڵێکی فراوانەوە وەربگرێ ، و هەز هەموو مەبەستمان خزمەتی راستی بێ .

## سەرچاوەکان


١ – وەکوو پەرتووکی سایکۆلۆجی‌یەتی خوێندنەوە نوسینی مامۆستا حمە کەریم هەورامی .
٢ – ركس نايت‌و مرگريت نايت – تعريب الدكتور عبد علي الجسماني ط ٣ ١٩٨٤ ص ٨
٣ – گۆڤاری پەروەردەو زانست ژمارە (٧ ،٨)ی ساڵی ١٩٧٤ لاپەرە ١٦٧
٣ – دکتۆر هیوا عومەر ئەحمەد – دەروونزانی چاپی یەکەم ساڵی ١٩٨٣ ل ٥٠
٤ – سەرچاوەی ژمارە (١) ل ١٣ ، سەرچاوەی ژمارە (٣)ی یەکەم ل ١٤٦ .
٥ – احمد عزت راجح – اصول علم النفس ط ٧ – دار الكاتب العربي للطباعة والنشر – القاهرة – ١٩٦٨ ص ٣١
٦ – فاخر عاقل – مدارس علم النفس – دار العلم للملايين – بيروت ص ٥
٧ – دكتور عزيز هنا – محاضرات في علم النفس مطبوعة بالرونيو .
٨ – عبدول ستار تاهیر شەریف نەشونماکردنی زانیاری لای منداڵ چاپی یەکەم ١٩٨٢ چاپخانەی (دار العراق) ل ٦٣
٩ – دیاردی – اشارة
(٠) – ئەگەر = کە ، وەختێ

# کارگ یا قارچك

## Mushroom

جلال حمه صالح اسماعیل

– بەشی یەکەم –

کارگ رووەکێکە کە رەگی راستی نی‌یەو گوڵ ناکات‌و کلۆرۆفیلی تێدانی‌یەو شێوەی دەرەوەی وەکو چەتر (سەیوان) وایە . لەوکەروانەیە کە پێ‌ی دەوترێت – (Fleshy Fungus) ، سودی خواردەمەنی تیایە وەك پروتین‌و مەوادی کانزایی وەك ئاسن‌و فۆسفۆرو مس‌و پۆتاسیۆم‌و کالسیۆم‌و لیثیوم‌و هەروەها کارگ نیشاستەی تێدایە ، هەرس کردنی ئاسانە ، جگە لەمانەش کارگ رادەی کۆلسترۆل لە خوێندا کەم دەکاتەوە . چەندەها ڤیتامینی تێدایە وەکو ڤیتامین A, B, C, D هەروەها چەند ترشە ئەمینێکی تری تێدایە کە پێویستە بۆ ژیان وەکو ترشە ئەمیتی فۆلیك‌و کۆلین کە یاریدەی هەرس کردنی چەوری دەدات ، جگە لەمانەش ترشە ئەمینی نیاسین‌و بنتاثینك (Niacin and Pantothenic)ی تێدایە کە بەکاردەهێنرێت بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی سەودا (Pellagra) سەرەرای ئەمانەش کارگ زۆر کات بەکارهاتووە بۆ چارەسەرکردنی چەند حاڵەتێکی کەم خوێنی ، لەبەر ئەم هۆیانە کارگ بە خواردنێکی باش دەژمێررێت‌و تام‌و چێژێکی خۆشی هەیەو زۆرکەس حەز لە خواردنی دەکات . ئەم خشتەیەی خوارەوە رادەی سەدی پێکهاتووە گشتی‌یەکانی کارگ روون دەکاتەوە :

| مادده | رادەی‌سەدی (٪) |
|---|---|
| ئاو | ٩٠ر٨٠ |
| مەوادی نیترۆجینی | ٤ر٤٠ |
| چەوری | ٠ر٥٦ |
| نیشاستەوشەکر | ٠ر٧٢ |
| سلیلۆز | ٢ر٩٦ |
| مادده کانزایی‌یەکان | ١ر٣٦ |

زوربەی وولاتە ئەوروپی‌یەکان گرنگێکی زۆریان داوە بە کارگ وەك فەرەنساو بەریتانیاو ئەڵەمەنیاو هەروەها چەندەها وڵاتانی‌تر وەك ئەمەریکاو چین‌و ژاپۆن‌و وڵاتەتازە پێگەیشتووەکانی‌تری جیهان . ئەوەی کە بۆتە هۆی گرنگی ئەم رووەکە . ئەوەیە کە بە ئاسانی دەتوانیرێت بەرهەم بهێنرێت‌و وشك بکرێتەوەو بەئاسانی بە قوتو بدرێت (تەعلیب بکرێت) ، بێجگە لەوەی کە بە کاڵی‌و بە کوڵاوی‌و بەجۆرەها لێنانی تردەخورێت .

### شێوەو پێکهاتنی‌و سوری ژیانی

بۆ ئەوەی بزانین بەشێوەیەکی زانستیانە کەوا شێوەو پێکهاتووی کارگ چی‌یە ؟ شێوەی (١) رونی دەکاتەوە کە بریتی‌یە لەم أ–کڵاو (cap) کە وەکو چەتر وایە ، وەلەسەر کڵاوی هەندێك جۆردا پولەکە (scales) هەیە ، ب–ریشوو (gills) کە وەك ریشووی ماسی وایە کە چەندەها شێوەی جودای هەیە کە ئەمەش تایبەتیەکی پۆلێنیە (صفة تصنيفية) کە بەکاردەهێنرێت بۆ جودا کردنەوەی هەندێك توخم ، ج – ئەڵقە (ring) کە هەندێکیان کردنەوەی بۆسەرەوەیەو هەندێکی‌تریان بۆ خوارەوەیەو هەندێ توخمی‌تر ئەڵقەی نیە ، د – قەد یاخود هەڵگر (stalk) ، هـ – لە هەندێ

توخمدا کوپێك هەیە وەیاخود قۆلفەیەك هەیە (cup or volva) کە دەوری بنکەی قەدەکەی داوە وەك لە هەندێ جۆرەکانی Aamanita داهەیە ئەمە کورتەیەك بوو دەربارەی شێوەی دەرەوەو مرۆفۆلۆجی کارگ بەڵام ئەگەر لە رووی توێکاریەوە (من الناحیة التشریحیة) باسی کارگ بکەین و زۆری دەوێت و لەمەقالێکی وا کورتدا ناتوانرێت باسی بکرێت .

بۆ ئەوەی خوێنەری بەرێز زیاتر دەربارەی چۆنێتی دروست بوون و نەشنوما کردنی کارگ بزانێت بە باشم زانی کە سوری ژیانی بخەمە روو وەباسی بکەم کە چۆن پەیدا دەبێت ، سپۆرە بازیدەکان لە ریشووەکانەوە دەگوێزرێتەوە بۆ شوێنێکی لەبارو هەڵکەوتو کەوا ئەندامە ماددەی تێدابێت دەروێت و دەزووەکەروی سەرەتایی کە خانەکانیان تاکە ناوکن (Haploid) پێك دێت ، بە نزیکەوتنی دوو دەزوە کە روی هاو جووت (بەواتای ناوکی هایفەکانیان جیاوازبن (Heterothalic لە نێوانیاندا · وێكبوونەیەك (متداد) دروست دەبێت کە لە هەر دەزوویەکەوە (هایفایەکەوە) ناوکێك دەنێررێت کە ئەمەش سەرەتای دروست بوونی دەزووەکە رووی دووەمە کە بلاو دەبێتەوە لە ناوخۆڵداو کاتێك دەرفەتێکی بۆ هەڵکەوت دەست دەکات بە دابەش بوون و زۆر بوون تاوای لیّ دێت بەرە ئەندام (fruihing body) کە لە سەرەتاوە بچوکەو وەك دوگمە وایە (button stage) ئینجا بەرە بەرە گەورە دەبێت کارگێکی پێگەیشتوو (mature mushroom) دروست دەکات دوای ئەوە ئەمیش بە دەوری خۆی سپۆری بازیدی دروست دەکات بەم شێوەیە جارێکی دی سورەکە دووبارە دەبێتەوە(شێوە٢)

### جۆرەکانی کارگ :

ئەو کارگانەی کە لەم مەقالەدا باسیان دەکەین لە رووی پۆلێنەوە (من الناحیة التصنیفیة) بەم شێوەیەی خوارەوەیە :

Basidiomy Cetes پۆل class

Homobasidiomy cetidae ژێر – پۆل Sub – class

Hymenomy cetes زنجیرە Series




شێوەی(١) أ- تایپی کارگ Agaricus
ب- تایپی کارگ Amanita

Agari cales پلە Order

Agaricaceae خێزان family

لەبەر ئەوەی ئەو توخمو جۆرانەی کە لێرەدا باسیان دەکەین ـەژێر خێزانی (Agaricaceae)ە ئەمیش سەر بە ئۆردەری (Agaricales)ە ، لەبەرئەوە نەختێك تایبەتی‌یەکانی و سیفاتی ئەم ئۆردەرە (پلەیە) باس دەکەین . جۆرەکانی ئەم پلەیە هەندێکیان گەندەخۆرن (رمی Saprophytes) کە دەورێکی ـلأیان هەیە لە دارزاندنی تەختەو دارو پاشماوەی رووەك (مخلفات النبات) ، کەمێکیان مشەخۆرن‌و هەندێکی دیان بە ـەشێوەی هاوگوزەرانی (Symbiosis) دەژین‌و رەگی کەرویی (my corrihza) دروست دەکەن لەگەڵ دارو درەختی جەنگەڵ‌و دارستانەکان ، هەندێکی‌تریان دەخورێن‌و بەشێکی‌تریان ژەهراوین‌و دەبنەهۆی چەندەها نەخۆشی دەروونی (نفسي) ونەخۆشی دەماری (عصبي) بۆ مرۆڤ .

ئەو توخمو جۆرانەی کەسەر بەخێزانی Agaricaceae – وەکو لەمەو پێش باسمان کرد – دابەش دەکرێن بە گوێرەی رەنگی سپۆرە بازیدیەکانی کە هەندێکیان سپین‌و هەندێکی تریان سورێکی تێرن وەیا قاوەین‌و رەنگی‌تریان هەیە وەکو رەش‌و ئەرخەوانی بەپێ‌ی چەشنی توخمەکە . ئەو توخمو جۆرانەش ئەمانەی خوارەوەن :–

١ – توخمی ئاگاریکەس . Agaricus

رەنگی سپۆرەکانی ئەم توخمە ئەرخەوانین Purple



هەروەها ئەڵقەیان (ring) هەیەو بەڵام کوپیان (cup) . نی یە ، زوربەی زۆری جۆرەکانی ئەم توخمە دەخورێن نموونەش لەسەر جۆرەکانی ئەم توخمە ئەمانەی خوارەوەیە :

أ – Agaricus silvathicus : کارگە دارانە :

کارگێکی قاوەیی یە ، کڵاوەکەی پولەکەداره لەو شوێنانە دەروێت کە درەختی سنەوبەری لێیە بۆنێکی تیژی هەیەو کارگێکی باشەو بۆ خواردن دەستدەدات .

ب – Agaricus campestris : کارگی کێڵگە

ئەمیش کارگێکی دەشتەکی یە (کێوی یە) بۆخواردن دەستدەدات ، لە دوای مانگی تەمموزەوە سەر دەکات ، لە کارگە کشت و کاڵیەکان جودا دەکرێتەوە بەوەی کە ئەڵقەیەکی تەنك هەیە لەسەر قەدەکەی .

ج – Agaricus bisporus کارگی چاندن (یان کارگی کشت وکاڵی) . ئەم کارگەش دەروێت بەشێوەیەکی دەشتەکی ، بەڵام ئێستا بەشێوەیەکی بازرگانی لە زۆر وڵاتان زۆر کراوە . وە لەبەریتانیادا بەپیشەسازیەکی وا دەژمێررێت کە چەندەها ملیۆن پاوەند وەدەست دێنێت .

د – Agaricus arvensis کارگی ئەسپ

جۆرە کارگێکی گەورەیە لەقەبارەداو لە تام و بۆدا وەکو تامی بادەم وایە ، کاتی پێگەیشتنی زەرد باوێکی بریسکەدارە . لەشوێنە دەشتاویەکان و مێرگوزاردا دەروێت بۆ خواردنیش دەستدەدات .

هـ – Agaricus augustus : کارگێکی گەورەی پولەکەدارە لەو شوێنانەدا دەروێت کە خوڵ و گڵەکەی جۆری تەباشیرین (chalky soils) ، کاتی پێکەیشتنی ڕەنگەکەی زەردباو دەنوێنێت .

٢ – توخمی کۆپرانیەس Coprinus : ڕەنگی سپۆرەکانی ڕەش ن و ڕیشووەکانی نەرم و شلن و ئاوێکی ڕەش پیایدا دێتە خوارەوە دڵۆپە دڵۆپ وەکو مرەکەب . هەندێکیان لەسەر مەوادی گەنیوو پاشماوەی (پاشە ڕۆی) ئاژەڵ دەژین و هەندێکی تریان لەسەر دارە ڕزیوی سەر زەوی دەژی ، نموونەش لەسەر ئەم توخمە : Coprinus Comatus کە ئەم جۆرەش زۆرو بڵاوە لە باخچەکانداو زوو دەروێت و سەر دەردەکات ، ئەم جۆرە کاتێك دەخورێت کە سپی بێت بەڵام دەبێت دوای ئەوە بکوڵێنرێت .

٣ – توخمی ئارمیلاریا Armillaria

ئارمیلاریا میلیا Armillaria mellea جۆرێکە لەسەر ئەم توخمە کە بە کۆمەڵ لە دەوری دارودرەخت دەروێت و هەروەها لەسەر قەدو لق و پۆپی درەختە مردووەکانیشدا دەروێت . ئەمانەش مشە خۆرن لەسەرە ڕەگی ئەو درەختانەی کە بە یەك دەگەن بەهۆی جۆرە ڕەگێك کەپێی دەوترێت شێوە – ڕەگ (rhizomorphs) . ئەم جۆرە کارگانە ڕەنگیان هەنگوینین لەبەرئەوە پێشیان دەگوترێت کارگە هەنگوینە (Honey – mushroom) . هەروەها تامیان خۆشەو دەخورێن . بڕوانە شێوەی ٣) .

٤ – توخمی ئەمانیتا Amanita :

ئەم توخمەش جۆری زۆرەو ، زور بەیشیان ژەهراوین و ناخورێن و هەندێکی تریان دەخورێن دوای کوڵاندن ، کە هاتینە سەر باسی کارگی ژەهراوی بە درێژی باسی دەکەین .

لە ناوچەی خۆماندا چەندەها جۆر کارگ هەن کە هەندێکیان دەخورێن و هەندێکی یان ژەهراوین و ناخورێن وەتائێستا لێکۆڵینەوەو دیراسەیەك نی یە دەربارەی ، کە زانستیانە لیان بکۆڵێتەوەو جۆرەکانی جودا بکرێتەوەو پولێن (تصنیف) بکرێت . تەنها ئەوەندە نەبێت ناوی ناوخۆیی (محلي) هەیە بۆ نموونە دەڵێن کارگە سورەو کارگە چنارەو کارگە لۆو کارگە گوێزو هەروەها کارگە بودرەو کارگە سەگانە . . هتد ، بەڵام ئەم جۆرە ناوو جیا کردنەوانە زانستی نین . وە بەشێوەکی ڕێك و پێك نازانرێت کام جۆر دەخورێت و کامی ناخورێت و ژەهراوی یە . بەهیوای ئەوەی کە لە داهاتودا دەرفەتێکی وابرەخسێ و زروفێکی وا گونجاو هەبێت کە کەسێك هەڵسێت بە

کۆکردنەوەی ئەو کارگ‌و قارچکانەی کە لە ناوچەی کوردەواری خۆماندا بەشێوەی سروشتی ڕواون‌و دەستەیەکی زانیاری ناوخۆ وەیا دەرەوە پۆلێنیان بکاو نامیلکەیەکی وێنەداریان بۆ دابنێت بەشێوەکی ڕێك‌وپێك .

### کارگی چاندن‌و چۆنێتی چاندنی

مەبەست لەکارگی چاندن (کارگی کشت‌وکاڵی Cultivated Mushroom) ئەو کارگەیە کە بەشێوەیەکی زۆر لە کێڵگەی تایبەتیدا زۆربکرێت‌و بەرهەم بهێنرێت وەکو هەر بەرو بومێکی کشت‌وکاڵی‌تر. ناوی زانیاری ئەم کارگەش (Agaricus bisporus)ە ، (بڕوانە شێوەی ٣ ج) .

لەبەر ئەوەی کە زۆر کەس حەزی لە کارگەو بە دوایدا دەگەڕێت لە دارستان‌و جەنگەڵ‌و وەبۆ ئەوەی ئەو کەسانە دوور بخرێنەوە لەو کارگانەی کە ژەهراوین زۆر لە وڵاتانی جیهان هەستاون بەزۆر کردنی کارگ‌و دروست‌کردنی کێڵگەی تایبەتی بۆی . فەرەنسیەکان یەکەم کەس‌بوون کە هەستان بە ڕواندنی‌و چاندنی ئەم کارگانە دوای ئەوان وڵاتە ئەوروپی‌یەکانی‌ترو ئەمریکاو چەند وڵاتێکی‌تر . چین‌و ژاپۆن بە گەورەترین وڵاتانی جیهان دەژمێررێن بۆ بەکارهێنان‌و خواردنی . بۆ چاندن‌و بەرهەم هێنانی کارگ جۆرە ڕاخەرێکی تایبەتی هەیە کە پێی‌ی دەوترێت (Mushroon bed)وە ئەم جۆرە چاندەش لە ژێر زروفێکی تایبەتیدایە (کەبریتی‌یە لە پلەی گەرمی‌و شێ) . دوای ئەوەی کە سپۆری کارگەکە لە میدیای (PDA) زەرع دەکرێت ، دەزووە کەڕوی سپی باریك دروست دەبێت (مایسلیۆم Mycelium) ، دوای ئەوە ئەم هایفانە (دەزووەکە ڕوانە) دەروێنررێت لە ناوەندێکی خواردەمەنی تایبەتی (وسط غذائی) کە پاکژ کراوە (معقم) ، ئەم ناوەندەش بریتی‌یە لە تۆوی هەندێك دانەوێڵەو (وەکو گەنم‌و جۆ) وەیا لاسکی توتن یان پاشەڕۆی وولاخ ، پاش ماوەیەك ئەم مایسلیۆمانە بە تەواوی نەشنوما دەکات ، ئەمەش پێی‌ی دەگوترێت سپونی کارگ (Mushroom Spoon) کە وڵاتە ئەوروپی‌یەکان‌و هەندێ وڵاتانی‌تر بەشێوەیەکەی بازرگانی بەرهەمی دێنن‌و دەیفرۆشن ، وە ئەمەش بەکاردەهێنرێت وەك تۆو بۆ چاندن ، ئینجا ئەم سپونانە لە ناو ئەو ڕاخەرانەدا دەروێنرێت ، لێرەدا دوو جۆر ڕاخەر باس دەکەین :

**جۆری یەکەم**

| ماددەکان | بڕەکەی |
|---|---|
| کا (گەنم) | ١٠٠٠ کیلۆگرام |
| پەینی کیمیاوی (سوپرفۆسفات) | ١٠ کیلۆگرام |
| پەینی سۆلفاتی ئەمۆنیوم | ٢٠ کیلۆگرام |
| نیاگۆن | ٤٠٠سم³ |
| مۆلاس | ٢٥ کیلۆگرام |
| پاشەڕۆی وولاخ | ١٢٠ = |
| بۆرەك | ١٠٠ = |

**جۆری دووەم**

| ماددەکان | بڕەکەی |
|---|---|
| کا (گەنم) | ٤٥٠ کیلۆگرام |
| پەینی سوپر فۆسفات | ١١ کیلۆگرام |
| پەینی یۆریا | ٣ر٦٠٠ کیلۆگرام |
| پەینی سۆلفاتی پۆتاسیۆم | ٥ر٤ کیلۆگرام |
| کەپەك | ٢٢ر٥ = |



ئەم ماددانەی لەسەرەوە باسمان کرد بۆ دروستکردنی ڕاخەری کارگ دەتوانرێت بە پێی پێویست وەبەگوێرەی ئەو ڕادانە بگۆڕرێت . دوای ئەوەی کە ڕاخەرەکان ئامادەکران لە ناو سندوقی تایبەتی دا (کە جوان پاکژکراوە بە ماددەی فۆرمالین بەرادەی ٢٪ یاخود بەبەکارهێنانی هەڵمی ئاو) ، هەروەها دەبێت ئەو کلۆ گەورەکانی تێکەڵەی ڕاخەرەکان ورد بکرێن لەناو سندوقەکانداو ڕێك بخرێتو تەسویە بکرێت بە قولیٚ ١٥سم ، ئینجا سپونە ئامادەکراوەکە دەروێنرێت تیایدا بەیەکیٚ لەم دوو ڕێگایانەی خوارەوە :-

١ - بەپەنجە چاڵ دروست دەکرێت لە ناو ڕاخەرەکاندا بە قولاٚیی ٥ سموە نێوان چاڵێكو چاڵێکی‌تر لە ١٥-٢٠ سم دوربێت لە هەموو لایەکەوە . ئینجا پارچە سپونی چوارگۆشە (٤سم٢) دەخرێتە ناو ئەو چاڵانەوە دوای ئەوە پڕ دەکرێتەوە .

٢ - سپونەکە بلاٚو دەکرێتەوە بەناو ڕاخەرەکەدا (کە ١٥سم ئەستووریی‌یەتی) دوای ئەوە چینێکی‌تر ڕاخەر دەدرێت بەسەر ئەو سپونەدا ئینجا لەگەڵیدا (بەقولاٚیی ٥سم) تێکەڵ دەکرێتو ڕێك‌وپێك دەکرێت .

دوای ئەوە دەبێت ئاو بدرێتو وەلە هەردوو ڕێگەکەدا دەبێت پاش دەرچونی مایسیلیۆمەکەو نەشنوما کردنی چینێکی تەنك گڵ یا قوم بدرێت بەسەریداو داپۆشرێت بە ئەستوری ٥ر٢سم وەپێویستە ئەو گڵە پاك بێتو چەو بەردی تێدا نەبێتو پاشماوە رووەكو تۆوی گژو گیای تێدا نەبێتو میکروباتی خۆڵی تێدا نەبێت ، هەروەها وردو جوان بێت وەترشی خۆڵەکە



(PH)ی نابێت لە (٨) پتربێت .

**نەخۆشیەکانی کارگ :**

وەك هەموو رووەکێك توشی نەخۆشی جۆراو جۆر دەبێت هەروەها کارگیش توشی دەبێت هەندێك لەو نەخۆشیانە چارکردنیان ئاسان نی‌یە . لەو نەخۆشیانەش وەك نەخۆشی ڤایرۆسی‌و بەکتریی‌و کەڕوویی . وەگرنگترین ئەو نەخۆشیانە :-

١ - Micogone Pericosa : نەخۆشی‌یەکی کەڕوویی‌یە کە دەبێتە هۆی دروست بوونی پەڵەی بۆر بەسەر کلاٚو و قەدی کارگەوە هەروەها تێك شکاندنی شێوەی کارگەکەو ئینجا نەمانو مردنی .

٢ - نەخۆشی تێك شکاندن (PlasfisMold)

ئەم نەخۆشی‌یە دەبێتە هۆی کەمی‌ی نەشنوماکردنی مایسلیۆمی کارگەکەو لاوازیی‌و تێك‌شکاندنی ، قەلاچۆ کردنی ئەم نەخۆشی‌یە هەروا ئاسان نی‌یە دەبێت پێش‌ئەوەی نەخۆشی‌یەکە بەشێوەی پەتا (وبام (epidemic) بلاٚو ببێتەوە کێڵگەکان بە ماددەی (دایثین Z 78) بە ڕادەی (١) گرام لیتر ئاو بڕژێنرێت هەر ١٤ ڕۆژ جارێك دوای ئەوەی کە نەخۆشی‌یەکە دەرکەوت .

هەندێ نەخۆشی فیسیۆلۆجی‌تر هەیە وەك :

أ - Rose Comb : لە نیشانەکانی ئەم نەخۆشی‌یە دەرکەوتنی دیاردەی شێواندن (تشوهات) لە ڕیشووەکاندا هەروەها کلاٚوی کارگ وەك پۆپنەی کەڵەشێری لیٚ‌دێت ، هۆکەیشی ئەوەیە کە هەندێك جار دەرمانی مێش‌ومەگەز بەکاردەهێنرێت پتر لە دوو سیٚ‌جار یاخود بۆنی نەوتی باش‌نەسوتاو کە بۆ سوتەمەنی بەکار هێنرا لەو کێڵگانەدا .

ب - کرانەوەی پەردەو ڕیشووەکان (Open – Veil) : پەردەو ڕیشووەکان هەندێك‌جار باش دروست نابنو نەشنوما ناکەن ، ئەم دیاردەیەش زۆر جار بەهۆی بەرز بوونەوەی پلەی گەرمی‌و کەمی‌ی هەوا گۆڕکی‌یە .

ج - درێژبوونەوەی قەد : ئەمەش جارجار بەشێوەیەکی

-سروشتی روو دەدات هۆکەیشی کەمی ی هەوا گۆرکی یە لە کێنگەکاندا ، بەمپی یە سەری کارگەکان بچوك دەبن و لاسکەکانی (قەدەکانی) درێژ دەبن .

«بەشی دووەم»

**کارگی ژەهراوی :**

پتر لە ٣هەزار ساڵ لەمەوبەر کاتێك کە پاشای ئەغریقی میکس (Mykes)بە سواری ئەسپەکەیەوە بوو دەرۆیشت گەیشتە شوێنێك لەوێدا شەپقەکەی لی کەوتە خوارەوەو وفەرمانی دا بە داروەستەکەی کە لەو شوێنەی کە شەپقەکەی ی کەوتە خوارەوە شارێك دروست بکرێت ، هەزاران کرێکار دەستیانکرد بەئیش ئەوەندەیان ئیش کرد تاشەکەت بوون و زۆر تینویانبوو گەران تاچاویان کەوت بەچەند شتێکی سپی تەر لەسەر زەوی ، ئەوانیش هەڵیانکەندو خواردیان ، پاش ماوەیەك هەندێکیان لەهۆش خۆیان چون و وایان دەزانی کە هۆکەی هیلاك بوون و ماندوێتی بەلام نەیان دەزانی کە هەندێك لەو کارگانە ژەهراوین . لەوکاتەوە مرۆڤ کارگی ناسیوەو بەکاری هێناوە بۆخواردن . بەزمانی ئینگلیزی بەو کـارگانـەی کـە دەخـورێن پـێیـان دەڵێن (Mushrooms)وەئەوانەی کە ژەهراوین و ناخورێن Toad) stools) ، بەلام هەندێ جار Edible fungi بۆ کارگی خواردن و Poisonous Fungi بۆ کارگی ژەهراوی بەکاردەهێنرێت . لەبەر ئالۆزی و گرانی جیاکردنەوەی جۆرە ژەهراوییەکان و جۆرەکانی تر سالانە سەدان کەس دەمرن بەهۆی خواردنی ئەم جۆرە کارگانە لە دێهاتوو شارەکاندا ، بەلام لەم سالانەی دوایدا زۆر لە ولاتانی جیهان هەستان بە چاندن و زۆرکردنی ئەو کارگانەی کە دەخورێن بە مەبەستی ئەوەی کە خەڵك دوربخەنەوە لە جۆرە ژەهراوییەکان سەرەرای ئەوەی کە بازرگانی یەکی بەسوودە .

**جۆرە ژەهراوییەکانی کارگ :**

چەند جۆری کارگی ژەهراوی و کوژەر هەن بۆ مرۆڤ کە بەئاسانی جیا ناکرێتەوە لە جۆرەکانی کە . هەرچەندە هەندێك دەڵێن گوایە دەتوانرێت جودا بکرێنەوە بە هۆی چەند شتێکەوە بۆ نموونە جۆری کلاو (cap) هەروەها شێوەی دەرەوەی کارگ بەلام ئەمە وانی یە چونکە – هەروەك پسپۆرەکان دەڵێن ، زۆرجار دەبینیت دوو جۆر کارگ هەن هەردوکیان شێوەی مۆرفۆلۆجیان چون یەکن (یان نزیکن لەیەکەوە) بەلام یەکێکیان ژەهراوییەو ئەوتریان ژەهراوی نی یە ، لەبەر ئەوە پێویستی بە شارەزایی و لی زانین و کارەمایی هەیە .

بۆ ئاسانکردن و ناسینەوەی کارگی ژەهراوی لەوانی دی ، زۆر لە ولاتەکان و دەزگا زانیارییەکان فەرهەنگ و نامیلکەی تایبەتیان داناوە کە بریتی یە لەسەدان وێنەو شێوەی رەنگاو رەنگی جۆرەکانی کارگ ، لەگەڵ ئەوەشدا زۆر کەس لەوانەیە بە هەڵەدابچێت و کارگێك بخوات و لەوانەیە ئەو جارە خواردنەش کوژەربێت .

گرنگترین ئەو جۆرانەی لەسەر توخمی کارگی Amanita SPP.کە سپۆرەکانی سپین و ئەڵقەو قۆلفەی هەیە (بروانە شێوەی ١ب) کە زۆر جار ئەم قۆلفەیە وون دەبێت لە سەرەتای دروست بوونی کارگەکەدا ، هەروەها هەندێجار قۆلفەکەش لە ژێر زەوییەوە دەمێنێتەوەو نابینرێت . لێرەدا بە کورتی باسی هەندێ جۆرەکانی ئەم توخمە دەکەین :–

أ – **Amanita phalloides** : **کارگی کوژەر**

ترسناکترین جۆری کارگی ژەهراوییە ، کە لە ٩٠٪ی مردن (بەهۆی کارگی ژەهراوییەوە) بە هۆی ئەم جۆرەوەیە ئەم کارگە لەو شوێنانەدا هەیە کە داربەرووداری تری لی یە .

ب – **Amanita virosa** : **فریشتەی تێکدەر**

کارگێکی ژەهراوی کوژەرە ، بەلام رادەیشی کەمە لەسروشتدا . لەناو خۆلی قوم و لماویدا دەردەکەوێت لەسەر دارو تەختەی تەروشێدار لە پایزاندا . ئەم جۆرەش دەناسرێتەوە بەوەی کە قەدەکەی بژو زبرە ، بۆنێکی کەسکونی ناخۆشی

لیٚ دیٚت که خەو له مرۆڤ دەخات .

ج – Amanita verna :

هەروەها ئەمیش کارگێکی کوژەرە ، لەو شوێنانەدا دەردەچێت که گلەکەی جۆری کلسی یە (گەچی یە بەواتای $CaCo_3$ی زۆر تێدابێت) . دەروێت لە ژێر داری زاندا ، ئەم جۆرە لەگەڵ کارگی خواردندا بەگران جودا دەکرێتەوە تەنها بەوە نەبێت ریشووەکان بەسپێتی دەمێنێتەوە هەروەها بنی قەدەکەی کوپی (ڤولڤەی) هەیە .

د – Amanita muscaria : کارگە مێشانە

هەندێ جاریش پی ی دەوترێت فریشتەی کوژەر ، باشترین کارگەکە بەئاسانی بناسرێتەوە . ئەم کارگە بە کۆمەڵ لەژێر داری بتولا (birch)و داری سنەوبەردا دەردەچێت ، هەروەها ژەهراوی یە بەلاّم کوژەرنی یە ، چەند سەدەیەك لەمەو پێش بەکاردەهێنرا (شیرەکەی یاخود گوشراوەکەی) بۆ لەناو بردنی مێش و مەگەز .

هـ – Amanita pantherina کارگە پڵنگانە

کارگێکی ژەهراوی یە بەلاّم کەسیش ناکوژێت . له هاوین و پایزاندا دەردەکەوێت لەو شوێنانەی که دزەختی سنەوبەرو ئەو درەختانەی کە گەلاّکانیان دەورێت له پایزاندا . بەوە دەناسرێتەوە که له ۲ تا ۳ ئەڵقەی هەیە لەسەرو بنکەی ڤۆڵڤەوە ، هەروەها بەو پولەکەسپی یە بی گەردانەی کەوا بەسەر کلاّوەکەیەوە هەیە .

و – Amanita caesarea کارگی ئیمپراتۆری

کارکێکی هێجگار جوان و قەشەنگەو له ولاّتەکانی سەر دەریای سپی ناوەراستدا هەیە ، زۆر بەنرخەو لە دورگەکانی بەریتانیادا نی یە . لەسەردارو تەختەی وشك دەروێت بە تایبەتی لەسەردار بەروو وە داری کەستانە (chest nut)لەو شوێنانەدا که گلەکەی سوك و لماویە .

لای رۆمانیە کۆنەکان بە بۆلیتەس ناوبراوە boletus : کارگێکە نیوەی دەخورێت و نیوەکەی تری ناخورێت و ژەهراوی یە .

ز – Amanita rubesens : کارگە سورانە

ئەم کارگەش زۆر بلاّوە لەو شوێنانەی که داری زۆرەو دارستانە ، له هاوین و بەرەودوا دەردەچێت . ئەم کارگە دەخورێت پاش کولاّندنی و بە کاڵی ناخورێت ، بەلاّم باشتروایە هەرچی جۆرەکانی ئەمانیتا (Amainta)هەیە بەکار نەهێنرێ بۆ خواردن . بەتایبەتی بۆ یەکێك که شارەزایی نەبێت ، (شێوەی ٤ ئەو جۆرانەی که باسمان کرد روون دەکاتەوە) .

**جۆرەکانی ژەهر :**

زوربەی ژەهری کارگی ژەهراوی بەشێوەی مەوادی چەندەجارە پیپتایدی ژەهراوین (Polypep tides)وە چەندەها ناونیشیان هەیە وەك لەم خشتەیەی خوارەوە بۆمان دەردەکەوێت :

| ناوی ژەهرەکە | ژەمی کوژەر Minimal lethal Dose /Kg body |
|---|---|
| ١ – Phalloudin | ۲ر– |
| ۲ – Phalloin | ١ر٥ |
| ۳ – Phallicidin | ۲ر٥ |
| ٤ – Phallicin | ١٥ر– |
| ٥ – Phallin B | ١٠ر– |
| ٦ – A – Amanitin | ٠ر٣٥ |
| ۷ – B – Amanitin | ٠ر١٤ |
| ٨ – C – Amanitin | ٠ر۲ |
| ٩ – D – Amanitin | .١ر– |
| ١٠ – Amanin | ٠ر۲ |

ئەو ژەهرانەی که لەسەرەوە دەستنیشانکرا نەك تەنها له رووی رادەی ژەهرەوە جیاوازن بەڵکو له رووی پێکهاتووی کیمیاویەکەیشەوە جیاوازن (بروانە شێوەی ٥) .

راپۆرتە زانیاری یەکان وای رادەگەین که ژەمی کوژەر (الجرعة القاتلة) بۆ مرۆڤ (١ر٠) ملیگرامە بۆ هەر کیلۆگرامێك

لەلەشی ئەو مرۆڤە ، کەواتە ئەگەر مرۆڤێك (٥٠) گرام کارگێکی ژەهراوی بخوات دەبێتە هۆی مردنی چونکە ئەو کەمیەتە نزیکەی (٧) ملیگرام ژەهری (Amanithin)ی تێدایە .

نیشانەکانی ژەهراوی بوون دەست پێ‌دەکات پاش چەند سەعاتێك دوای خواردن ، یەکەم جار بەرشانەوەو سك‌چوونو سەری‌ئەو تووش بووە گێژ دەخواتو دوای ئەوە له هۆش خۆی دەچێت ترسناکی‌کاتێك دەست پێ‌دەکات‌کە ژەهرەکە بگاتە جگەرو گورچیلەکان ، ئینجا ژەهرەکە دەست دەکات بەتێك‌دانی خانەو شانەکانی لەشو لەئیشیان دەخات . دوای ئەوە مردن یەخە بە تووش بووەکە دەگرێت .

**کارگی لە هۆش خۆچونو شیزۆفرینیا :**

ئەم کارگە جۆرێکە لە کارگی ژەهراوی کە پێی دەوترێت کارگە مێشانە (عرهون الذباب Fly Agaric) – وەك لەمەو پێش باسمان کرد ئەم کارگە پێشی دەگوترا فریشتەی کوژەر (Death Angel) . ئەم جۆرە چەندەها رەنگی دڵفرێنو جوانی هەیە وەکو سورو پرتەقاڵیو زەردکە پەڵەی سپیان تێدایە . روسەکان لە سیبریادا لە کاتی ئاهەنگەکانیاندا بەکاری دەهێننو دەیخۆن بە مقدارێکی کەم بۆ ئەوەی لە هۆش خۆیان بچنو بیکەن بەهەلوەسەکردن . هەندێ هۆزو تیرەی مەکسیکی هەن کە ئەم جۆرە کارگە دەخۆن لەکاتی ئاهەنگەکانیاندا بەجۆرە نەریتێکی تایبەتی وەکو حاڵەتێکی دەروێشیان لێ‌دێتو جۆرە هەستێکی ئاینی خۆیان‌پێ دەردەبرن .

زانا بایۆلۆجیەکانی فەرەنسا زیارەتی ئەم هۆزانەیان کردوەو بەشداریان کردونو ئەوەی کە بیانبینیایە دەیانوسیوەو چەندەها لێکۆڵینەوەیان نوسیوە دەربارەی ئەم کارگە کە پێی دەڵێن کارگی هەلوەسە (فطریات الهلوسة hallucinogenic) . خواردنی ئەم کارگە بە برەیەکی (کەمیەتی) زۆر دەبێتە هۆی سەرئێشەو سەرسورانو تەشنجی ماسولکەکانو دوای ئەوە مردن . بەڵام ئەگەر زوو ئەو کەسەی کە خواردوویەتی . ئەترۆپینی (Atropin) بدرێتی ئەوە چاك دەبێتەوە زانایان



| | $R_1$ | $R_2$ | $R_3$ | $R_4$ | $R_5$ |
|---|---|---|---|---|---|
| Phallaidin | OH | H | $CH_3$ | $CH_3$ | OH |
| Phalloin | H | H | $CH_3$ | $CH_3$ | OH |
| Phallicin | OH | OH | $CH_3$ | $CH_3$ | OH |
| Phallicidin | OH | H | $CH(CH_3)_3$ | $CO_2H$ | OH |
| Phallin B (tentatively) | H | H | $CH_2C_6H_5$ | $CH_3$ | H |



| | $R_1$ | $R_2$ | $R_3$ | $R_4$ |
|---|---|---|---|---|
| α-amanitin | OH | OH | $NH_2$ | OH |
| β-amanitin | OH | OH | OH | OH |
| γ-amanitin | OH | H | $NH_2$ | OH |
| ε-amanitin | OH | H | OH | OH |
| Amanin | OH | OH | OH | H |
| Amanullin | H | H | $NH_2$ | OH |

شێوەی (٥) پێکهاتوە کیمیاویەکانی ژەهری کارگ

ئەوەیشیان بۆ دەرکەوتووە لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەو دیراسەکردن کە ژەهری ئەم کارگانە کار دەکاتە سەر کۆ ئەندامی دەمار (الجهاز العصبي)وە هەندێکی تریان دەبێتە هۆی نەخۆشی دەرونی وەك شیزۆفرینیاوە گرنگترین ئەم ماددە ژەهراویانە ماددەی مۆسکارینە (Muscarine) .

## فەرهەنگۆك

**بەزیدیۆسپۆر** = basidiospore (سپوری بازیدی) : وشەیەکی گریکی‌یە کە لە basidium کە بە واتای بنکەیەکی بچوك + sporos بە واتای تۆو : سپۆرێك لەسەر بازیدیۆم کە دروست‌بووە لە ئەنجامی یەکگرتنی دوو ناوك لەگەڵ کرداری کەمە دابەشبون .

**تایپ** = Type ، طراز

**توخم** = رەگەز (الجنس ، genus)

**جۆر** = نوع ، Species

**زایگۆت** = هێلکەی پیتێنراو AZygote کەلە Zygosی گریکی‌یەوە (Greek) هاتووە کە بەمانای جووت‌بوون دێت : خایەکی جووت ناوك کە پێك دێت لە ئەنجامی یەکگرتنی دوو خانەی تاك کۆمەڵە کرۆمۆسۆم haploid

**سەودا** = الحصاف Pellagra : نەخۆشیەکی پێستە لە کەمی ی ڤیتامین (B)یەوە پەیدا دەبێت بێ‌هێز ی دەمارو هەرس کردنی لەگەڵدایە .

**کەمەدابەشبون** = الانقسام الاختزالي (meiosis) : بریتی‌یە لە دابەشبونی کرۆمۆسۆمی خانەی جووت تاوك (diploid) بۆ دوو بەش

**گەمیت** = Gamete (Gametesی گریکەوە هاتووە کە بەواتای husband : خانەیەکی جنسی‌یە کە لەکاتی رەگەزە زۆربوندا (التكاثر الجنسي) یەکدەگرن .

**مایسلیۆم** = mycilium : بریتی‌یە لە بارستە دەزووە کەرو کەلەشی کەرو دروست دەکات .

**مۆلاس** = تلْپەی چەوەندەری شەکر پاش ئەوەی کە ئاوەکەی دەگوشرێت لەکارگەدا بۆشەکر دەرهێنان .

**میدیای PDA** = ناوەندێکی خواردەمەنیە (وسط غذائي) کە دروست دەکرێت لە پەتاتەو دیکستڕۆز (کەشەکرە)وە ئا گار بەرادەی ٢٠٠ : ٢٠ : ٢٠ گرام ، بەکاردەهێنرێ بۆ رواندنی (زرع) میکرۆبات (وەك کەرو) لە لابوردا .

**نیماگۆن** = دەرمانێکی کشت‌وکاڵی‌یە بەکار دەهێنرێت بۆ پاکژ کردنەوەی گڵ‌و خۆڵ‌و پەینی ئاژەڵ لە چەندەها زیندەوەری بچوك وەك نیماتۆد nematode .

### سەرچاوەکان


١ – د . ابراهيم عزيز السهيلى وأخرون
الفطريات – دار الكتب للطباعة والنشر / جامعة الموصل
٢ – د . رشيد محجوب المصلح
الفطر غذاء لذيذ لكن بعضه قاتل – مجلة الصناعات الغذائية – اصدار الاتحاد العربي للصناعات الغذائية العدد ١ ، ٢ السنة الثالة .
٣ – د . صبري القباني
الغذاء لا الدواء – الطبعة الحادية عشر ١٩٨٢ دار العلم للملايين – بيروت .
٤ – عبدالوهاب حمدى قاسم
انتاج الفطر في العراق – ١٩٧٦ – نشرة ارشادية رقم ٢٥٦ – مديرية البستنه العامة / وزارة الزراعة والاصلاح الزراعي
٥ – كمال جلال غريب
القاموس العلمي – الجزء الثاني – الطبعة الاولى ١٩٧٩ مطبوعات المجمع العلمى الكردي – بغداد
٦ – د . محمد سليم صالح واخرون (المترجمون)
علم الحياة اليوم – تأليف ديفيد كيرك – الجزء الاول ١٩٨١ – دار الكتب للطباعة والنشر / جامعة الموصل

7 – Alexopolous , C. J.
Introductory My cology – John Wiley and Sons, Inc., New York, London.
8 – Wilkinson, J. (1979)
Mushrooms and Toad stools – Domino Books Ltd . Great Britain



7 – Alexopolous , C. J.
Introductory My cology – John Wilcy and Sons, Inc., New York, London.
8 – Wilkinson, J. (1979)
Mushrooms and Toad stools – Domino
Books Ltd . Great Britain

# قژهەڵوەرین

## هۆیەکانی - چارەسەرکردنی خۆپاراستن

دکتۆر عادل حسین

قژهەڵوەرین بریتی‌یە لە وەرینی مووەکانی سەر بەشێوەیەکی زیاتر لە وەرینی ئاسایی کە بریتی‌یە لەوەرینی ٤٠–٨٠ موو لە ڕۆژێكدا ، ئەمەش زیاتر باوە لە نێو کوڕەکان‌داو هەروەها هەندێ جار لە کچیش‌دا بەدی ئەکرێ .

هۆیەکانی قژهەڵوەرین :

١ – کاری بۆماوە Heriditary factor : ئەمە بە گرنگترین هۆ دادەنرێت کە لە باوکەوە بۆ کوڕ ئەمێنێتەوە ، واتە کە باوك قژهەڵوەرینی هەبوو ئەوا بێگومان کوڕیشی تووشی قژهەڵوەرین ئەبێ بەزۆری لەپاش تەمەنی پێ‌گەیشتن (سن البلوغ) . هۆی ئەمەش ئەگەڕێتەوە بۆ گۆڕان لە هۆرمۆنەکانی لەش‌دا ، بەتایبەتی زیادبوونی هۆرمۆنی پیاو Testosterone لە خوێن لە پاش ئەم تەمەنەدا . بەم جۆرە قژهەڵوەرینەش ئەووترێ قژهەڵوەرینی ئاسایی Normal Boldness .

٢ – نەخۆشی‌یەکانی پێست : چەند نەخۆشی‌یەکی پێست هەن کە ئەبنە هۆی قژهەڵوەرین لەو شوێنەدا وەکو هەوکردنی پێستی ڕۆنی Seborrhoeic dermatitisوە هەوکردنەکانی تری‌پێست .

٣ – تای بەردەوام : بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی لەش بەشێوەیەکی بەردەوام ئەبێتە هۆی قژهەڵوەرین ، وەئەمەش

بەدی ئەکرێ لە هەندێ نەخۆشی‌یە دەرەمەکان Infectiousوەکو گرانەتا Typhoid feverوەهەندێك نەخۆشی ترکە بەردەوام تا پەیدائەکەن chronic feverish diseases .

٤ – نەخۆشی‌یەکانی دەروونی : هەندێك نەخۆشی دەروونی وەکو پەستی بەردەوام ، خەمۆك Depressionئەبنە هۆی قژهەڵوەرین .

٥ – نەخۆشی‌یەکانی‌تر : وەکو کەم‌خوێنی Anaemiaو کەم‌خۆراکی Malnutritionوە بەکارهێنانی هەندێ دەرمان وەکو میتۆترکسێت Methotrexateکە بۆ سەرەتان بەکارئەهێنرێ ، وەبەکارهێنانی هۆرمۆنی پیاو بە زۆری ، سەرەتانی خوێن leukaemia چارەسەرکردنی قژهەڵوەرین :

قژهەڵوەرین چارەسەردەکرێ بە دۆزینەوەو چارەسەرکردنی هۆیەکەی لەلایەن پزیشکی تایبەتی پێست ، بەلآم چارەسەرکردنی قژهەڵوەرینی زگماکی (وراثی) ئاسان نی‌یە وە ئێستا تەنها بە نەشتەرگەری میکرۆسکوپی Microscopic Surgeryو گواستنەوەی پێست لەو شوێنانەی توشی قژهەڵوەرین نابن وەکو پێستی سەرگوێ وە پشتی سەر چارەسەرئەکرێ وەئەمەش لە وولآتە پێشکەوتووەکان ئەکرێ وە





بەنرخێکی گران .

نوێترین دەرمان : لە تۆکیو پێش چەند ساڵێك زانستەکان دەرمانێکیان دۆزیەوە بەناوی مینۆکسیدیل Menoxydyl کە لە شێوەی کرێم‌دایە وە ئێستا لەئەمریکادا بەکارئەهێنرێ بۆ قژهەڵوەرین کە دەرمانێکی چالآکە وە وابەدی ئەکرێ کە ئەو دەرمانە لە ئایندەی نزیك بگاتە بازارو چارەی زۆر لەو نەخۆشانە بکات .

خۆ پاراستن لە قژهەڵوەرین : خۆ پاراستن لە قژهەڵوەرین کارێکی ئاسانەو بریتی‌یە لە چاودێری کردنی چەند شتێك لە مانەش خواردنی رێك‌و پێك کە پرۆتینی پێویستی تیابێ وەکو گۆشت ، ماسی ، شیر ، هێلکە ، جگەر ، پەنیر وەسەوزە بەهەموو جۆرەکانی‌وە میوەش زۆر گرنگە چونکە بەسەرچاوەیەکی گرنگی ڤیتامینەکان دائەنرێ کە پێویستن بۆ گەشەو پاراستنی‌قژ. شوشتن‌و پاکی قژیش زور گرنگە بۆ پاراستنی لە نەخۆشی ، وە لە هەموویان گرنگتر ئەوەیە کە نابێ نەخۆش لەخۆیەوەو بەبێ ئاگاداری پزیشك هیچ دەرمانێك بەکاربێنێ بەڵکو وا راستە کە نەخۆش هەر کە تووشی قژهەڵوەرین بوو ئەوا بەزووترین کات بروا بۆلای پزیشك بۆ چارەسەرکردنی .

# زیبکه

د . عبد الكريم محمد علي

(عازەبە) ACNE VULGARIS

## پێشەکی : Introduction

زیبکه یەکێکه له نەخۆشیی‌یه هەره بلاوەکانی پێست ، که ـەکانی گەنجیی‌و لاویدا بەتایبەتی له بالّق‌بووندا لەسەر رووی دەم‌وچاوا دەرئەکەوێت ، ئەم نەخۆشیی‌یه لەهەندێ شوێن پێی ئەوترێت قنچکه یا قنچکه عازەبە یانیش هەر ئەڵێن عازەبە ، بەلاّم بەزۆری ووشەی زیبکه Acne لەزۆربەی کوردستانا بەکاردەهێنرێت [١] .

زیبکه بەگشتی لەو شوێنه چەورراویانەی پێستدا دەردەچێ واته ئەو جێگایانەی که چەوری رژێنی Sebaceous glands زۆر لێ‌یه ئەمیش بەهۆی زۆربوونی چالاکی یانیش تێك‌چوونی رژاندنی مادەی چەوری لەچەوری رژێنەکانی پێست ، لەهەندێ حاڵەتدا ئەم زیبکانه نامێنن‌و لەناودەچن بێ‌ئەوەی ئەو کەسه هیچ جوره داودەرمانێك بەکاربهێنێت ، یانیش ئەگەر کەڵکی نەچەن دەرمانێکی ئاسایی سوك‌و ئاسان وەرگرتبێت له چارەسەرکردنا ، بۆماوەی چەن مانگێك تاکو ساڵێك .

بەهۆی گۆرانو زیاد چالاکی چەوری رژێنەکانی پێست لەم تەمەنەدا (لەتەمەنی بالّق‌بووندا) . ئەوا لەسەرەتادا ئەم زیبکانه ورد وردو بچوکن . بەلاّم ئەو کەسه بەهۆی زۆر دەست‌کاری‌کردنو گوشینو لابردنی سەرنوکی زیبکەکان بەنینۆکەکانی پەنجەکان . وای لێ‌دەکات که مادده تێکەڵەکانی ناو ئەم زیبکانه بێنه دەرەوەو کۆببنەوه بەسەر رووی پێست ، ئەوسا بەهۆی کارتێکردنی Reaction نێوان ئەم مادده چەوری‌یەو ئۆکسجین لەهەوادا سەرنوکی زیبکەکان رەش هەڵدەگەرێن Black heads .

زیبکەی ئاسایی Acne Vulgaris ئەگەر تەشەنه بکاتو هەوکردنەکەی زیادبکات ئەوا له ئەنجامدا بەیەکێ لەم جۆره زیبکانەدا تێ‌دەپەرێت یانیش پێستی ئەو کەسه بەتەواوی هەودەکاتو پردەبێت له زیبکەو دومەڵی جۆراوجۆر وەك :– زیبکەی ئاسایی ، Acne زیبکەی سەر رەش Comedones ، ورده دومەڵ Pustules . دومەڵ Abcess ، گرێ Papules ، گرێ‌رەقه Nodules . کیسەڵه Cysts . . . هتد .

### چۆنێتی دروست‌بوونی زیبکه :– Pathogenesis .

زیبکه بریتیه لەچەوری رژێنی Sebaceous glands سەر به مووی لەش ، کاتێك که چالاکی ئەم رژێنه زیاد دەکات له رادەی ئاساییو گۆرانی تەواو بەسەرکاری گشت بنەرەتی [٢] مووی لەشدا Hair Follicle دێت لەزیاده دروست‌بوونی ماددەی وشك‌و رەق Keratinization ، ئەم کاره سەرکونای چەوری رژێنەکانی ئەم جێ‌یه دادەخاتو بەربەستی دەکاتو نایەڵێ ئەم مادده چەوری‌یه بێته دەرەوەی لەش ، له ئەنجامدا کۆدەبێتەوه زیبکه دروست دەکات . دروست بوونی زیبکه




وێنەیەکی ساکار لە برینی پێست لەسەر درێژی بۆ پیشاندانی شوێنی چەوری رژێن و بنەرەتی مووەکان .

گۆڕانو ڕوودانێکی ئاڵۆزە ، یەکگرتنو بەشداری کردنی چەن هۆیەك وەك :- هۆرمۆنەکانی لەش Hormones ، زۆربوونی مادده وشكو رەقەکان[٣] Keratin ، چەوری sebum ، هەروەها بەکتریاکان Bacteria ئەمانە درێژە بەنەخۆشی‌یەکە دەدەنو لەوانەیە دەردەکە گرانتر بکەن .

لەکاتی زۆربوونی ڕێژەی هۆرمۆنی ئەندرۆجین Androgen ، لەم تەمەنەدا ، قەبارە Sizeو چالاکی چەوری رژێنو چالاکی بنەڕەتی مووەکان Hair Follicle زیاددەکات بۆیە ئەگەر هاتوو ئەم رووداوو گۆڕانە لەژێر ئامێری وەك زەرەبینی «گەردەبینی) ئەلیکترۆنی[٤] تایبەتدا بینراو بەباشیو تۆمارکرا ئەوا ئەم چالاکیانە دەبینین :-

لە سەرەتادا گۆڕانو کارکردن لە قولایی بنەڕەتی موی لەشەوە Follicles دەست پێ‌دەکات بۆزۆر دروست‌کردنی ماددەی وشكو رەق Keratinization ، ئەمیش دەبێتە هۆی داخستنی Blockage چەوری رژێنەکان کەنزیكو لکاون بەبنەڕەتی موی لەش ، لە ئەنجامی ئەم داخستنە چەوری رژێنەکان پردەبن لە ماددەی چەوری Sebumو بەهۆی تەنینەوەی Infection زیندەوەرە زەرەبینی‌یەکان – Micro Organisms بەتایبەتی بەکتریای چیلکەیی زیبکە کۆراینی بەکتیریەم ئەکنی Corynebacterium acne ئەم زیبکانە دەردەکەونو هەودەکەن ، ئەم جۆرە میکرۆبە دەست‌دەکات بەدەردانو رژاندنی ئەنزیمی Enzyme چەوری‌شکێن لایپێز Lipase بۆئەوەی ماددەی سێ گلسراید (ترای‌گلسراید) Triglycerides کە لەناو مادەی چەوری هەیە تێکبشکێنێت لە ئەنجامی ئەم تێکشکاندنە ماددەی سەربەخۆی ترشە چەوری‌یەکان Free Fatty acids دروست‌دەبێت ، ئەمیش ، واتە ترشە چەوری‌یە سەربەخۆکان دەبێتە هۆی کزانەوەو سوتانەوەی Irretation دیواری بنەرەتی مووەکان ، کۆبوونەوەو مانەوەی چەوریو گەورەبوونەوەو زیاد چالاکی بنەرەتی مووەکان دەبێتە هۆی ئەوەی کە کیسەڵەی پڕ لە چڵك (کێم) Pus دروست‌بێت ، زۆرجار تەقاندنی ئەم زیبکەو دومەڵانە لەگەڵ بڵاوبوونەوەی ماددەی ترشە چەوری بـــــــەناـــــــــــاو ئەتەمەکانی (شانەکانی) Tissues پێستدا ئەوا سەرئەنجام بەهۆی هەوکردنو کارتێکردنەوە Inflammatory reaction شوێنی زیبکەکان هەر دیار ئەمێنێتو پێستی دەموچاو چاڵ چاڵ ئەبێت دوای چاكبوونەوی

**نیشانەکانی زیبکە : Signs and Symptomes**

لەبەر ئەوەی کە زیبکە بتوانرێت باش چارەسەربکرێت ئەتوانین ئەم نەخۆشی‌یە بکەین بەدوو جۆرەوە :-

(١)، - زیبکەی سەر رووی پێست .

(٢) - زیبکەی قولایی پێست .

**زیبکەی سەر ڕووی پێست Superficial acne**

ئەم زیبکانە لەتەمەنی سیانزەو چواردە ساڵی‌دا دەرئەکەوێت کاتێ کە ئەو کەسە دەگاتە وەختی باڵق‌بوون (نیرومێ) ، زیبکەکان یان قنچکەکان سەر هەڵدەدەن لەو پێستەیەی کە چەوری رژێنی لێ‌یە[٥] ، زیبکەکان نوکەکەی سپی رەنگە چونکە نەکراوەیەو دەست‌کاری نەکراوە ، بەلام دوای کرانەوەی سەری زیبکەکانو دەست‌کاری کردنی بە

ـێۆك ئەوا رەش هەڵدەگەرێت Comedones ، قنچكەی ورد
ـێن وەك وردە دومەڵ كەپڕە لە چڵك خۆی نیشاندەداتو لەبەر هەوكردن سەرەكەی سور هەڵدەگەرێت ، هەندێ جار كیسەڵەی پڕ لە چڵك Cycts لەم شوێنەدا دروستدەبێت .

لەم جۆرە زیبكەیەدا (زیبكەی سەر رووی پێست) ، ئەگەر دەستكاری نەكراو وازیی پیێنەكراو بەزۆر نەتەقێنرا ئەوا كە چاكەوەبوو زۆر بەدەگمەن ئەگەر شوێنەكەی دیاربێت ، بەڵام بەپێچەوانەی ئەم كارە ، خوراندنو هەڵكرانو گوشینو نەقاندنی زیبكەكان وەكو خووو عادەتێك بەبێ هۆشیو بێ ئاگایی ئەم دەستكاری كردنە دەبێتە هۆی زامو برینو لەدواییدا شوێنەكەی دیارئەبێتو دەموچاو ناشرین دەكات .

## زیبكەی قوڵایی پێست Deep acne

لەم جۆرە زیبكەیەدا ، هەوكردنی چەوری رژێنەكان زۆرترەو كیسەڵەی پڕ لە چڵك لە قوڵایی پێستدا دەردەچێت ، گرێو دومەڵی گەورەو بچوك یان رەقەگرێ دەبینرێت لەم نەخۆشییەدا ، ئەو قنچكەو دومەڵانەی كە دەتەقێنرین لە ئەنجامدا جێیەكەی دیاردەبێت ، شوێنەكە چاڵ چاڵو كونجر كونجر دەبێت . لەم جۆرە زیبكەیە داودەرمانی وەكو مەڵحەم Ointmentو كرێمەكان Creams ئەوەندە سودبەخش نیە ، بەڵكو بەچارەسەركردنی تایبەتی دەبێ هەوڵی لەتەكا بدرێت وەكو لەدواییدا باسی دەكەین .

بەگشتی زیبكە لەسەر رووی دەموچاو Face دەردەچێت بەتایبەتی رومەتەكان ، چەناگە (چەنە) ژێرچەنە ، نزیك بەگوێچكە (گوێ) ، ژێر پەنا گوێچكە ، ژێرمل ، پشتمل ، سەر رووی سنگ ، سەر پشتو شان ، بەدەگمەن ئەگەر رویدابێت كە دومەڵو قنچكەی گەورەی پڕ لە چڵك لەسەر پشتو سەرشان دەرچێتو چەن زیبكەیەك لەسەر رووی دەموچاو ببینرێت ئەم حاڵەتەش پیێدەوترێ زیبكەی ترۆپیك Tropical acne واتە (أستوائی) هەرچەندە كە هیچ پەیوەندی نیی بە بەو شوێنو وولاتانەی كە ئاوو هەوایان زۆر گەرمە .

## دەستنیشان كردنی زیبكە :- Diagnosis

دەستنیشان كردنی زیبكە ئاسانە ، سود وەرگرتن لە مێژووی نەخۆشیەكە Casehistoryو سەرنجدانو فەحس كردنو نیشانەكان یارمەتی دەری تەواون بۆ ناسینو دەستنیشان كردنی ئەم نەخۆشییە .

## چارەسەركردن : Treatment

دەست لێنەدانو وازی پیێنەكردن بەنوكی پەنجەكانو نینۆكەكانو نەتەقاندنی ئەم زیبكانە زۆر سود بەخشە بۆ ئەنجامو پاشەرۆژی ئەم نەخۆشییە ، رێكو پێككردنی خواردنو خواردنەوەو حەسانەوەو وەرزشكردن هەروەها باری دەرونی Psychiatry ، زۆر بەسودە بۆ نەخۆش ، لە ئافرەتدا ، بەكارهێنانی بۆیەو دەرمانەكانی ئارایشی (میكیاج) Cosmotic materials دەموچاو زیانبەخشە بەتایبەتی ئەو كەسانەی كە پێستی دەمو چاویان زۆر چەورە .

هەر وەك چۆن نیشانەكانی ئەم نەخۆشییەمان بەشكرد بۆ دوو جۆر هەر لەسەر هەمان بناغە بۆ چارەسەركردنیش هەر یەكەیان بەجیا باسدەكەین :-

## چارەسەركردنی زیبكەی سەر رووی پێست :-

١ – نەخۆش دەبێ هەموو رۆژێك چوار پێنج جار دەموچاوی Face بشوات بەهەرچی جۆرە سابونێك Soap بێت[٦] ، دوایی دەبێ دەموچاوی زۆر باش بەخاولێكی تایبەتی پاكو خاوین ووشك بكاتەوە[٧] ، ئەم كارە هەندێ سودی هەیە بۆ نەخۆش چونكە ژمارەی خاڵە رەشەكانی Black heads ئەو جێیە كەمدەكاتەوە بەڵام ئەو زیبكانەی كە هەویانكردوە Inflammed acne دەكزێنێتەوە Irretation .

٢ – دومەڵە گەورەكان كە پڕبوون لە چڵكو سەرەكانیان زەرد بووە دەبێ بتەقێنرێت یەك یان دوو جار لە هەفتەیەكدا ئەمیش بە بەكارهێنانی قولایی تایبەتی Schamberg loop بۆ ئەم مەبەستە ، دەبێ ئەم كارە زۆر بەهێمنیو وەستایانە ئەنجامبدرێت لەلایەن یەكێ لە ئەندامەكانی ئەو خێزانە

Family .

٣ – ئەو قنچکەو وردە دومەڵانەی کە هێشتا نەگەیونو سەرەکانیان زەرد نەبوەو نەتەقیون نابێ دەستکاری بکرێتو هەوڵی گوشینی بدرێت .

٤ – دەستکاری کردنی بەردەوام وەك خووو راهاتن بۆ لابردنی ئەو توێژە سپی‌یەی سەر زیبکەکان بەدرێژایی رۆژگار ، یان خوراندنی زیبکەکانی چەنە بەناو لەپی دەست ئەم کارە ماوەی چارەسەرکردن دوا دەخات بۆ چەن هەفتەیەكو لە ئەنجامدا شوێنی زیبکەکان بەسەرو چاوەوە دەمێنێت .

٥ – خۆ پێشاندانی تیشکی رۆژ Sun light سود بەخشە بۆ زیبکەی سەر روو ، چونکە تۆزێ ئەم زیبکانە ووشك دەکاتەو بەرەو چاكبوون دەروات ، بەلام نەك زۆر وەستان لەبەر تیشکی رۆژ ، چونکە زۆر خۆ نیشاندانی تیشکی رۆژ بەپێچەوانەوە زیاتر زیبکەکان هەودەکەنو دەکزێنەوە بەتایبەتی ئەگەر نەخۆش[٨] دەرمانی لە دەموچاوی دابێت .

٦ – بەکارهێنانی مەڵحەم Ointmentو کرێمەکان Creams بۆ چارەی زیبکە وەك تریتنوین Tretinoin کە لە ترشەلۆکی ریتنوینیك Retinoic acid (ڤایتامین ئەی Vitamin A) پێك‌هاتوە بە رێژەی 0.05% یان هەمان دەرمان لەسەر شێوەی شلەی گیراوە liquid ئەمیش دەبێ بەپارچە لۆکەیەك سەری زیبکەکانی پێ چەور بکرێت هەمو شەوێك وەئەگەر هاتو زۆر ئازاری ئەو کەسی‌داو کزانەوەی زۆربوو ئەوا دەبێ شەو نا شەوێك پێش نوستن بەکار بهێنێت[٩] ، دەبێ نەخۆش لەسەر ئەم چارەسەرکردنە بەردەوام بێت بۆ ماوەی سێ چوار هەفتە ، ئەوسا دەبینێ کەڵکی لەم بەکارهێنانە وەرگرتووە زیبکەکان بەرەو چاکەوەبوون دەرۆن و خاڵە رەشەکان بەئاسانی و بێ گوشین لا دەبردرێت پاش یەك مانگ دوای چارەسەرکردن .

٧ – هەروەها چەن جۆرە داودەرمانی تر هەیە بۆ چارەی زیبکەی سەر رووی پێست کە سود دەگەیەنێت بە نەخۆش ئەگەر بێتو بەباشی‌و رێكو پێکی بەکاربهێنێت ، لەم گیراوانە وەك : شلەو مەڵحەمو کرێمی بینزویل پیرئۆکساید بە رێژەی (5 – 10 %) Benzoyl Peroxide یان گیراوەی تێکەڵ لە گۆگرد Sulferو ریسۆرکینۆل Resorcinolو دەبێ رۆژی دوو جار دەموچاوی پێ چەور دەکرێت ، ئەم دەرمانە گیراوەتەوەو ئامادەکراوە لەسەر شێوەی کرێمو لەلای دەرمانخانەکان Pharmacy دەستدەکەوێت لە ژێر ناوی کرێمی ئەکنی ئەید[١٠] Acne Aid cream ئەمە زۆر سودبەخشەو نەخۆش کەڵکی لێوەردەگرێت .

**چارەسەرکردنی زیبکەی قولایی پێست :-**

بۆ ئەم جۆرە زیبکەیە چارەسەرکردنو هەوڵدانی تایبەتی پێویستە ، چونکە ئەم قنچکەو دومەڵانەی کە لە قولایی پێستدا هەویان‌کردوە ، بەکارهێنانی مەڵحەم ، کرێمو شلە بۆسەر پێست ئەوەندە سودبەخش نی‌یە ، بۆیە دەبێ نەخۆش ئەم خالانەی خوارەوە رچاوبکات :-

١ – باشترین چارە ئەوەیە کە نەخۆش دەبێ دەرمانی وەك زیندەدژ[١١] Antibiotics بەکار بهێنێت بەتایبەتی زیندەدژی فراوان‌کار[١٢] Broad Spectrum Antibiotic یان بەشێوەی دەرزی Injectionیان لەسەر شێوەی کولاج Capsule ئەمیش بۆئەوەی ژمارەی ئەو بەکتریایانە کەم‌بکاتەوەو لەناویان بەرێت کە بوونەتە هۆی ئەم هەوکردنە .

٢ – باشترین زیندەدژی فراوان‌کار بۆ ئەم جۆرە زیبکەیە دەرمانی تتراسایکلینە Tetracyclinکە زۆر سودبەخش‌و سەلامەتە لە بەکارهێنانا ، دۆزی[١٣] Dosage تایبەت لەم دەرمانە ئەوەیە کە یەك کولاج[١٤] Capsule رۆژی چوار جار (شەش سەعات جارێك یەك کولاج) بۆ ماوەی چوار هەفتە لە دوایی‌دا دەبێ کەم بکرێتەوە بۆ رۆژی سێ کولاجو دوایش بۆ رۆژی دوو کولاج .

٣ – لەبەر ئەوەی ئەم نەخۆشی‌یە لەدوای ماوەیەکی کورت لە بەکارهێنانی زیندەدژەکان لەوەیە بگەرێتەوە دووبارە تازەببێتەوە Relapse ، دەبێ درێژەبدرێت بە بەردەوامی لە

ـەکارهێنانی ئەم زیندەدژە بۆ چەن مانگ‌و سالێك ، بە دۆزێك کە کەمتر نەبێت لە 250–500 ملیگرام milligrams لە ڕۆژێکدا .

٤ – ئەگەر هاتو بەکارهێنانی تتراسایکلین زۆر سودی نەبوو بۆ نەوکەسە ، یان نەخۆشەکە ئافرەتێکی سك‌پڕ Pregnant بوو ، ئەوا دەبێ زیندەدژی وەك :–

ئریسرۆمایسین Erythromycin بەکاربهێنێت هەر لەسەر هەمان دۆزو هەمان ڕێگا .

٥ – بلاوترین زیانەکانی لایەنی[١٥] Side effectsلە بەردەوام بوون لە بەکارهێنانی ئەم جۆرە زیندەدژە لە ئافرەتدا ئەوەیە کە توشی هەوکردنی دۆلان[١٦] Vaginitis دەبێت بەهۆی جۆرە زیندەوەرە زەرەبینیەکان کە سەر بە کۆمەلەی کەروەکانن پێ دەوترێ کەندیدیا Candidia ، ئەگەر هاتو ئەم هەوکردنە بە بەکارهێنانی دەرمانی تایبەت[١٧] بۆ ئەم مەبەستە چاکەوە بوو ئەوا باشە بەلام ئەگەر چاکەوە نەبوو ئەوا دەبێ یەکسەر واز لە بەکارهێنانی ئەم زیندەدژە بهێنێت .

٦ – بەکارهێنانی زیندەدژەکان ، ژمارەی ئەو قنچکەو دومەڵ‌و کیسەلە پڕ لە چلکانەی کە هەوکردنەکەیان هێشتا نوێیە کەم‌دەکاتەوە ، بەلام بۆسەر ئەو دومەڵ‌و قنچکەو گرێ کۆنانە ئەوەندە سود ناگەیەنێت ، بۆیە ئەم جۆرە زیبکەیە دەبێ بەنەشتەرێك[١٨] بتەقێنرێت بۆ ئەوەی هەرچی تێدایە بەتەواوی بێتەدەرەوە .

٧ – دوای دڕین‌و بەتال‌کردنی ئەم جۆرە زیبکەیە ، دەبێ دەرزی گیراوەی ترای ئەمسینۆلۆن ئەستیۆنایدی[١٩] Triamcinolone acetonide لێ‌بدرێت بە قەبارەی 0.5 ملیلتر[٢٠] . بۆهەر دومەلێك ، ئەم کارە بەکەلکە بۆ لەناوبردنی ئەم جۆرە زیبکەیە .

٨ – بەکارهێنانی تیشکی ئێکس X–Ray بۆ چارەسەرکردنی ئەم جۆرە زیبکەیە سودبەخشە بۆ هەندێ نەخۆش بەلام بۆگشت کەس چارەسەرێ تەواو مسۆگەر ناکات .

٩ – بەکارهێنانی هۆرمۆنەکان Hormonesوەك کۆرتیکۆ ستیرۆید Corticosteroidبەتایبەتی ئەو جۆرەی کە ماددەی فلۆرینی تێکەلە Fluorinated زیان‌بەخشەو زیبکەکان خراپتر دەکات .

١٠ – ئەگەر هاتو هەموو ڕێیەکان دەستەوەستان بوون لە چارەسەرکردنی زیبکەو ئەمیش پەیوەندی هەبوو بە خولی مانگانەی ئافرەت (بێنوێژی) Menses ئەوا دەبێ دەرمانی تێکەلەی هۆرمۆنەکان وەك هۆرمۆنی ئیسترۆجین Estrogenو پیرۆجیستیرۆن Progesterone بەکاربهێنێت لەسەر شێوەی حەبی قەدەغەکردنی سك‌پڕبی Contraceptiveهەر ڕۆژی یەك حەب بۆ ماوەیەك کە کەمتر نەبێت لە شەش مانگ ئەوسا بەتەوای ئەنجامەکەی دیاردەبێت .

## ئامۆژگاری گشتی بۆ نەخۆشەکانی زیبکە :–

١ – زیادە خۆری لە خواردن قەت مەکەو دوربە لە خواردنی ڕۆن‌و چەوری Fat وەك :– کەرە Butter ، قەیماغ Cream هەروەها دوربوون لە خواردنی شەکرە مەنی‌یەکان Sugers وەك :– لوقم ، چکلێت ، حەلوا . . . هتد .

٢ – خواردنە پرۆتینی‌یەکان Proteins وەك ، گۆشت‌و هێلکە زیانی نی‌یەو دەبێ جۆرەکانی میوەو سەوزە بە بەردەوام بخۆیت .

٣ – لەبەر ئەوەی کە پارێزکردن‌و کەم خۆراکی دەبێتە هۆی کەم بوونەوەی ڕێژەی ڤایتامینەکان ، بۆیە دەبێ ئەم جۆرە ڤایتامینە لەسەر شێوەی حەب یان کولاج وەربگیرێت لەلایەن نەخۆشەوە بەتایبەتی ڤایتامین ئەی Vitamin و لە ئافرەتی سك‌پڕدا دەبێ ماددەی کالسیۆم Calcium وەربگرێت .

٤ – قەدەغەکردن بەتەواوی لە خواردنەوەی مەی[٢١] ، چای ، قاوەو کاکاو .

٥ – دەبێ نەخۆش بحەسێتەوەو بخەوێت‌و ئەم خەوتنە نابێ لە هەشت سەعات کەمتر بێت لە ڕۆژێکدا .

٦ – نەخۆش نابێ قەبزبێت Constipationئەمیش بە خواردنی میوەو سەوزە چارەدەکرێت‌و باشترە لە بەکارهێنانی حەب‌و دەرمانەکانی رەوانی Laxatives .

٧ – نابێ مەڵحەم‌و کرێمەکانی دەم‌وچاو بەکاربهێنرێت ، بەتایبەتی لە ئافرەتدا کە دەرمانی ئارایش‌کردن بەکاردێنێت Cosmotics .

٨ – وازهێنان لەو خووە خەراپە ، کە نەخۆش بەبێ هۆشی‌و بەبێ ئاگا خەیاڵ دەیباتەوەو هەر خەریکی هەڵکەندی ئەو زیبکانەیەو دەیانخورێنێت‌و وازیان پێ‌دەکات بەنوکی پەنجەو نینۆکەکان Nails ، یانیش بەناو لەپی دەستەکانی چەناگە زیبکاوی‌یەکانی دەخورێنێت .

٩ – دەم‌وچاو شۆرین بە ئاوی ساردو گەرم کراو[٢٢] رۆژی چوار پێنج جارو پێش خەوتن‌و بەکارهێنانی سابونی باش‌و ووشك‌کردنەوەی بە جوانی .

١٠ – باشتر وایە کە ئەگەر زیبکەکان بەرەو زۆربوون رۆیشتن ئەوا هەر لە سەرەتاوە خۆت پیشانی پزیشکی تایبەت بدەیت ، بۆئەوەی هەر زوو بەزوو زاڵ‌بیت بەسەر ئەم نەخۆشی‌یەداو تەشەنەنەکات ، ئەو دەم‌وچاوەت هەر وەك خۆی بەجوانی‌و رێکی بمێنێتەوەو لەبەردەم ئاوێنەدا رووی خۆت بەشێواوی قەت نەبینیت .

**پەراوێزەکان :**

(١) – لە هەندێ ناوچەی کوردستانا پێی دەوترێ جوانەزمە .
(٢) – بنەرەتی مووەکان واتە (بصيلات الشعر) .
(٣) – کیراتین یان المادة القرنية بناغەی کیمیایی شانە Tissues وشك‌و رەقەکان دروست‌دەکات وەك :– درێژایی موو ، نینۆکەکان ، شاخ (قۆچ)یان جۆق Horneو سم Hoof و پی‌ی گیانەوەرەکان ، هەروەها پێستی بن پاژنەی پی‌و ناولەپ گۆڕاون بۆ ئەم جۆرە مادده ووشك‌و رەقە .
(٤) – واتە المجهر الالكتروني ، کە ئەو شتە ملیۆنەها جار زیاتر گەورەدەکاتەوە .
(٥) – چەوری‌رژێن لە گشت پێستی لەشدا هەیە تەنها ناولەپ Palmsو ژێرپێ نەبێ Soles تێدا نی‌یە ، بەڵام بەزۆری ئەم چەوری‌رژێنانە لەم جێگایانەدا زۆرن :–
پێستەی کەللەسەر Scalp ، دەم‌وچاو Face ، نزیك بەخەنی (هێلی) ناوەڕاستی پشت‌و سنگ Chest .
ئەو چەوری‌یەی Sebum کە دەرژێت لە لایەن چەوری رژێنەکان لەم ماددانە پێکهاتوە :–
ترشە چەوری‌یەکان Fatty acids بە هەردوو جۆرەکەی ئاڵۆز Combinedو سەربەخۆ Free . کۆلستیرۆل Cholesterol ، ماددەی سەرەکی بۆ ڤایتامین (دی) Precursor of Vit. Dو ئەوانی تر .
(٦) – بەکارهێنانی ئەو سابونانە زیانبەخشە کە ماددەی کیمیایی تۆزێنەرەوەو کزێنەرەوەی Irretant تێدایە ، باشتر وایە کە جۆرەکانی سابونی پزیشکی بەکاربێت بۆ ئەم مەبەستە Medical Soaps .
(٧) – باشتر وایە کە کاغزی سرین Cleaning tissues بەکاربێت چونکە لە لایەن تەندروستی‌یەوە لە خاولی بەکارهێنان باشترە .
(٨) – مەبەست لە ووشەی نەخۆش ئەو کەسەیە کە توشی زیبکە بووە چونکە باسەکە تایبەتە بۆ نەخۆشی زیبکە .
(٩) – لە کاتی چەورکردنی دەم‌وچاو Face بە مەڵحەم‌و کرێم‌و شلەکان دەبێ ئاگاداری ئەندامەکانی روو بیت کە زیانیان پی‌نەگات وەك : چاو ، کونا لوت ، دەم‌و لێو .
(١٠) – ئەم کرێمە ئامادەکراوە ، لەژێر ناوی ئەکنی‌ئەید لەم ماددانە پێکهاتوە :–
پ – کلۆرۆ – م – زایلینۆل P – chloro – m – Xylenol 0.375%
ریسۆرکینۆل 77 1.25% Resorcinol گۆگرد Sulfur 2.5%
رەنگی ئەم کرێمە گۆشتی رەنگەو کێشەکەی 1.8 ئۆنسە کە یەکسانە بە 51 گرام .
(١١) – زیندەدژ واتە المضادات الحيوية یان مضادات الحياة .
(١٢) – زیندەدژی فراوانکار واتە ذات تاثير واسع .
(١٣) – دۆز واتە الجرعة ، الجرعة الدوائية .
(١٤) – هەر یەك کولاج لەم زیندەدژە 250 ملیگرام لە ماددەی تتراسایکلینی تێدایە .
(١٥) – واتە التاثيرات الجانبية .
(١٦) – واتە ألتهاب المهبل .
(١٧) – بەکارهێنانی دەرمان بۆ ئەم مەبەستە یان بە رێگای هەڵگرتن واتە حەبی تایبەت لە دۆڵاندا Vaginal tablet هەڵدەگیرێت ، یان بە رێگای دەرزی لێ‌دان یانیش خواردنی ئەو دەرمانە لە دەمەوە یانیش بەگشت رێگاکانی دەرمان بەکارهێنان .
(١٨) – ئەم کارە لە لایەن پزیشکی تایبەتەوە دەبێ ئەنجام بدرێت .
(١٩) – چڕی ئەم گیراوەیە 2.5 ملیگرامە بۆ یەك ملیلتر .
(٢٠) – ملیلتر واتە (سم³) سیتیمتر مكعب ، یان سی سی Cubic Centimeter C.C .
(٢١) – واتە المشروبات الكحولية ، المشروبات الروحية بە هەموو جۆرەکانی .
(٢٢) – نە سارد نە گەرم هەندێ کەس دەڵێن شلەتێن .

سەرچاوەکان Refrances


(1).James marshall, Diseases of the Skin, London.
(2).The merck manual of diagnosis and therapy 13th.ed 19 U.S.A.
(3).Paul and David, The human body, 1979 London
(4).Vademecum of S D I , 1979 . IRAQ.
(5).Vademecum of SDI , 1981. IRAQ.
(6).Lectures, on Skin diseases by Dr. S.A – AL .Sammarae , College of Vet – medicine . B.U 1979
(٧) – نخبة من الأساتذة والأطباء ، المرشد الطبي الحديث ، لبنان .
(٨) – د . عبدالكريم محمد علي ، ژمارەی سی‌یەم ل ٩٢ ، گۆڤاری ئاسۆی زانکۆیی سالی ١٩٧٩ .

بەبۆنەی ڕۆژی ڕۆژنامەنووسی کوردی‌یەوە

# لە پێناوی لەچاپ دانەوەی گۆڤارو ڕۆژنامە کوردی‌یە کەمیابەکاندا

**محمدی مەلا کرم**

بیست‌ودووی نیسان لە مێژووی نوێی گەلی کوردا ڕۆژێکی تایبەتی‌یە. ڕۆژێکە شەقڵی یەکێ لە هەنگاوە گەورەکانی دەست‌پێکردنی گواستنەوەی مێژوویی ئەم گەلەی بۆ ژیانی نوێ، وەك ڕۆژی ڕووناك، بە ناوچاوەوە دیارە، چونکە ڕۆژی دەرچوونی یەکەمین ڕۆژنامەیە لە مێژووی گەلی کوردا.

دەرچوونی یەکەمین ڕۆژنامەیش، لە مێژووی هەرگەلێکدا، بەتایبەتی لە چەرخی نوێدا، هەنگاوی کاریگەری یەکەمە بەرەو گەیاندنی دەنگی هوشیارکردنەوە بە هەموو نەتەوەدا، بە هەموو ئەوانەدا بە یەك زمان ئەدوێن لە ولاتێکداو ئامانجێکی – یا کۆمەڵە ئامانجێکی – سەرەکی، سەرەڕای هەموو جیاوازی‌و ناکۆکی‌یەکی نێوانیان، کۆیان‌ئەکاتەوە. کەواتە دەرکردنی ڕۆژنامەیەك بۆ هەموو نەتەوە نیشانەی هەستە بە بوونی نەتەوەکە، بە ئامانجی یەکگرتووی، بە چارەنووسی پێکەوەی.. چەکی خەباتە بۆ وشیارکردنەوەی سەرانسەری نەتەوە لەئاست مەبەستی پێکەوەی هەموو ڕۆڵەکانی‌و ئەنجا بۆ کۆکردنەوەو ڕێکخستن‌و خستنە کۆڕی خەباتیان بۆ وەدەست‌هێنانی ئەو مەبەستەی هەموان. لەمەوەیە پێشەنگانی خەباتی ئازادی‌بەخشی هەر گەلێك بگری لە قۆناغی یەکەمی هاتنە مەیدانیانەوە، کەوتوونەتە هەوڵ‌و تەقەلای دەرکردنی ڕۆژنامەیەکی سەرانسەری کە دەنگی دلێریان بە هەموو کون‌و قوژبنێکی ولاتەکەیان‌و بە هەموو ڕۆڵەکانی گەلەکەیانا بگەیەنێ.

گەورەیی ئەم ئەرکەو پیرۆزیی ئەم نامەیەی ڕۆژنامەیش، هەرگیز ئەوە هیچی لێ کەم‌ناکاتەوە ئەگەر لە قۆناغی‌یەکەمی بلاوبوونەوەیا، بە سەنگ‌و ترازووی تێگەیشتنی لەوەپاش، لە ڕووی هونەرو شێوەو پەل‌هاویشتنی بابەتەکانیەوە، گەلێ لەخوار ئاستی مەزنی‌و بایەخداریی ئامانجەوە بووبێ. لەئاست ئەرکدا بوونی ڕۆژنامە بەوە دەست‌نیشان ئەکرێ ئاخۆ لەگەڵ یەکەمین بەرەبەیانەکانی سەرهەڵدان‌و پشکووتنیا توانیویە شانەڵقەی خەبات‌و ئامانجی سەرەکی دەست‌نیشان بکا، یا

هەر هیچ نەبێ ڕێگای دەستنیشان کردنی بگرێتەبەر . جا بەم پێودانە ، لەو ڕووەوە ناڵێم کە ڕۆژنامەنووسێکی کوردمو هەموو شانو شکۆو سەربەرزی‌یەکی ڕۆژنامەنووسیم بۆ ڕۆژنامەی تێکۆشەری کوردی ئەویو ، خۆشەویسترین ڕۆژانی ژیانم بەلامەوە ئەو ڕۆژانەمە لە کاری سەختو دژواری ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا شەونوخونیم کێشاوە لەپێناوی وەدی‌هێنانی برایەتیی هەموو تێکۆشەرانی گەلدا ، بەڵکو وەك ڕۆشنبیرێکی – ئەگەر هەبێ – بێلایەن قسە ئەکەم : ڕۆژنامەی (کوردستان)ی یەکەم پێش‌قەرەوڵی خەباتی ئازادی‌بەخشی کورد ، بە بەراورد لەگەڵ یەکەم ڕۆژنامەی زۆر گەلی‌تر ، هەر لە یەکەم ژمارەیەوە ، لەم مەیدانەدا لە ڕیزی پێشەوە بووە . ئەوەتە دروشمی ژێر ناوەکەی لە ژمارە (١)یەوە تا ژمارە (٣)ی ئەوە بووە : «هانی‌کوردان ئەدا بۆ وریابوونەوەو فێربوونی سنعات» چونکە چاوێکی دانەرەکەی لە وڵاتە پاشکەوتووە دیلی دابو نەریتو ڕژێمی ژیانی سەدەکانی ناوەڕاستەکەی خۆیو ، ئەو چاوەکەی لە ئەورووپای سەدەکانی پاش چەرخی ڕێنیسانسو شۆڕشی پیشەسازی‌و تێکدانی دامو دەزگا جۆربەجۆرەکانی دەرەبەگی‌و ئاوەدانکردنەوەی وڵاتو گەشەکردنی خوێندەواری‌و هونەرو سنعاتکاری بووە . پاشانیش ئەو دروشمە بووە بەوە کە : «هانی کوردان ئەدا بۆ دەستخستنی زانستو هونەرو ، ئامۆژگاری‌و ئەدەبیاتیشی تیایە» ، کە واتای ئەمیش لە هەندێ ڕووەوە ، لە واتای دروشمەکەی پێشوو بەدەرەتانترە . بێگومان ئەگەر بە چاوێکی ورد سەیری مەسەلەکە بکەین تێ‌ئەگەین ئەم دروشمە ڕادیکاڵی‌یانە خۆی نانوێنێ ، بەڵام خۆ دروشمێکە لەسەر بنەمای تێگەیشتنی زەمینەی مایەیی (مادی) پێشکەوتن بنیاتنراوە .

* * * * * *

ژیانی ڕۆژانەی کوردستانی چەرخی دەرکردنی یەکەم ڕۆژنامەی کوردی ، ئەوەندەی پێوەندی بە خۆی‌و دانیشتووانیەوە بێ ، هیچ بنەمایەکی ڕەخساوی دامەزراندنی ژیانی نوێی تیا نەبوە . تەنانەت کە کۆمەڵێ ڕۆشنبیریش بیریان لە دەرکردنی ڕۆژنامەیەك کردووەتەوە خەڵکەکەی پێ وشیار بکەنەوە ، لەناوخۆداو بەڵکو لە پێتەختی داگیرکەرانی وڵاتەکەشیانا ئەو تواناو دەسەڵاتەیان نەبوە ڕۆژنامەکە دەرکەنو ، ناچار پەنایان بردووەتە بەر وڵاتێکی دۆستو ئارادەیەك هاودەردو بەڵام دەرەتان بۆ ڕەخساو ، کە قاهیرەی پێتەختی میسر ، پێتەختی ساڵەهای ئەییووبی‌یە کوردەکانە . ئەمە ، هەر لە یەکەم نیازی هەنگاو هەڵهێنانەوەوە بە ڕێگای دامەزراندنی ڕۆژنامەی کوردیدا ، وەك یەك دوو جاری‌تریش لە هەندێ نووسینمدا لەبارەی ڕۆژنامەنووسیی کوردی‌یەوە ئیشارەتم بۆ کردووە ، دوو ڕاستیی گەلێ بایەخداری فێری ئەو ڕۆشنبیرانە کردووە : ڕاستیی یەکەم پێویستیی بوونی ئازادیی دیموکراتی‌یە بۆ هەرجۆرە هەڵسووڕانێکی ئەوتۆ کە مەبەست بێ لەناو جەماوەرداو لە چوارچێوەی خەباتی هێدیدا بکرێ ، کە لە ئەستەمووڵ نەبوەو لە قاهیرە بووە . دووهەمیش هاوکاری‌و پشتی یەك گرتنی گەلانی هاودەردە کە ئەوەتە نوێنەرانی گەلی میسری برا پێشکەشی نوێنەرانی گەلی کوردیان کرد . ئەم دوو ڕاستی‌یە کە پێشەنگانی ڕۆژنامەنووسیی کوردی لەگەڵ یەکەم هەنگاو هەڵهێنانەوەیاندا بە ڕێگای بنیاتنانی ڕۆژنامەی تێکۆشەری کوردیدا وەك دوو دەرز فێری بوون ، ئیستاش وەك ئەو کاتەو بەڵکو لەوکاتەیش گەشترو زەقتر بایەخی خۆیان پیشانئەدەنو ، ئەتوانم بڵێم گەلێ لەو کارەساتە سەختانەی لە مێژووی نوێی گەلی کوردا تووشی ئەم گەلە هاتوون ، لەبایەخ پێ‌نەدانو پشتگوێ خستنی ئەم دوو دەرزەوە تووشی هاتوون .

* * * * * * *

وەك ئەوانەی یەکەم ڕۆژنامەی کوردی‌یان لە مێژووی گەلی کوردا دەرکرد ، هەموو ئەوانەیش پاش ئەوان ڕۆژنامەو گۆڤاری کوردی‌یان بۆ سوودی گەلی کورد دەرکردووە ، تا ئەمڕۆیش چاوێکیان لە جیهانو چاوێکیان لە کوردستان بووە . بەو چاوەی جیهانیان پێ دیوە ، گەشەکردنی هەموو سەرێکی

ـین ، دەست‌نیشان کردن‌و جیاکردنەوەی ئەرك‌و پێویستی جۆربەجۆرو ڕێکخستن‌و ڕیزکردنیان بەگوێرەی پێوەندیان لەناو خۆیاناو نزیك‌و دووری‌یان لەیەکەوە ، دیاری‌کردنی بەرپرس‌و ـگەیێن بۆ هەریەکە یا هەر کۆمەڵێکیانیان دیوەو ، شیفتەو ـەیدای ئەو جۆرە پێشکەوتووەی ڕێکوپێکی‌و کارڕاپەڕاندن ـوون . بەم چاوەکەشیان کە کوردستانەکەی خۆیانیان پێ دیوە ، لە سەرەتادا بێ‌بەشی لە هەموو خێرو خۆشی‌یەك ، ـەبوونی هیچ جۆرە دەزگایەکی نوێ ، بێ‌پێوەندی بە هیچ ڕوویەکی ژیانی نوێ‌یانەوە دیوە . پاشانیش کە وردە وردە بەپێی گەشەکردنی ژیانی گشتی‌و لەئەنجامی خەباتی گەل خۆیدا ، چەردەیەکی نیوەو ناتەواوی هەندێ دیمەنی پێشکەوتن گەیشتووەتە کوردستانیش ، ئەوەیان هەمیشە بەرووردا هەڵزەقیوەتەوە کە ئەوەی هەیشە قۆناغەها لەخوار ئاستی ئەوەوەیە کە ئەبێ ببێ . کە دەستیشیان نەگەیشتووەتە هیچ‌لایەك‌و چاری هیچ دەردێکیان بۆ نەکراوە ، هەر ئەوەیان بۆ ماوەتەوە دەسمایە کورتەکەی دەستی خۆیان : ڕۆژنامە یا گۆڤارەکەیان ، بکەن بە کەشکۆڵی دەروێش ، هەمووجۆرە بابەتێکی تیا بنووسن‌و لە هەموو شتێکی تێ‌بئاخنن . بیکەن بە بلەندگۆی سیاسی ، بە میحرابی مزگەوت ، بە پۆلی قوتابخانە ، بە دیوانی ئەدەب ، بە کتێبی مێژوو ، بە موزەخانەی‌پاشماوەی کۆن ، بە تاقیگەی زمانەوانی ، بە پیشانگای فۆلکلۆر . لەکورتی بیبڕینەوە لە هەموو جۆرە بابەتێکیان تیا نووسیوەو کۆکردووەتەوە ، چونکە ئەگەر وایان‌نەکردایە شوێنی‌تر نەبوو ئەم بابەتە جۆربەجۆرانەیان تیا بنووسرێ‌و زۆریان ئەفەوتان‌و هیچیشیان نەئەگەیشتە بەرچاوی خەڵك .

ئەمە وامان‌لێ‌ئەکا سەرەڕای بایەخی سیاسی ڕۆژنامەو گۆڤاری کوردی کە لەم نزیکەی (٩٠) ساڵەی ڕابوردوودا دەرچووە ، ئەم ڕۆژنامەو گۆڤارانە وەك ئەنسیکلۆپێدیای کولتوورو زانستی کوردو کوردستانیش تەماشا بکەین .

* * * * * * *

کە بڕیارماندا ڕۆژنامەو گۆڤاری کوردیی ئەم نزیکەی (٩٠) ساڵەی ڕابوردوو کۆکەرەوەی بەروبوومی هەموو ژیانی ڕۆشنبیریی ئەو ماوەیەی کوردستانەو ، ئەوەیشمان هێنایەوە بەرچاو کە بەشێکی زۆر کەمی نەبێ ئەم بەروبوومە نەکەوتووەتە بەرچاوی زۆرتری وەچەی ئێستاو بەڵکو چەند وەچەی پێشوویشمان‌و ، ئەگەر وەزعەکەیش بەم‌جۆرە بمێنێتەوە کە ئێستا هەیە وەچەکانی لەمەوپاشیشمان شتێکی ئەوتۆیان لێ بەرچاو ناکەوێ ، تێ‌ئەگەین کە ئەرکێکی گەورە لەئەستۆی هەموو ئەو دەزگایانەدایە کە بە ناوی کوردەوەدامەزراون ، چ لە کوردستان – بەتایبەتی لە عێراق‌و لە کوردستانی عێراق – و چ لە وڵاتانی دەرەوە : ئەرکی کۆکردنەوەو لەچاپ‌دانەوەی هەموو ئەو ڕۆژنامەو گۆڤارە کوردی‌یانەی تائێستا دەرچوون‌و بەئاسانی دەستی خەڵك ناکەون .

لە ساڵانی حەفتادا بەهیممەتی پیاوانەی برادەرێك ئەوەی بەردەست کەوتووە لە ڕۆژنامەی (کوردستان)ی یەکەم ڕۆژنامەی کوردی‌و ، بە هیممەتی برادەرێکی تریش سێ ژمارەی گۆڤاری (ڕۆژی کورد – ١٩١٣) و (بانگی کوردستان – ١٩٢٢)و (ڕۆژی کوردستان –١٩٢٣–١٩٢٢) بە ئۆفسێت لەچاپ‌درانەوە . هەروا لەوساڵانەدا بەشە بەتیپی لەچاپ‌دراوەکەی گۆڤاری (هاوار) لە سوید لەچاپ‌درایەوە . ساڵی ڕابوردوویش (١٠) ژمارەی گۆڤاری (ژین – حیات) کە لە ساڵانی ١٩١٩–١٩١٨دا بە زمانی کوردی‌و تورکی‌و بە تیپی عەرەبی لە تورکیا دەرچووە ، بە لێکۆڵینەوەیەکی بەپێزەوەو لەگەڵ وەرگێڕانی بەشە تورکی‌یەکەیدا بە کوردی‌و نووسینەوەی هەمووی بە تیپی لاتینی‌و بە ئۆفسێت کردنەوەی ئەسڵەکەشیەوە ، لەلایەن مامۆستا موحەممەد ئەمین بۆزئەرسەلانەوە ، لە دوو بەرگدا ، بەرودوا لەچاپ‌درایەوە .

هەروەها دوکتۆر جەمال نەبەزیش لە ئەڵمانیای فیدراڵی گۆڤاری (نیشتمان)ی بە دوو لێکۆڵینەوەی ئەڵمانی‌و کوردی‌یەوە لەچاپ‌داوەتەوە . تاقە ژمارەکەی گۆڤاری (پەیژە)ی مستەفا

شەوقیش لەگەڵ لێکۆڵینەوەیەکا لەلایەن مومتاز حەیدەری‌یەوە لەچاپ‌درایەوە .

بەڵام لەگەڵ بایەخی زۆری کاری هەموو ئەم برایانەیشدا ، ئەرکەکە هێشتا بەزەقی لەپێشماندایەو پێویستی بە بیرلێکرکردنەوەو چارەکردنی زووبەزووە . ئیستاش گەلێ لە گۆڤارو رۆژنامەکانمان . نەخوازەلا کۆنەکانیان . کەسمان بەوردی نازانێ لە کوێ‌و لای کێ دەست‌ئەکەون .

رۆژنامەی‌وامان بووە . وەك رۆژنامە یەك لەدوای یەکەکانی پیرەمێرد . هەرچەند ئەبوو ئیستا بەتەواوی لە گەلێ شوێن دەسگیر بێن . شوێنی‌وا نی‌یە کۆمەڵێکی تەواوی لی‌یان تیابێ .

لە شوێنێکی وەکوو کتێبخانەی گشتیی سلێمانی‌و کتێبخانەی مووزەخانەی سلێمانی . کۆمەڵێ رۆژنامەی جۆربەجۆری کوردی هەن ئەوەندە ئەم‌دەست‌و ئەوەدەستیان پی‌کراوەو خەڵك بۆ تەماشاو خوێندنەوە وەریان‌گرتوون . پەرپووت‌بوون‌و دارازون‌و . بی‌گومانم ئەگەر تا چەند ساڵێکی کەمی‌تر هەروا ئەم‌دەست‌و ئەودەستیان پیێ بکرێ . لە بەرگە مقەبا رەق‌و تەقەکەیان بەولاوە شتێکی ئەوتۆیان نامێنێتەوە . من لەوباوەرەدام دانی رۆژنامەو گۆڤاری وەك ئەو رۆژنامەو گۆڤارانە نایاب . بەم‌جۆرە . بەدەستی خوێندەوارەوە . گوناحێکی گەورەیە لەئاست رابوردوو و داهاتووی نەتەوە . بۆ پی‌سەلماندنی ئەم قسەیەم ئەڵێم فەرموون کۆمەڵی رۆژنامەکانی پیرەمێرد : ژیان ، ژیانەوە ، ژین‌و ، رۆژنامەکانی لە هاتنی ئینگلیز بۆ سلێمانی بەدواوە تا برانەوەی یەکجاریی بزووتنەوەی شێخ‌مەحموودی حەفید ، لە کتێبخانەی کێدا بەتەواوی هەن ؟ باشە ئەگەر ئەم کۆمەڵە رۆژنامانەی کتێبخانەکانی سلێمانی بەتەواوی درانو فەوتان ، لە کوێ نوسخەی‌تریان چنگ‌ئەکەوی‌و ئیتر ئەبێ چی‌یان بۆ بکەین ؟

لەبەرئەوە پێویستە دەزگاکانی ئەمینداریێتیی گشتیی کولتوورو لاوانی ناوچەی ئۆتۆنۆمی ، دەزگای رۆشنبیریی کوردی ، کتێبخانەی نیشتمانی ، کتێبخانەی مووزەخانەی عێراق ، نەقابەی رۆژنامەنووسانی عێراق بە لقی ناوچەی ئۆتۆنۆمی‌یشیەوە . چ هەموو پێکەوەو چ جیا جیا . دەس‌وبرد بکەن پرۆژەیەك دانێن لە دوو قۆناخا . قۆناخی یەکەم بۆ وێنەگرتنەوەی بە میکرۆفیلمی هەموو ئەو گۆڤارو رۆژنامە کوردی‌یانەی لە کتێبخانە رەسمی‌و ئەهلی‌و شەخسی‌یەکانی عێراق‌و دەرەوەدا هەن بە چەند نوسخەو دابەش‌کردنی ئەو نوسخانە بەسەر کتێبخانە گەورەکانی پارێزگاکاندا بۆ ئاسان‌کردنی کاری لێکۆڵەرەوەو توێژەرەوان‌و بۆ دانانی رادەیەك بۆ بەردەست‌خستنی نوسخە قاقەزی‌یەکانی ئەو رۆژنامەو گۆڤارانە . قۆناخی دووهەمیش بۆ لەچاپدانیان بە ئۆفسێت‌و خستنە بازاریان تا هەرکەس ئارەزووی هەڵگرتنیانی هەبێ بی‌یانکرێ‌و . ئەوانەیش کەم نین .

هەروەها ئەوەیش پێشنیهاد ئەکەم کە کەسانێکی شایستەو لی‌هاتوو قۆڵی لیێ هەڵماڵن بۆ بیبلیۆگرافیا بۆکردنی هەریەك لەم رۆژنامەو گۆڤارانە بە شێوەیەکی ووردو بی‌هەڵەو بە شارەزایی‌یەکی تەواوەوە لە هونەری بیبلیۆگرافیا نووسین . بەمە رێ خۆش‌ئەکەین بۆ توێژەرەوەکانی هەموو لقەکانی زانست‌و کولتوور لە کوردستانا کە بزانن لە بابەتی پسپۆریی ئەوانا پێش خۆیان چی‌کراوەو چی نووسراوە ، تا کاری ئەمانیش پێوەند بێ بە کاری رابوردووانەوەو کەس لەخۆرایی کاری یەکێکی‌تر دووبارە نەکاتەوەو بەتەواوی حیسابی کولتوورو زانستی خۆمان بزانین .

چەند مانگێك لەمەوپێش بە راست‌کردنەوەی پرۆڤەکانی چاپی نوێی دیوانی حاجی قادری کۆیی‌یەوە خەریك‌بووم کە برایان کەریم شارەزاو سەردار میران ئامادەیان کردووەو مامۆستا مەسعوود محەممەد پیاچووەتەوە . لە کاتی راستکردنەوەی پرۆڤەکاندا ، بەمەبەستی ئەوەی کارەکەی ئەو برایانە پوختتر بکەوێتە بەردەستی خوێندەواران ، ئەگەرامەوە سەر کۆمەڵێ سەرچاوەی چاپ‌و دەسنووس کە لە بەردەستی ئەو برایانەدا نەبوون . چەند پارچە شیعری حاجی کە لە تێکستە نوێکەدا

هەنو لە چاپە پێشووەکانی دیوانی حاجی‌یشدا بلاو کراونەتەوە ، ە گۆڤاری (رۆژی کورد)و (تێگەیشتنی راستی)و (دیاریی کوردستان)یشدا هەبوون . بەلام لەماندا راستتر بوونو گەلێ هەڵەو گیروگرفتیان پێ چارەسەر کرا کە تائیستا بەزەقی لە پێش چاوی خوێندەواراندا مابوونەوە . ئەمە یەکێکە لە رووەکانی بەبەخی لەچاپدانەوەی ئەو گۆڤارو رۆژنامانە . (لێرەدا بە موناسبی ئەزانم داخی خۆم بۆ ئەوە دەربیرم کە دوکتۆر کەمال مەزهەر نەهات لەگەڵ لێکۆڵینەوە بەپێزەکەی خۆیا لە رۆژنامەی «تێگەیشتنی راستی» ، تێکستی تەواویشی بلاوبکاتەوە . ئاواتم ئەوەیە جارێکی‌تر بگەرێتەوە سەری‌و لەگەڵ دەست پیاهێنانەوەیەکی کتێبەکەیا بە چاپی بگەیەنێ) .

لەناو ئەدیبانی کوردا گێرەو کێشەیەکی گەورە هەیە لەبارەی ئەوەوە کە یەکەم چیرۆکی کوردی کامەیە ، لەکەیەوە دەست‌کراوە بە شانۆنامە نووسین لە کوردیدا ، کەی یەکەم‌جار بیر لە چارەسەر کردنی گیروگرفتەکانی نووسینی لە کوردی بە تیپی عەرەبی کراوەتەوە . ئەمانەو گەلێ بابەتی‌تر کە جێگای دەمەقاڵەو مشتومڕی ناو ئەدیبانن ، ئەگەر سەرجەمی رۆژنامەو گۆڤارە کوردی‌یەکان لە بەردەستی خوێندەوارانا بوونایە ، ئەو هەموو کاتە بە لێکۆڵینەوەی ئەو بابەتانەوە سەرف نەئەکراو ، ئێستا وەلامی هەموو ئەو پرسیارانەو گەلێکی‌تریش بەئاسانی درابووەوە .

* * *

کوردستان گەلێ کەسی‌وای تیایە بێ‌سڵ‌کردنەوەو چاوترسان بە دەیان هەزار دینار بۆ کردنەوەی یانەیەکی رابواردن ، شانۆیەك ، نەخۆشخانەیەك ، مزگەوتێك خەرج‌ئەکاو ، ئێمە خۆمان لە کوردستانی عێراقا نموونەی وامان لە پێش‌چاوە . ئاواتەخوازم کەسانی‌وا هەر روو لەزیادی بن‌و ، مەبەستیشم بە هیچ کلۆجێ بە کەم روانینە ئەو جۆرە خزمەتانە نی‌یە کە هەرکامیان بگرێ کەمو زۆر جەماوەرێ کەڵکی لێ وەرئەگرن‌و لای ئەوکەسانەی پێوەندیان پێوە هەیە گەورەو بەبایەخە ، بەلام لە هەموو حاڵێکا بایەخەکەی هەموو نەتەوەو سەرجەمی ژیانی کولتووریمان ناگرێتەوە . بۆیە زۆر جوانو بەجێ بوو ئەگەر کەسانی‌وا لەناو خۆیانا باربوویەکیان رێك بخستایە بۆ پێکەوەنانی پرۆژەیەك لە شارێکی ئەورووپا کە رۆشنبیرانی کورد لە هەموولایەکەوە بیگەنی‌و توانای هونەری‌و هەمووجۆرە دەسەلاتێکی‌تری تیابێ بۆ کۆکردنەوەو لەچاپدانەوەی تێکستی سەرجەمی گۆڤارو رۆژنامە کوردی‌یە کەمیابەکان ، بێ خۆخەریك‌کردن بە هیچ کۆسپ‌و تەگەرەیەکی وەکوو ئامادەکردنی پێشەکی‌و لێکۆڵینەوەو شتی‌واوە کە ئەتوانرێ دوابخرێ بۆ پاشتر ، ئەوسا هەرکەس خۆی بە شایانی ئەو ئەرکە بزانێ پێ‌یەوە خەریك بێ .

* * *

وەك وتم ، رۆژنامەو گۆڤارە کوردی‌یەکانی ئەم هەشتا — نەوەد ساڵەی رۆژنامەنووسی کوردی ، ئەنسیکلۆپێدیای ژیانی کولتووریی کوردن . دەسا با هەموو لەئاستی خۆمانەوە پێکەوە تێ‌بکۆشین بۆ لەچاپدانەوەی هەموویان بە چەند قۆناخ‌و ، پێشەکی لەوانەیانەوە دەست‌پێ‌بکەین کە لەهەموویان کەمیابترن .

ئەگەر لەم دوازدە ساڵەی داهاتوودا ، تا یۆبیلی سەدساڵەی رۆژنامەنووسی کوردی دادێت ، بتوانین ئەم ئەرکە جێ‌بەجێ بکەین خزمەتێکی گەورەو وەختە بڵێم لە هەموو خزمەتێ گەورەتری ژیانی کولتووریی خۆمانمان کردووە .

دەی ، با بە هەموومان ئەم چەپکە گوڵە رازاوە بهۆنینەوەو پێشکەشی یادی پیرۆزی داهاتووی سەدساڵەی رۆژنامەنووسی کوردیی بکەین‌و ، لە بەرپێی گڵکۆی هەموو سەربازە ناسراوو نەناسراوەکانی رێگای بەئازادی نووسینی رۆژنامەی کوردیدا داینێین . ئەوانەی لەپێناوی گەشەکردنی رۆژنامەنووسی کوردی‌و دەربرینی ئازارو ئاواتەکانی گەلی کوردا تێکۆشانو بەهیوای کوردستانێکی لە هەموو بارێکەوە ئاوەدانو گەشەکردووەوە سەریان نایەوە .

ئەحمەد حەیران

# بەیتاری لە کۆمەڵی کوردەواریدا

بێگومان فۆلکلۆرو کەلەپووری هەر میللەتێك هەڵقولاوی بیروو بۆچوونی دەستەو تاقمە سادەکەی ناو ئەم کۆمەڵەن . ئەمانەی لە هەموو کەس زیاتر بەر زەبرو زەنگ‌و ئاستەنگی‌و ناسۆری ژیان کەوتوون جا چ بە دیاردە کۆمەلأیەتیە دەست کردەکانەوە بێ یان بە دیاردە سروشتیەکانەوە . ئەگەر فۆلکلۆریش پانتاییەکی گەورەی داگیرکردبێ لە ئەدەبی هەر میللەتێك ئەمەش دیارە بە زمانی زۆربەی زۆری خەڵك دەربڕاوەو لە گێژاوی بیرئالۆسکاوی بە دوورکەوتۆتەوەو نەخشەی بۆچوونی زوربەی کۆمەلأنی خەڵکیشە لەبەر ئەمە ناتوانین تخووبی بۆ دابنێین ئەگەر دڵێشمان بەمانەوە ئاو نەخواتەوە ئەوا خۆ فۆلکلۆر توانیوویەتی خاسیەت‌و تایبەتی‌یەتی شەقلی ڕەسەن بە گەلانی سەرگۆی زەوی بنووسێنێ‌و مۆرکی جیاوازی ناوچە لەگەڵ ناوچە هەڵبگرێ‌و ئامێتەی بیری زۆربەی کۆمەڵ بێ هەر بۆیەشە دەبینین لە هەموو کات‌و سەردەمێك خەڵك زیاتر متووی بەمەوە دەبێ کەڕۆشنبیری‌یەکەهی خۆی بێ‌و دوور لە داتاشین‌و دەست‌کرد ئەمەش هەر لەبەر ئەمەیە چونکە خۆی بەردی بناغەی دارێژتووەو لەگەڵ سەلیقەی خۆی دەگونجێ هەروەك چۆن لە کوردەواری خۆمان دەڵێ (بەرخی دوایی زووتر بەداکی دەکەوێتەوە) ئەمەش وایە چوونکە ڕەسەنە میللەت لە هەموو دیاردەکانی تر زووتر پێی شاد دەبێ‌و پەنجەی نەمری بۆ درێژ دەکا . ئەمەی لێرەدا دەمانەوێ بیدرکێنین خستنەڕووی لایەنێکی بزرە لە ئەدەبی فۆلکلۆری گەلەکەمان کەوا دیارە بەدەم بێ دەنگی‌یەوە هەڕەشەی لە ناوچوونی لێ دەکرێ‌و خەریکە ژەنگ هەڵبێنێ ئەمیش (پیشەی بەیتاری‌یە لە ناو کۆمەڵەکەمان) بێگومان دەرخستنی لایەنێکی لەم بابەتە هەروەك دەزانین نوێ‌یەو بۆیەکەم جار لەسەری دەنووسرێ ئەگەر کەم‌و کورتیشی گرتبێتە خۆی ئەوا ئەمانەی لەم بوارەدا ئەسپی خۆیان تاو دەدەن دەتوانن شتی نوێ‌ی بخەنە سەروو لایەنە بێ هێزەکانی بۆ جاری‌تر خاشەبڕ بکەن جگە لەمەش لەوانەیە زور کەس خستنە ڕووی ئەم جورە بابەتە بەشتی نابەجێ بزانێ . بەلأم خۆی لە ڕاستی‌دا نابێ وابێ چونکە ئەمە سامانی نەتەوەیە .



ئەبێ داکۆکی لێ بکرێ لەمانەوەو بەشێگیریەوە پارێزگاری ێ بکرێ چوونکە ئەم کۆمەڵەی ئێستا دەیبینین چەندان ساڵ پێش ئێستا ئەم جۆرە کورە نەبووە هەروەها جگە لەمەش ئەم ەوعە پیشەیە بەشێوەیەکی یەکجار زۆر لە ناو کۆمەڵی کوردەواریمان باوەو تاوەکوو ئێستاش بە جۆرێکی بەردەوام خەڵك ئەگەر جێگەیەکیان شکستی بێنێ ئەوا ڕوو دەکەنە لای بەیتارەکان هەرچەندیشە ئێستا هۆیەکانی چارە سەرکردنی ئەم لایەنە بە هۆی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا زۆر گۆرانی بەسەرا هاتووەو ڕێبازی نوێی تیادا بەکاردێ بەڵام لەبەر ئەمەی ئەم پیشەیە وەکو نوشتەو کشتەك شتێکی جا دووگەری نیەو بەڵکو ئەنجامەکەی بە بەر چاوەوەیە . تاوەکو ئێستا بەیتار زانەکانی کورد ژیانی دەیان کەسیان لەئاخو داخ ڕزگار کردووەو قاچو دەستی چەندان کەسیان لە ژانو ئازاری ناو جێو بالینگان هەڵاو وێردووە بۆیە هەر کاتێك لەم لایەنەوە شتێ دەرببردرێ پێویستە زۆر بە شانازیەوە باسی بەیتارە پسپۆرەکانی کورد بکرێو ژیان نامەیان بخردرێتە سەر کاغەزوو وێنەو بیروو ڕاو کرداریان لە مۆزەخانەکان بپارێزرێ ئەمەش ئەرکێکە دەکەوێتە ئەستۆی ڕۆشنبیرانی کوردو ئەمانەی دەرك بە گرنگی ئەم لایەنە دەکەن بۆیە پێویستە هەرکەس بە گوێرەی شارەزایی لە ناوچەی خۆی بەژیان نامەو کردارو بیروو ڕاکانی بەیتار زانەکان لە ناوچەکەیا دەستی یارمەتی بۆ دەوڵەمەند کردنی کەلەپووری نەتەوەکەی درێژ بکا کە هەم خزمەتی گەلەکەی دەکاو هەم خزمەتی مرۆڤایەتیش دەکا بۆیە ئێمەش لێرەدا زۆر بە شانازیەوە ناوی چەند بەیتار زانێکی دەشتە بەپیتو فەرەکاکی بە کاکی‌یەکەی هەولێر دەخەینە ڕوو کە لەمانە هەندێکیان ماون هەندێکی تریشیان ماڵ ئاواییان لەژیان کردووە بێ ئەمەی هیچ شتێك لە دوایان جێ بهێڵنێو ئاسەواریان ڕەشبۆتەوەو ئاگردانیان کوێربوەتەوە لەمانەش :

١ – حاجی حمد امین لە گوندی قەپران نەماوە

٢ – عمر کێخو علی لە گوندی شێراوە نەماوە



٣ – ڕەحمان لۆری لە گوندی قونیان نەماوە

٤ – حاجی عمر لە گوندی کلاوورەش

٥ – حاجی حسن لە گوندی کۆزە پانکە ماوە

٦ – حاجی عمر کاکە لە گوندی دینگاوەی دەشتی قەراج . ماوە

٧ – قادر حەمبار لە هەولێر . ماوە

هەورەها جگە لەمانە لەوانەیە هی تریش هەبێ بەڵام ئێمە بەرچاوو گوێمان نەکەوتبێ بۆیە دەرخستنی ئەمانە دەکەوێتە ئەستۆی ئەمانەی ناوبانگو دەنگو باسیان دەزانن . . ئیتر لێرەوە بەرەو ناوەڕۆکی بابەتەکە دەڕۆین بەڵام پێش ئەمەی بە تەواوی بخزێینە ناوی دەمەوێ کورتە پێناسەیەکی بەیتاری بکەم ، بەیتاری خۆی برێتیە (لەم پیشەیەی کە یەکێکی شارەزا پێی هەڵدەستێ بۆ چاك کردنەوەی شکستی لە لەشی مرۆڤ یاخود ئاژەڵ) شکستی‌یەکانیش بە زاراوەی سەر زاری بەیتار





زانەکان ئەمانەن :

١ - شکان
٢ - لەگەڵ چوون یان لە دوو چوون
٣ - قەرەشتن
٤ - دەمار وەرگەران
٥ - گۆشت پچڕان

ئەگەر ئەمانە لە هەر شوێنێکی لەش ڕوویبدابوایە ئەوا لە لایەن بەیتار زانەکانەوە چارەی خۆی بۆ دادەنرا بەگوێرەی لێك دانەوەو بیرو بۆچوونی خۆیان . ئینجا لێرەوە بابزانین تاچ ڕاددەیەك ئەمە چەسپ دەبێ ئەگەر شکستێیەك لەم جۆرە بابەتانە ڕوویبدابوایە . بۆ ئەمەش بەڕیز دیاردە گرنگەکانی ئەم لایەنە دەخەینە ڕوو .

١ - **گۆزینگ** :-

شکان لەم جۆرە شوێنە کەمە بەزۆری لەگەڵ چوون لێ‌یا ڕوودەدات لەگەڵ چوونیش بریتیە لە ترازانی دوو جومگە لەسەریەك . کەنیشانەکانیشی بەمجۆرەیە . پەنجەکان ناتوانن بجولێن ، دەمارەکانیش هەڵدەستن‌و ئەستوور دەبن . چارەکردنیشی بەمجۆرە بۆ دانراوە . نەخۆشەکە لەسەر پشت درێژ دەکرا پی‌دەخرایە ناو قوڕتی پیی‌ی تاوەکو نەجوولێ ئینجا بەهێز سپلکی قاچی ڕادەکێشرا لەگەڵ ئەم ڕاکێشانە جومگەکان تەقەیان لێوە دەهات‌و دەگەڕانەوە شوێنی خۆیان وەك لە وێنەی (١) دیارە .

٢ - **کلاوەی چۆك** :-

بەووتەی بەیتارەکان ئەم شوێنەی (گە) پێ‌ناشکێ واتە دوو جومگە بەیەکەوە بەسترابن . ئەمەش بەتەواوی لە ئەژنۆ داهەیە چونکە دوو جومگە بەهۆی کلاوەی چۆکەوە بەیەك بەستراون . بۆیەبە زۆری لەگەڵ چوون لەم جۆرە شوێنانە ڕوودەدات واتە دوو جومگەکە لێك دەترازێن . لەکاتێکیش ئەم جۆرە شکستیە ڕووبدات لەشوێنی‌وا بەم شێوەیە چاری کراوە . نەخۆشەکە لەسەرزگ درێژ دەکرا بالۆرەیەك لەشێوەی بالیف بە پارچە پەڕۆکان بۆیان دەکرد . دەخرایە نێوان هەردوو جومگەکان یەکێکیش ڕانی دەگرت بۆئەوەی نەبزوێ . ئینجا بە توندی لاقی بۆ دواوە دەنووشتایەوە بەم جۆرە جومگەکان دەهاتنەوە شوێنی ئاسایی خۆیان لەگەڵ ئەم کردارە تەقەیان لێوە دەهات .

٣ - **ڕان** :-

هەروەك دەزانین ڕان گەورەترین‌و بەهێزترین ئێسکی لەشی مرۆڤە . بۆیە ئەگەر هەرئێش‌و ئازارێکی زۆری پی‌بگا ئەوا لەوانەیە بەتەواوی مرۆڤ پەك بخاو لە کاروکاسبی دوری بخاتەوە ، بە ڕۆڵی ئەوەی شوێنێکی گرنگ‌و ترسناکی هەیە زۆر جار وابووە ئەگەر شکستی لەمجۆرە شوێنانە ڕوویدابوایە ئەوا ئەم کەسە تووشی سەقەتی دەهات‌و تازەکوو ژیانی کۆتایی دەهات بەدەست ئەم بێزاریە دەتلایەوە بەلام لەگەڵ ئەوەشا بەیتارزانەکانی کورد بەرانبەر ئەم ئاستەنگیە

ستەو ئەژنۆ دانەنیشتوونو بەڵکوو چاری خۆیان بۆ دانوە .

زنین چۆن ؟ ئەگەر ڕانبشکابوایە ئەوە شوێنەکەیان
ووسابوون زۆر بەپاکی دەشۆرد ئینجا چوار پەلە داریان
هێنا بەشتێك دەیان تاشی تا بەتەواوی ڕێك دەبوو بۆئەوەی
وەك ئەشکەنجە بە نەخۆشەکە بگەیەنیٚ زۆر جار پەلە
میشیشیان بەکاردەهێنا . ئینجا لەسەر گازیپشت درێژیان
کردو کارەموویان لەهەرچوار دەوری ڕانی دەئالاند لەپاشا
نە دارەکانیان لەسەر کارەمووەکە دادەناو بەتوندی دەیان پێچا
پەڕۆکی سپی . لە دووای ئەمە دوو توورەگەی باریکی پڕ
خۆڵیان دەهێنا دەیانخستە ئەم لاو ئەو لای ڕانە شکاوەکەو بە
نێك یان هەرشتێکی ترکە بۆ ئەم جۆرەکارە بشایە دەیان بەستا
ئەمە بۆ ئەوە بوو تاوەکو جوولەی نەکا بەم جۆرە دەمایەوە
ماوەیەك . زۆرجار وادەبوو لەم ماوەیە سەری پەنجەکانو
قچی ئەستوور دەبوون ئەمەش لەبەرئەوەی گەرم دادەهات بۆ
ئەمەش ئاوی ساردیان بەکار دەهێنا بەسەری پەنجەکانیان
دادەپرژاند بۆ ئەوەی بنیشێتەوە . پێویستە ئەمەش بگوترێ
کەبەستانی شوێنە شکاوەکان چ لە ڕانو چ لە شوێنەکانیتر
دەبوایە پاش هەفتەیەك تۆزەك شلبکرابوایەوە لەپاش چواردە
ڕۆژ بە زەریفی واتە بە تەواوی شل دەکرایەوە هەروەها دەبوایە
ئەم کەسە هەتا دووسێ مانگ کارنەکات .

## ٤ - **نێك** :-

هەروەك وتمان ئەم شوێنانەی جومگەیێ
شکانی کەمە . لێرەوەش ئەمە هەیە چونکە .
جومگەی ڕان دەچێتە ناو قۆرتی سمت جومگەیەك
پێك دێنی پێی دەڵێن (شەقوڵگە) بۆیە بەزۆری لەکاتی
ئازارگەیشتن بەم شوێنە واتە نێك . لەگەڵ چوون روو دەدات



ئەمەش دوو جۆری هەیە . (جۆرێك بۆ سەرەوە) (جۆرێك بۆ خوارەوە) ئەگەر بۆ سەرەوە بێ ئەوا جومگەکە لە شوێنی خۆی دەردیٚو بۆ سەرەوە دەڕوا لەم حالەتە بەم شێوەیە چاری دەکرا . نەخۆشەکە بە پێوە ڕادەگیرا . ئینجا یەکێکیتر ئەمیش هەربەپێوە قاچی دەخستە سەر قاچە لە دوو چووەکە . ئینجا هەردووکیان لەیەك دەپێچرانو نەخۆشەکە دەستی دەخستە سەرشانی زەلامەکەیتر ئەمیش دەستی دەخستە بن هەنگڵو باڵی . بەتوندی ڕایدەتەکاند بۆ سەرەوە ئەو حەلە جومگەکە قرپەی لێوە دەهاتو دەگەڕایەوە شوێنی خۆی ئینجا قیرپوزفتی لێدەنرا بۆ ئەوەی ژانەکەی بشکیٚ . هەروەك لەوێنەی ژمارە دوو دیارە .

بەلاٚم ئەگەر بۆ خوارەوە بهاتابوایە ئەم کاتە قاچێکی لە قاچێکی درێژتر دەبوو بەم شێوەیە بە ئاسانی هەستی پیٚدەکرا .

چاریشی ئەمەبوو بەڕاستو ڕاستی درێژ دەکرا یەکێك سواری ئەژنۆی دەبوو توند دەیگرت نەوەك بزویٚ . ئینجا سیٚچوار پێلەقەی بەتوندی لەژێر قاچی دەدرا لەگەڵ ئەم لێدانە جومگەکە دەگەڕاوە شوێنی خۆی ئەوسا قیروو زفتەکی لێدەنرا بۆ ئەوەی ژانی بشکیٚ لە پاشا بەخۆی بەری دەدا .

ئەگەر بەم شێوەیەش جومگەکە نەگەڕابوایەوە شوێنی خۆی ئەم کاتە هەردوو ئەژنۆمان لێك دەپێچاو پێستێکی مەڕ یا بزن دەهێنرا دەخرایە ناوگەڵیەوەو پڕی هەوا دەکرا لەگەڵ ئەم هەوایە هەردوو لایێکی لێك دەکشاو جوگمە لەگەڵ چووەکە دەگەڕایەوە شوێنی خۆی .




**٥ – پەراسوو :**

هەروەك ئاشكرایە دەفەی سنگی مرۆڤ چەند ژمارەیەكی پەراسوو تیایە كە ژمارەیان دەگاتە (٢٤) پەراسوو ئەمانە جووت جووت بە (١٢) بڕبڕەكەی ناوچەی سنگەوە جومگاون لەدواوە بەڵام (١٤)ی پێشەوە بە هۆی پارچە كڕكڕاگەی بچووكەوە یەكسەر بەدەفەی سنگەوە بەستراون . ئینجا زۆر جاربووە بەهۆی كاریگران یان شتی قورسی‌كەوتن . هتد . . ئەم پەراسووانە شكاون لەكۆنیش ئەگەر پەراسوو بشكابا تەنیا چاری ئەوەبوو قیروو زفتەكیان لەشوێنە شكاوەكە دەنا تاوەكو یەكتری دەگرتەوەو ژانی دەشكا . بەڵام پێش ئەوەی قیروو زفتەكەی لێ بنرێ دەبوایە بە جوانی بە ئاوی شلەتێن‌و سابون بشۆردرێ .

**٦ – دەمار لە پشت وەرگەڕان :–**

ئەمە تەنیا لە پشت ڕوونادات بەڵكو لە شوێنی تریش وەك مل‌و پشتی پێ‌و هتد . . . نیشانەكانیشی ئەوەیە نەخۆشەكە بەخواری دەڕوا ئەگەر لەپشتی بێ . لە ملیش هەروایە خواردەبێتەوە هەست بە ئازار دەكا چارەكردنیشی لەكاتی خۆی



بەم جۆرە بووە . ئەگەر دەماری لەپشت وەرگەڕابوایە ئەوا كابرایان لەسەر زگ درێژ دەكرد قاچێكی دەخرایە سەر ناوەندی پشتی ئینجا بە پێچەوانەوە قاچێكی لای ڕاستی لەگەڵ دەستێكی لای چەپی دەگیراو بڵند دەكرا واتە بەیتارەكە قاچ‌و دەستەكەی بۆلای یەكتری ڕادەكێشا بەم جۆرە دەتەقی‌و دەهاتەوە شوێنی خۆی وەك لەوێنەی ژمارە سی‌دا دیارە .

بەڵام ئەگەر دەماری مل بوایە ئەوا تەنیا بەگرتن چاری دەكرا هەروەها جگە لەمەش زۆر جار وابووە گەیەكانی پشت لەیەك ترازاون یان چوونەتە ناو یەكتری بۆ چاری ئەمە دوو بەرمیل یان هەرشتێكی‌تر كە بە قەدەراپی ئەم دوو بەرمیلە بەرزبوایە بەڵام نەك ئەم بەرمیلە گەورانەی نەوتی یان گازی بەڵكو هی لەمانە بچووكتر هەیە دەیان هێنا دارێكیان لەسەر ڕایەر دەكرد واتە درێژ دەكرد ئینجا نەخۆشەكەیان زگاوزگ دەخستە سەردارەكە بەڵام نابوایە دەستی بگەیشتابوا سەر زەوی ئینجا بەیتارەكە پشتی مل‌و قونە جوڵەی توند دادەگرت لەگەڵ ئەم داگرتنە گەیەكان واتە بڕبڕەكان تەقەیان لێوە دەهات‌و دەگەڕانەوە شوێنی خۆیان ئەمەش هەروەك لە وێنەی ژمارە چواردا دەردەكەوێ .

**٧ – مل :** هەروەك دەزانین مل شوێنێكی كاریگەری لە لەشی مرۆڤ بەركەوتووە جابۆیە هەر ئازارێكی پێ‌بگا ئەوا بە زەحمەت چاك دەبێتەوە .

(شوێنی دانانی بالیف)

بەزۆریش ئەم شوێنانەی مل كە شكستی‌یان لێ‌ڕوودەدا (كلیلەی ملە) ئەم كلیلەیەش لەبەرئەوەی ناسكە دەشكێ . لەكۆنیشا ئەگەر شكستی لەم شوێنە ڕووی بدابوایە بەم جۆرە چاریان دەكرد بالیفێكیان بە پەڕۆك دروست دەكردو دەیانخستە بن باڵی نەخۆشەكە بۆ ئەوەی لەگەڵ جێگە شكاوەكە یەكسان‌بێ‌و قوڵی زۆر نەیەتە خوارەوە نەوەك ئازاری پێ‌بگا . ئینجا قیرو زفتەكیان لە جێگە شكاوەكە واتە كلیلەی مل دەدا



ـوەکو ژانی دەشکا

٨ - **پیل** :

ئەمە ئێسکێکی سێگۆشەی تەختە پێی دەڵێن «دەفە» کە دەکەوێتە دیوی پشتەوەی لەش ، بۆشاییەك لەبەیەك گەیشتنی ئێسکی دەفەو چەڵەمە هەیە پێی دەڵێن (سەرەوتە چاڵ) کە ئێسکی بازووی دەچێتەوە ناو واتە جومگەی بازوو . ئینجا زۆرجار وادەبێ بەهۆی ئازار گەیشتن بەم شوێنە ئەم جومگەیە لەشوێنی خۆی دەترازێو لەگەڵ دەچێ . شکانیش بۆیە لەم شوێنە روونادات چونکە ئێسکی دەفە پانە . واتە پیل لە کاتێکیش ئەگەر ئەم جومگەیەی چووەتەوە ناوی لەشوێنی خۆی ترازابوایە . ئەوا بەم جۆرە چاریان دەکرد . کابرایان لەسەر گازی پشت درێژ دەکرد بەیتارەکە پاژنەی قاچی دەخستە بن باڵی نەخۆشەکەو توند دەستی بۆ خۆی ڕادەکێشا . بەم کارە جومگەکە دەهاتەوە شوێنی خۆی .

٩ - **هەنیشك** :-

هەروەك دیارە ئەمە بریتیە لە شوێنی بەیەك گەیشتنی هەردوو سەری ئێسکی بازوو و باسك کەبەهۆی جومگەکانی سەریانەوە دەجومگێن و بەیەك دەگەن . لەبەرئەوەی ئەم جورە جێگایانە «گەنە» واتە شوێنی بەیەك گەیشتنی دوو جومگەن ، شکان کەم تیایا ڕوو دەدات تەنیا لە هەڵوێستی زۆر ناخۆش نەبێ . بۆیە بەزۆری ئەم دوو جومگانە لەیەکتری دەترازێن و لەگەڵ دەچن . چاری ئەم جۆرە شکستیانەش تەنها ڕاکێشانە تاوەکو جومگەکان دێنەوە شوێنی خۆیان . هەروەها ئەگەر شکستی لەم جۆرە شوێنانە رووبدات تاماوەیەکی زۆریش نەهێنرابێتە لای بەیتار . ئەوا بەم شێوەیە چاریان کردوە . پێشەکی دەبوایە ماسییەکی بێنن بەبێ هیچ دەست لێدانێك وورد ووردی بکەن بەڵام ماسی رووبار نەك هی ئەم لاو ئەولا . ئینجا لە شوێنەکەیان دەنا پێوەی دەمایەوە بۆ ماوەی (٢٤) کاتژمێر . بەم جۆرە شوێنەکە نەرم دەبۆوە ئەوسا نەخۆشەکەیان لەسەرگازی پشت درێژ دەکرد بەکێك توند بازووی دەگرت تا نەبزوی بەیتارەکەش دەستی وەیاخود بڵێین مەچەکی دەگرت و بۆ خۆی ڕادەکێشا بەم جۆرە جومگە لە شوێن ترازاوەکان دەهاتنەوە شوێنی خۆیان .

١٠ - **باسك** :-

لە دووئێسکی درێژ پێك دێت پێیان دەوترێ (زەندوکورە) زەند درێژەکەیانە دەکەوێتەلای پەنجەکانی دەست ئەویتریشیان دەکەوێتە لای پەنجەی گەورە . بەڵام بەیتارەکان بەم هەردوو ئێسکە بەیەکەوە دەڵێن (شەپکە) .

لەوانەشە هەردووك لەشەپکەی داربچن بۆیە وای پێ بڵێن ئینجا زۆر جار وایە ئەم ئێسکانە دەشکێن ئەمەش دوو جۆری هەیە ئەگەر ڕاست و ڕاست واتە بەدرێژی شکا ئەوا تەنیا (قیرو زفتی) لێ دەنێن . بەڵام ئەگەر بەجۆرێکیتر شکا کە پێی دەڵێن (گردەبر) ئەوا گرتنەوەی دەوێ هەروەك بەیتارەکان دەڵێن . شێوەی گیرانەوەکەشی بەم جۆرەیە . لە پێشا شوێنەکە بە ئاووسابون دەشۆرێ لەدوایدا بە دەست پیا هێنان ئێسکەکە دێنینەوە شوێنی خۆی و (کارەمووی) لەسەر دادەنێین واتە مووی کاری لەدوایدا بە پەڕۆکێکی سپی خاوێن دەیپێچین ئینجا چوار پەلە داری چاك کراو دەهێنین بە بەن سەرەکانیان دەهۆنینەوە بەڵام دەبێ تۆزێ بەینیان هەبێ واتە نابێ هەرچواربە تەنیشت یەکەوە بن بەتەواوی دەیان خەینە سەر شوێنە شکاوەکەو ئەم سەرو ئەو سەریان گرێ دەدەین و دیسانەوە بەشتێك دەیپێچین . ئەمە نابێ دەستی لێ بدرێ تا ماوەی (١٥-٢٠) ڕۆژ بەڵام ئەگەر ئەستوور بوو یان ژانی کرد ئەوا لە پاش هەفتەیەك تۆزەك شل دەکرێتەوە هەروەها بە هەمان شێوە ئەگەر ئێسکی (بازوو)ش شکا چارە دەکرێ ئەمیش کارەموو لەگەڵ پەلەداری بۆ بەکار دێنین

١١ - **زەنگە** :-

ئەمە پێی دەڵێن (مەچەك) کە لە هەشت ئێسك پێك هاتووە دەبێ بەدوو ڕیز هەر ڕیزێکیش چوار ئێسکی تیایە . ئەمانە لەگەڵ یەکتر و لەگەڵ ئێسکەکانی تەنیشتیانەوە بەهۆی

چەند بەستەرێك بەیەك دەگەن بەشێوەیەك كە جوولەی هەریەكەیان ئاسان بێت . بۆیە لەم شوێنە شكان كەم ڕوو دەدات تەنیا لەگەڵ چوون نەبێ ئەمیش بەم شێوەیە لە لایەن بەیتارەكانەوە چاری بۆ دانراوە یەكێك هەنیشكی توند دەگرت تاوەكو نەجوولێ ئینجا بەیتارەكە دەستێكی دەخستنە ژێر زەنگەیەوە بە دەستەكەی تری پەنجەی دەستی دەگرتو بۆ خوارەوەی ڕادەكێشا بەم جۆرە ئێسكە لەگەڵ چووەكان دەگەڕانەوە شوێنی خۆیان . هەروەها بەم شێوەیە ئەگەر پەنجەكانی دەستو پێ لەگەڵ چووبان ئەوا بەڕاكێشان دەهێنرانەوە شوێنی خۆیان . بۆ نموونە ئەگەر پەنجەی گەورەی دەست لەگەڵ بچووبایە ئەوا بەم شێوەیە بەیتارەكان دەیانگەڕاندەوە بۆ جێگەی خۆی . بەنێكیان لە پەنجەكە دەخستو دەستێكیان دەخستە سەربەنەكە ئینجا ڕایان دەكێشا جارێك بۆ خوارەوە جارێك بۆ سەرەوە تاوەكو دەتەقی بەم جۆرە چاك دەبۆوە . . . .

لەكۆتایی ئەم باسە پێویستە ئەمە بگوترێ كە بەیتاری تەنها مرۆڤ ناگرێتەوە بەڵكو ئاژەڵو مەڕومالاتیش دەگرێتەوە لەبەرئەمەی بەیتارەكان چارەسەری شكستییەكانی ئەمانیشیان كردووە .

### فەرهەنگۆك

شێلگیری : بەردەوامی
قریە : تەقە
گە : شوێنی بەیەك گەیشتنی دوو جومگە
ڕایەر : درێژ ، ڕایەركردن درێژكردن . ڕاخستن
كارەموو : مووی كاریلەی بزن . ئەمە لەبەر نەرمییە كاردەهات .
جومگە : جوگمە . بەگوێرەی جیاوازی ناوچەكان دەگۆڕێ

**تێبینی** :–

ئەم زانیاریانەی لەم بابەتە خراونەتە ڕوو دەربارەی بەیتاری هەمووی لەسەر زاری بەیتار (حاجی عمر كاكە) لەگوندی دینگاوەی دەشتی قەراج لە گەلاوێژی ١٩٨٥ تۆماركراوەو كۆكراوەتەوە كە تەمەنی (٧٠) ساڵ دەبێ .

هەروەها سودیش لە كتێبی مرۆڤو تەندروستی پۆلی سێی ناوەندی وەرگیراوە .

# كولتووری

نوسینی :


**ئەكادێمیك – یو – ڤ – بڕەملێی و ر . گ . پەرۆلنی**

**رشاد میران – لە ڕووسییەوە وەریگێڕاوە**


**● بەشی یەكەم ●**

**پێشكەی :**

ووتەیەكی بە ناوبانگی ئەتنۆگراف ناسەكان هەیە ، دەڵێ : «ئەگەر تەنها یەك میللەت بناسیت ، ئەوا ئەو میللەتەش ناناسیت .» .

ئەمەش زۆر ڕاستە ، چونكە لە كاتی دیراسەكردنی میللەتانی تردا ، ئەو كەسە ، یەكسەر ئەكەوێتە بەراوكردنی لایەنی جۆراوجۆری ژیانو مێژووی ئەو میللەتانە لە گەڵ میللەتەكەی خۆیدا . جا لە ڕێڕەوی ئەم بەراوەردكردنەدا زانیارییەكانی دەربارەی میللەتەكەی خۆی دەچەسپێنو بەهێزتر دەبن .

میللەتی كوردیش ، هەرچەندە تاكو ئێستا خۆی پێویستی بە دیراسەكردنو لیكۆڵینەوە هەیەو زۆر لایەنی مێژوویی خۆی ڕوون نەبۆتەوەو كونو كەلەبەریان تیا ماوەتەوە ، لە گەڵ ئەوەشدا . كاتی ئەوە هاتووە ، كە زاناو ڕۆشنبیرانی كورد لەو مەیدانەشدا – واتە دیراسەكردنی میللەتانی تر – ئەسپی خۆیان تاو بدەن . ئەوەش پێش هەموو شتێك ، بە مەبەستی زیاتر زانینو ناسینی میللەتی خۆیان .

دیاردەیەكی ئەتنۆگرافی زۆر بەنرخە ، كەلای ئێمەش دەست دراوەتە لێكۆڵینەوە لە ئاینە میللییە كوردییەكان – یەزیدیو كاكەیی – و گەلێ لایەنی تری ئەتنۆگرافیای كوردی . ئەم هەنگاوە گەلێ پیرۆزتر دەبوو ، ئەگەر ئاورێكیش لەو

# میللەتانی جیهان لە روانگەی ئەتنۆگرافناسەکانەوە

میللەتانەی کە لەناو ئێمەدا دەژین بدرابایەوە ، وەکو : ئاسوری ، تورکمان ، ئەرمەن ، . . هتد . لەم ڕووەوە ئەتوانرێ گەلێ شتی کولتووری کوردی لەناو ئەوانو هەروەها هی ئەوان لەناوکوردوا دیاری بکرێن . ئەم جۆرە باسانە ، جگە لەوەی بەشداری کردنێکە لە روونکردنەوەی مێژووی گەلانی‌تر . لە هەمان کاتیشدا ئەتنۆگرافیای کوردی زۆر بەرەوپێش دەبەنو بێ‌گومان ، خزمەتێکی بێ هاوتاشە بۆ زانست بە گشتی .

ئەم ووتارە ، یەکێکە لەو ووتارانەی کە لە کتێبێکدا بە ناوی (لە روانگەی ئەتنوگرافیاوە) مۆسکو ، لە ساڵی ١٩٨٢دا چاپ‌کراوە . ئەم ووتارەم بۆیە هەڵبژارد ، چونکە جگە لە تامو چێژی باسەکانی ، هەروەها زایناری زۆری دەربارەی میللەتانو گروپەی ئەتنۆگرافی جیاجیای جیهان تیایە ، کە پێویستە ئێمەش بیانزانینو ئاشنایان‌بین . ئەم دوو زانایە ووتارەکەیان لەبەر رۆشنایی رۆشنبیریو پسپۆری خۆیاندا نووسیوە ، بۆیە نە سەرچاوەیان بەکار هێناوەو نە هیچ پەراوێزێکیان بۆ کردووە . جگە لە هەندێ روونکردنەوە لە نێو کەواندا — بۆیە بە ناچاری پەراوێزەکان ، بەنیازی روون کردنەوەی زۆر شتی ناو ووتارەکە بۆ خوێنەری کورد ، خۆم کردوومن . جا ئەگەر لە کاتی وەرگێراندا ، هەندێ ووشە یا ناو ، وەکو لای خۆمان باوە ، وا دەرنەچووبن داوای لێبوردن دەکەمو بە ژیری خوێنەری بەرێز پشت قایمم .

* وەرگێر *

ئەتنۆگرافیا — (لە یۆنانی کۆنەوە وەرگیراوە ، ئەتنۆس — واتا میللەت — ، گرافیا — واتا نووسین) ، زانستێکە دەربارەی میللەتانی جیهان دەدوێ . گەلێ بیروڕای جیاواز دەربارەی ئەرکو بابەتی لێکۆڵینەوەی ئەتنۆگرافیا هەن ، زۆر لە ئەتنوگرافە برژوازی‌یەکان لایان وایە کەوا بابەتی بنەڕەتی ئەتنۆگرافیا ، زیاتر میللەتە بێ‌نووسینو دواکەوتووەکانن . ئەمەش تەنیا دیاردە کۆنینەکانی ئەو میللەتانە ئەگرێتەوە . ئەم زانستەش لەو کاتەوە پەرەی‌سەند ، کە کۆلۆنیالیستە ئەوروپایی‌یە بۆرژوازیەکان دەستیان دایە دیراسەکردنی میللەتە نائەوروپایی یەکان ، کە زۆربەیان نووسینو ئەدەبی نووسراویان نەبوو . بۆیە ئەتنۆگرافیایان بەرامبەر بەزانستی مێژوو ڕاست‌کردەوە .

مێژوو وەکو زانستێك سەیردەکرا ، کە بە پشت بەستن بە سەرچاوە نووسراوەکانەوە دیراسەی میللەتە (مێژوو ییەکان) دەکات . لە بەرامبەر ئەوەش ئەتنۆگرافیا لەو میللەتانەی کە پێیان دەگووتن (نامێژوویی) دەکۆڵێتەوە . بەڵام زۆر دەمێکە ئەو بیرو باوەڕەی دەربارەی میللەتانی (مێژوویی‌و نامێژوویی)[1] ڕەت کراوەتەوە . ئێستاکە لەناو پسپۆرانی ئێمەو دەرەوەی وۆلاتدا (بە تایبەتیش لەووڵاتە سوشیالیستەکاندا) ، وەکو زانستێك دەربارەی میللەتان لە هەموو قۆناغەکانی

پێشکەوتنیاندا ، دان بە ئەتنۆگرافیا دانراوە . ئەمەش واتەگەیەنێ کە بابەت (مەوزوع)ی ئەتنۆگرافیا لە هەموو شوێنێکی ئەم زەمینەدا هەیە ، لە بارەی زەمانیشەوە ، هەر لە کۆنترین کۆمەڵگاکانی ئادەمیزادەوە تا ڕۆژی ئیمرۆ دەکەوێتە ناو قەوارەی لێکۆڵینەوە زانستی ئەتنۆگرافیاوە . ئەوەی پێش هەموو شتێك سەرنجی ئەتنۆگراف ناسەکان ڕادەکێشێ ، کولتوورو[2] ژیانی ترادیتسیۆنی میللەتانە چونکە بە تایبەتی لێرەدا خسوسیەتی جۆری ژیان دەردەکەوێ . جا لە مەدایە ڕوانینی تایبەتی ئەتنۆگراف ناسێك بۆ بابەتی لێکۆڵینەوەکانی — واتا لەبەر ڕۆشنایی خاسیەتی تایبەتی ئەتنیکی (میللی)دا سەیری بابەتەکە دەکات .

ئەم خاسی‌یەتە تایبەتی‌یە ئەتنیکیانە ، کە لە ڕێڕەوی مێژووداو زۆر جاریش بەکارتی‌کردنی سروشتو دەوروبەر دروستبوونو لە جۆرەها لایەنی ژیانی مادی‌و مەعنەوی‌دا دەردەکەون . لێرەدا زۆر جێگەی خۆیەتی باسی (ئیگلوو) — خانووی لە بەفر دروستکراوی ئەسکیمۆییەکان — بکەین . ئەسکیمۆییەکان[3] سەربەخۆو بەبێ کارتی‌کردنی خەڵکی‌تر ، توانیویانە گوومبەت بۆ خانووەکانیان دروستبکەن ، (گوومبەت — شانازی شارستانی‌یە کۆنەکانی ناوچەکانی ڕۆژهەلأتی دەریای سپی ناوەڕاستە) . بۆ دروستکردنی (ئیگلوو) پارچە بەفر لەسەر یەکتری دائەنرێن ، تاوەکو کەوانەی سەربان تەواوئەبێت . ئینجا بۆ قایم‌کردنی دیوارەکانی لەناو ئیگلوودا بەزی سەگی دەریا لەناو بەردە ئاگردانێکدا ئەسووتێنن ، ئەو بەفری سەرەوەی دیوارەکان ئەتوێتەوەو دوایی بە هۆی بایەکی ساردەوە ، ئەو بەفرە تواوە دیسان ئەیبەستێتەوەو ئەبێتە یەك پارچە شەختە . بەم جۆرە هەموو پارچە بەفرەکان بە یەکەوە ئەنووسێنو وەکو یەك پارچە بەردیان لێ‌دێ . بە چەند ڕۆژێك (ئیگلوو)ەکە زۆر توندو قایم ئەبێت . (بەزی سەگی دەریا ، لای ئەسکیمۆییەکان ، بۆ سووتاندنو ماڵ گەرمکردنو ڕووناككردنەوە بەکاردێت) . چوونە ژوورەوە بۆ ناو ئیگلوو ، بۆ میللەتانی‌تر ، دیاردەیەکی سەیرە (ئەگەر ئەو میللەتانەی کە خانووەکانیان لە بەن دروستکراوون ، لێ‌ی دەرچێ) ، ئەویش لە توونێلێکەوە کە هەر لە بەفر لێدراوەو بەژێر زەمیندا دەرواتو لەناو ئیگلووەکە دەردەچێ .

ئێمە ناتوانین بڵێین کەوا ئیگلوو خۆشو فەرەحە . بەرزایی دوو مەتر ، بەرینایشی ٣—٤ مەتر دەبێت ، وەکو ئاسایی دوو خێزانی تێدا دەژین . بەلأم ئەم تەنگەبەرییە هەروا لە خۆیەوە نی‌یە ، بەڵکو بۆ پاراستنی گەرمایی‌یە . خۆ لە کاتی پێویستو گەر خۆیان حەزبکەن ، ئەتوانن ئیگلوو تا ١٢ مەتر فراوان بکەن . کەرەستەی دروستکردنی ئیگلوو — واتا بەفر — هەتا بڵێ‌ی زۆرە . بە هاوینانیش هەر لەناو ئیلگوودا دەژین . خانووی بەفر هەروەکو چۆن گەرمایی لە ناو خۆیدا دەپارێزێ هەروەها دەشتوانێ فێنکایی هەر بمێنێ ، (هاوینە لە گرینلاندیادا گەلێ کورتو فێنکە) . دەرگای هاوێنی ئیگلوو لە دیواردا دەکرێتەوەو بە زەویەکەوە نووساوە . دیوارە لە بەفر دروستکراوەکان تیشکی ڕۆژیان لێوەوە ئەچێتە ژوورەوە . ئەشتوانرێ دیوارەکە کون بکەنو پارچە شەختەیەکی تەنکی وەکو پەنجەرەی تێ بخرێ ، بەلأم ئەمەیان دیاردەیەکی تازەیەو لە خانووی ئەورووپاییەکانەوە وەرگیراوە .

ئیگلوو — لە ڕابردووی کۆندا چۆنبووە ، کەس بە تەواوی نازانێت . بەرای ئەرکیولۆگەکان ، خانووی لە بەفر دروستکراو ، کەمو کوری زۆرنو ناتوانێ بۆ ماوەی سەدەیەك خۆی بگرێ . بەلأم هەر لە زانیاریەکان ئەرکیولۆگی‌یەوە ، زانیومانە کەوا خەڵکی کۆنی سیبریا خانوویان لە ددانی ماموتو هەروەها لە پەلەکانی نەهەنگ دروستکردووەو بەپێست بەیەکیانەوە بەستوونەتەوە .

خانووی دوو نهۆمی ڕووسەکانی باکوور کە لە لقی دار دروستیانئەکرد ، زۆر باش لەگەڵ باری سروشتی‌و پێویستیەکانی کشتوکاڵ‌دا دەگونجا . گونجان لە گەڵ باری سروشتی‌دا هەروەها لە خانووە تەقلیدیەکان‌دا بەدی دەکرێ ، بۆ نموونە وەکو ، خانووەکانی هەندێك لە میللەتانی میلانیزیاو

میکرۆنیزیا[٤] کە لە پەت دروست دەکرێن . خانووی سەر ئاوی (لای هەندێ میللەتانی خوارووی رۆژهەلاتی ئاسیا) . هەروەها ئەو مالانەی کە دەگوێزرێنەوە وەکو ، یورتاو چوومی ، تاپی[٥] (لای میللەتە کۆچەرەکانی ناوەراستی ئاسیاو سیبریاو هیندیەکانی پریری)[٦] ، خانووی مینارە (کۆشك) – لای میللەتانی قەفقاس ، هەندێ لە عەرەبەکان ، هەندێ میللەتانی ئەفغانستان) .

خاسیەتی ئەتنیکی ، هەروەها ، لە هەندێ کولتووری مادیدا ، وەکو خواردن ، دەردەکەوێت . هەموو میللەتێك چێشتخانەی تایبەتی خۆی هەیە . ئەتنۆگرافی شارەزا لە کاتی لێکۆلینەوەیدا لە باری ژیانی میللەتێکی نەناسراوەوە ، رەچاوی ئەم مەسەلەیە دەکات . ئەتنۆگرافناسەکان لێکۆلینەوەکانیان لە خواردنی رۆژانەو جەژنانەی تایبەتی میللەتەکەوە دەستپێ‌دەکەن . هیچ گفتوگۆ لە سەر مەسەلەی چێژ ناکرێ ، ئەوە شتێکی مێژوویی‌یەو تا رادەیەکی زۆریش سروشت‌و دەوروبەر کاری تێ دەکات . بۆیە ، ئەبینین کەوا ئەو میللەتانەی کشت‌وکالێ پیشەیانە (بۆ نموونە – سلاڤی‌یەکان)[٧] ، ئەساسی خواردنیان بەرهەمی کشت‌وکالی‌یە . بۆ میللەتانی مەروماڵات بەخێوکەرو هەروەها میللەتانی راوکەر – ئەساسی گۆشتە . ئەو میللەتانەی کە بە جۆرێکی سەرەکی راوە ماسی پیشەیانە (وەکو – ناناتیسیەکان ، نیڤخی ، ئولگی)[٨] – ئیختیۆ فاگن[٩] ، واتە ماسی خۆرن .

لە هەمان کاتیشدا زۆر لە میللەتان گاڵتە بە جۆری خواردنی میللەتانی‌تر دەکەن . لە گەلێ ناوچەکانی چین‌و یاباندا ، تا ماوەیەکی کەمیش پێش ئێستا ، شیرو بەرهەمەکانی شیریان لە چێشتەکانیاندا بەکار نەدەهێنا . مەنگۆلی‌و تیبێتیەکان‌و زولوسەکانی[١٠] ئەفەریقیا ماسی ناخۆن‌و بەلایانەوە بە کەڵکی خواردن نایێت .

سیبریا ، گەلێ دەوڵەمەندە بە کوارگ ، بەلام میللەتە رەسەنەکانی سیبریایی[١١] تەنها یەك جۆری بە ناوی (موخۆمۆر) – ئەویش وەکو نەرکۆتیك – بەکاردێنن . زۆربەی میللەتانی هیندستان گۆشتی گا ناخۆن ، هەروەها موسولمانەکان‌و هیندۆسەکان گۆشتی بەراز ناخۆن . لەلای هەندێ میللەتانەوە هەتا ئەو نزیکانەش گۆشتی سەگیان بەلاوە زۆر بەنرخ‌و بەلەزەت‌بوو (بۆ نموونە ، پۆلینیتریەکان دەیانخوارد)[١٢] .

ناکرێ هەموو حەزلێ‌کردن‌و بێزلێ‌کردنەوەی خواردەمەنی روون بکرێتەوە ، فەرموو ، ئیستاش لە رۆژهەلاتی چین‌و لە یاباندا ماسی مادەیەکی سەرەکی خواردەمەنی‌یانە . لە یاباندا زۆر چێشتیان هەر لە ماسی خاو ئامادەئەکرێن . کەچی چینیەکان تەنانەت ماسی باش سوێرکراویش (بەخاوی) ناخۆن . چێشتخانەی چینی پێ دادەگرێ لەوەی کە هەر خواردنێك ، پێش ئەوەی بکەوێتە ناو دەمی مرۆڤ ، ئەبێ بە ناو ئاگردا تێپەری – واتا بە ئاگر ئامادە بکرێ .

لە زماندا ، وەکو لایەنێکی کولتووری ، تایبەتی‌یەتی میللەتان زۆر بە روونی دەردەکەوێت . راستە ، زمانی واهەن کە چەند میللەتێك قسەی پێ‌دەکەن بەلام لە گەڵ ئەوەشدا ، هەر میللەتێك فۆنۆتێك‌و بناغەی فەرهەنگی‌و هەتاکو گراماتیکی تایبەتی خۆی هەیە ، (بۆ نموونە – جیاوازی لە بەکارهێنانی زمانی ئینگلیزی لە ئینگلتەرەو ئەمەریکاو ئوستورالیادا . زمانی ئیسپانی ، لە ئیسپانیا ، شیلی ، مەکسیك ، کوبا . . هتد . زمانی عەرەبی ، لە شێوەکانی سوریا ، میسر ، جەزائیر . . هتد) . لێرەدا گرنگ ئەوەیە کە هەر میللەتەو بە زمانی تایبەتی خۆی قسە دەکات . بۆیە جیاوازی زۆر لە نێوان زمانەکاندا هەیە . لە ناویاندا هەیە کە زیاتر لە ٤٠ حالەتی ئیعرابی هەیە . وەکو لە زمانە قەفقاسی‌یەکاندا[١٣] ، زمانی واش هەیە کە هەر ووشەیەکی لە یەك کەرت زیاتر نی‌یە . لە هەندێ زماندا هەر رستەیەك بە یەك ووشە دەژمێردرێت – بە ووشەیەکی لێکدراوی دوورو درێژ ، بەلام هەر یەك ووشەیە .

لە زمانی هاوایی‌دا[١٤] بە هەمووی حەوت دەنگی نابزوێن (ساکن) هەیە ، لە زمانی سەئامەکاندا[١٥] ژمارەیان ٥٣یە . لە

زمانی یابانیدا هەموو ووشەیەکی ئالۆز (کۆمپلێکس) ئاوازی تایبەتی خۆی هەیە . زمانی واش زۆرن کە هەموو حەرفێکی تۆنو بەرزایی خۆی هەیە .

جیاوازی لە نێوان هونەری میللەتانی ئەم سەر زەمینەدا یەکجار زۆرن . جیاوازییەکانیش بە رادەیەکن ، کەوا مەترسی لەوە دەکرێ ، میللەتان سەریان لە هونەری یەکتری دەرنەچێ . مرۆڤی ئەورووپایی پێویستی بە خۆ ئامادەکردنێکی زۆر تایبەتی هەیە ، بۆ ئەوەی بزانێ چی لەسەر شانۆی بە ناوبانگی یابانی (نۆ) روو دەدات . لێرە ، تەنانەت زانینی زمانی یابانیو هەتا شارەزایی جۆری ژیانی رۆژانەو خووو رەوشتی یابانیش بەهانایەوە نایێت . بۆ ئەوە ، هێشتا مرۆڤ ئەبێ بزانێ ، هەر بزوتنەوەیەکو هەر ئیشارەتێك چ هەستو مەبەستێکی پاڵەوانەکەی سەر شانۆ دەردەبرن ، هەروەها ئەبێ بزانێ دەمامكو جلو بەرگیان چ مانایەك دەبەخشن . بە هەمان جۆر ، یابانییەك گەر پێش ئەوە هیچ باڵێیەکی ئەورووپی یا ئەمەریکی نەبینیێ ، لە کاتی سەیرکردنی باڵێی رووسی بە ناوبانگ ئەرکێکی زۆر گرانی ئەکەوێتە ئەستۆ ، هەرچەندە – بێگومان – تۆزێ سووکترە لە ئەرکی ئەورووپاییەکە – تەماشاکەری شانۆگەری یابانی .

بزووتنەوەکانی سەماکەری باڵێ ، راکردن بەسەر پەنجەی پێیەکانیو سوورانەوەی بە دەوری خۆیدا . . . هەمووی بە مەرجو مانایە .

هەروەکو لە زماندا ، یەك مانا بە چەندها ووشە دەردەبرێ ، لە باڵێشدا بە بزاوتی دەست یاقاچ ئەتوانن جۆرەها مانای پێ دەربرێ . هەروەها ئەو میزاجەی کە سەمای پێوە دەکرێ ، ئەمیش دەورێکی باڵا دەبینێ . بۆ روون کردنەوەی مەسەلەی سەماکردن لەلای میللەتان ، جێگەی خۆیەتی ئەم ووتانەی گۆگۆل بێنینەوە ، کە دەڵێ :

(ئیسپانی وەکو سوێسریو سکۆتلاندیو ئەڵمانی شایی ناکات ، هەروەها شایی رووسەکان وەکو هی فەرەنسیو خەڵکی ئاسیانییە . تەنانەت لە ناوچەکانی یەك دەوڵەتدا سەما دەگۆرێ . رووسەکانی باکوور سەمایان وەکو هی سلاڤییەکانی خوارووو پۆڵۆنیو فینلاندیەکان نییە ، هەندێ سەما گفتوگۆی تێدا دەکرێ ، هەندێکیش بێ هەستو نەستن ، زۆریان بە جۆشو هاتو هاوارن ، لەسەر خۆو هێمنیش زۆرن ، سەما هەیە قوورسەو هی ئاسانیش هەیە) .

لە مۆسیقاشدا ، جیاوازی ، گەر زیاترنەبێ کەمترنییە . لە رۆژهەڵاتی ئاسیاو لە ئۆقیانۆسدا ، لە جیاتی حەوت نۆتە ، تەنها پێنج هەیە .

لە زۆربەی وولاتانی ئەورووپادا گۆرانی بە کۆمەڵ (کۆرس) زۆر باوی هەیە ، تیرۆلیەکان ، کە لەسەر سنوری ئیتالیاو نەمسادا دەژین ، بە ناوبانگن بەو گۆرانییانەی کە لە قورگەوە دەگوترێن . لە تۆڤادا[١٦] گۆرانی دوو دەنگ هەیە ، واتە یەك گۆرانی بێژ بە دوو دەنگ گۆرانی دەڵێت . چەند ساڵێك لەمەوبەر گۆرانی بێژی پیرۆیی (ئیما سۆماك) ،لە ئەورووپاو ئەمەریکای سەرووودا ناوبانگی دەرکردو گۆرانییەکانی دەنگیان دایەوە . ئەم ئافرەتە دەنگ خۆشە ئەی توانی دەنگی خۆی بگۆرێت لە دیسانتەوە بۆ باس ، واتە ، لە بەرزەوە بۆ قووڵ . . . لەم گۆرانییانەدا گۆرانییە کۆنەکانی ئەمەریکی رەنگیان ئەدایەوە .

هەروەها ئامێری مۆسیقا بە جیاوازییەوە بەسەر ناوچە مێژوویی کولتوورییەکانی[١٧] جیهاندا دابەش دەکرێن . ئامێری ژێیی و هەوایی ، تایبەتن بە ئەورووپاو بەشێکی فراوانی ئاسیا . بۆ سەرووی ئاسیا ، بەشێکی زۆری ئەفەریقیاو رۆژهەڵاتی خوارووی ئاسیا – ئامێری کوتان جێگەی یەکەم دەگرێتەوە ، وەکو – دمبك ، دەف ، ناقوس ، زەیلەفۆن ، گیتاریش لە ئەمەریکای لاتینەوە بە هەموو جیهاندا بڵاوبووەوە .

لە جوانی گەیشتن ، ئەویش لە نێوان میللەتاندا زور جیاوازە . گەلێ لە خێڵە سەرەتاییەکان لووت ، پالیۆ ، یاخود گوێ خۆیان کون کردووەو (لە جیاتی گیرفان !) بەکاریان هێناوە . لە زۆر ناوچەی سەر ئەم زەمینەدا ، جاران خەڵك

ڕەخنەگرانە سەیری لەش‌ولاری خۆیان دەکردو بە نیازی جوانترکردنی ،هەوڵیان دەدا بیگۆڕن . دانیشتوانی کۆنی دەشتەکانی خوارووی وولاتی ئێمە – سەرماتەکان[١٨] ، هەر بە جۆرێك رایان لە شکلی سەری خۆیان نەبوو . زانایە ئەرکیۆلۆگەکان ، لە کاتی هەڵکەندندا سەرو کەللەی سەیریان دۆزیوەتەوە هیچ ناوچاوانێکی راست‌یان نی‌یەو هەر وەکو تۆپ خڕن .

هەر تەنها سەرماتەکان وانەبوون ، ئینکەکانیش – کە شارستانی‌یەتێکی گەورەیان لە پیرۆدا هەبووو پیساروی ئیسپانی بە ناوی‌برد – سەریان دوو پارچە بووو بە یەکەوە دەیان بەستنەوە ! هەندێ لە خێڵە هیندی‌یەکانی مەکسیك ، ئێمرۆش بە ئانقەست سەری خۆیان درێژکوولە دەکەن . ئایا ئەمە دەکرێ ؟ بەڵێ . ئیسقانی سەری منالّ نەرمەو ئەتوانرێت بە هەموو شێوەیەك دەق پێ بگیرێت . ئینکەکان سەری منالەکانیان بە قایشێکی تایبەتی رادەکێشا ، هیندی‌یە مەکسیکیەکانیش بە دوو پارچە تەختە سەری منالەکانیان دەگوشن . رەنگە ئەم جۆرە کارانە بۆ ئەوە بووبن ، کە خەڵکی خۆیان لە خەڵکی تری دراوسێ‌یان جیابن ، لەم مەزەندەیە زیاتر ، زانست بۆ هیچی تر ناچێت .

رەش‌کردن ، یارەنگ‌کردنی ددان ، لە لای زۆر لە میلەتانی ئەفەریقیاو خوارووی ئاسیادا هەیە . ئەم میللەتانە ، خۆیان ،ئەم شتە روون دەکەنەوەو دەڵێن : ئێمە وادەکەین بۆ ئەوەی جیاوازی‌یەکمان لەگەڵ درندەو جانەوەرە ددان سپی‌یەکان‌دا هەبێت .

هەر میللەتێك‌و بە جۆرێك بیر لە جوانی دەکاتەوە . ئێمە لامان سەیرە ، کە لە هەندێ شوێندا باوی لووت کون‌کردن هەر ماوەو (یاخود تا ئەم نزیکانەش هەر مابوو) ! . بەلاّم لامان زۆر ئاساییە ، کە گوارە لە گوێ‌یە کون کراوەکانی کچە هاوسێکانماندا دەبینین . لووتیش هەروا ، نەوەکو هەر کون ئەکرێ ، بەڵکو لەلای هەندێ خەڵکی وەکو خێڵەکانی بوشمان[١٩] ، مالایی[٢٠] ، مائوری[٢١] لە رابردوودا ، تەنانەت لووتی منالەکانیان بە ئانقەست بە دەم‌و چاویانەوە پان دەکردەوە . ئەوا ووتمان ئاسیاو ئەفەریقیا دوا کەوتوون ، ئەی چی بەوە بلێین کە لە فەرەنسا ، لە سەدەی شازدەهەمدا دەرکێشانی لووت باوبووو لووتی درێژو قووڵنگیان لا زۆر جوان نەبوو – ئەرکی دایك‌و دایانەکان‌بوو ، کەوا بکەن لووت بەسەر دەم‌و چاوەوە دیاربێ .

لە گەلێ شوێن ملی کورتیان پێ ناشرین‌بوو . لە جۆرجیا منالەکانیان وا لەناو لانك دەنا ، کە سەریان لە پیلەکانیان نزمتربێت‌و بەم جۆرە ملیان درێژتر دەبوو . ئەم عادەتە تاماوەیەکی درێژ هەر مابوو . لە رۆژهەلاّتی ئەفەریقیادا هەندێ خێڵ هەن ، کە ملی ژنەکانیان ، بە ئانقەست تا رادەیەکی لە خەیالّ بەدەر درێژ دەکەن – بە دەیەها سانتیمەتر ، بە هۆی ملوانکەی تایبەتی‌یەوە دەیکەنە ملی کچەکانیان‌و سالّ بە سالّ ملوانکەی زیاتریان دەکەنە مل .

زۆر لەو عادەتانە گۆڕینی شێوەی لەش ، لە سەر جۆری ژیانی میللەتان وەستاوە . بۆ نموونە ، قاچی خوار بۆ کۆچەرەکان بە کەڵك‌ترە ، چونکە باشتر لە لەشی ئەسپ گیر دەبێ . جاران لە ناو لانکی کەڵمیکەکان‌دا[٢٢] شتێکی تایبەتی بە جۆری رەحەتی ، بۆ لێك‌کردنەوەی لاقی منالەکانیان ، هەبوو . بوریاتەکانیش[٢٣] ، پەرۆ یا پێستیان لە بەینی لاقی منالەکانیان‌دا ، بۆ هەمان مەبەست ، دادەنا . چی‌ناکات دایك ، بۆ ئەوەی منالەکەی گەورە بێت‌و جوان‌بێت ! .

لە یۆنانی کۆن‌دا بە پێچەوانەوە ، قاچی راستیان لا جوان بووو شتی تایبەتی‌یان ، بوراست‌کردنی قاچی منالەکانیان ، هەبوو . مائورەکانی دانیشتوانی رەسەنی نیوزیلاندیا ، بۆ ئەوەی قاچی منالەکانیان راست‌بێ ، لە ئەژنۆیان دەدان . هەروەها زنجیەکانی ئوسترالیاش زۆر بایەخ بەو مەسەلەیە دەدەن . لێرەدا ئەو عادەتە کۆنەی چینی‌یەکانمان دێتەوە بیر ، کە پێ‌ی کچەکانیان توون دەبەستەوە بۆ ئەوەی زیاد لە (٨–١٠سم)

گەورەتر نەبن . لای هەندێ لە خێڵەکانی ئۆقیانووس ، شکاندنی چەند ددانێکی کچەکانیان باوەو . . زۆری تریش .

خۆ ، ئەشێ مرۆڤ شوێنێکی لەشی خوارێ یا تێك بچێ بێ ئەوەی خۆی بیەوێ . زۆر میللەت لانکی ڕەق بەکار دێنن ، سەری منالیش ئەوەندەی بەسە ، کە بخرێتە سەر شتێکی ڕەقەوە ، بۆ ئەوەی شێوەکەی بگۆڕێت .

دەربارەی هەندێ لە خووو ڕەوشتی مایەکان لە مەکسیکی کۆندا ، (ر .ڤ .کینژالۆف)ی ئەتنوگراف ناس دەڵێ : « تازە دایك کە حەزی ئەکرد کچە ساواکەی جوان بکات ، بە ئامۆژگاری دایکانی ، شارەزاتر ، دوو پارچە تەختەی بە نێو چاوانو پشتی سەری منالەکە بۆ چەند ڕۆژێك ئەبەستەوە ، بەم جۆرە نێوچاوانی منالەکە تەخت ئەبووو ئەمەش نیشانەی جوانی بوو . هەر بە مەبەستی ئارایشت کردنی ، تۆپێکی لاستیکی بچووکیان بە قژی سەری کچۆلەوە ئەبەستەوەو تالای چاوەکان شۆڕ ئەبوویەوە . چاوی منالەکە هەر بە دوای تۆپەکەدا ئەگەڕاو لە ئەنجامدا کچە خێل ئەبووو ئەمەش ، لای مایەکان ، یەکێك لە نیشانە هەرە گرنگەکانی جوانی بوو» .

ئەوروپایی و ئەفەریقایی ، هەروەها لە ڕۆژئاواو خوارووی ئاسیادا[٢٤] ، هەر لە کۆنەوە گۆرانی بە چاوی گەورەی دڵدارەکانیاندا هەڵدەلێن . بەلام لە ڕۆژهەلاتی ئاسیادا ، بە جۆرێکی تر سەیری جوانی چاو دەکەن . ئەو قاسیدە چینییانەی بۆ لای ئیمپراتۆرەی رووسی ، ئانا یوئا نوڤنا نێردرابوون ، واقیان لە جوانی کچی ئیمپراتۆرە – ئێلیزابێت (ئیمپراتۆرەی دواتر) و ڕمابووو بە جۆرێکی ڕۆژهەلاتییانەی پڕ لە ڕۆمانتیکیەتەوە دەریان بری ، کەوا ئێلیزابێت ئەگەر چاوەکانی بچووکتر بوونایە ، بە جوانییەکەی خەلکی شێتو هار دەکردو لە ناوی دەبردن . .

جیاوازی زۆر لە ژیانی خێزانیو مەسەلەی ژن هێنانو هەروەها لە عیبادەتو پەرستندا ، لە نێوان میللەتاندا بەدی دەکرێت ، شانبەشانی خێزانی مۆنۆگامیا (کە تەنها لە ژنێكو مێردێك پێك دێت) ، هەتا ئیستاش لای گەلێ میللەتان خێزانی پۆلیگامیا (مێردێكو چەند ژنێك) ، هەروەها خێزانی پۆلیئاندریا (ژنێكو چەند مێردێك)یش هەن[٢٥] . لە لای هەندێ میللەتان ژن هێنان بە زۆرە ملیو سەپاندنبوو – وەکو لە دەولەتی ئینگەکانی پیرۆدا (کە ئیسپانیەکان لە سەدەی شازدەدا لە ناویانبرد) ، هەموو لادێییەك مافی ئەوەی هەبوو ، هاوبەشی ژیانی خۆی بدۆزێتەوە ، بەلام گەر تا تەمەنێکی دیارکراو کەسی دەست نەکەوتبایە ئەوا پیاوێك یا ژنێکیان – وەکو هاوبەشی ژیان – بۆ دیاری دەکرد .

لە هیندستاندا ، کچی بێمێردنییە ، تەمەنی لە بیست ساڵ تێپەڕی بێ . گەر کچ بەبێ مێرد بمێنێتەوە ، بۆ دایكو باوکی عەیبێکی گەورە دەبووو لایان وابوو پاش مردنیان خوا سزایان دەدات . بۆیە لەم حاڵەتانەدا زۆر کەس ئەبن بە قوربانی – واتە هەتا خوا سزای کەس نەدات . جا هەر وەکو عادەتە باوکی کچە داخوازی لە باوکی کوڕەکە دەکات .

لە کاتێکدا لە ڕووسیای زراعیدا ، مێرد بەبێ یارمەتی ژن کاری جووتیاری پێ نەدەکرا ، لاوان خوا خوایانبوو کە ژن نەهێننو بۆ خۆیان هەر رابوێرن . کچەکانیش ئاواتیان ئەوەبوو کە ئەو وەزعەی لە گۆرانییەکاندا پێ دەگوترا (کچی ئازاد) هەر درێژە بکێشێ ، بەلام بۆکوێ دەچیت ! پێویستی ئابووریو عادەتیش بخەرە سەر .

زەماوەندیش جۆراوجۆرە . لای هەندێ میللەتان (وەکو لای خێلەکانی پوونان لە دوورگەی کالیمانتان)[٢٦] بۆ ژنهێنان . ئەوەندە بەسبوو ، کە کوڕو کچەکە لەبەر دەم ڕدێنسپی خێلەکە داوای یەکتری بکەن . لەلای هەندێکیتریش (خێلی کۆشی لە ئەفغانستان) بەزمو هەرای زەماوەند دوو ڕۆژو دوو شەو درێژە دەکێشێ . لەلای هەندێ لە میللەتانی هیندستان هەشت شەوو هەشت ڕۆژە . شان بە شانی ئەمانەش ، لای زۆربەی ئەوروپییەکان بۆ زەماوەند ، تەنها نزیکترین خزمو ناسیاو کۆ دەبنەوە ، کەچی هەندێکیتریشی (وەکو لە

نەقفاس ، هەتا ماوەیەکی نزیکیش ، زەماوەندی بێ بووكو ـوا دەگێردرا . بە پێ‌ی ئەم عادەتە ، نە دەبوایە بووكو زاوا لە ـەماوەندی خۆیان ئامادەبن .

هەروەها ، عیبادەتی جۆراوجۆر لە جیهاندا گەلێ زۆرن . ـە ناو خێڵەکاندا ، منالێ کە گەورە دەبێو دەگاتە دەوری ـوەتی ، لە ئەوروپایی سەدەکانی ناوەراست ، کە شاگرد دەبوە وەستا ، نەجیب زادەکانی فەرەنساو سامۆرای یابانی (ئەوەش هەر لە سەدەکانی ناوەراستدا) کە دەبوونە شەرکەی تەواو ، ئەمانە هەمووی ئاهەنگو عیبادەتی تایبەتی‌یان بۆ دەکرا ، مردنو لە دایك بوونیش بە هەمان‌جۆر . پەرستن هەندێ شێوەی ئاهەنگ بە چرکە گرنگەکانی ژیان ئەبەخشێتو هەندێ شتی نا ئاسایی ئەچەسپێنێت . لە کۆمەڵگای مەشاعی‌دا شان بە شانی ئەوەی کە عیبادەت پڕ بووە لە ئەفسانەو خەرافەت ، زۆر جارانیش سیحربازی تیا بەکار هێنراوەو رۆژانە بۆ ئەم جۆرە پەرستنە ، چەند سەعاتێکی گەرەكبووە .

خوێ دان بە گامێش ، بەلای هەموومانەوە شتێکی ئاسایی‌و زۆر ئاسانە . بەڵام پیاوێکی خێڵی تۆدا[٢٧] (لە هیندستان) هەرگیز بە خەیاڵی‌دا نایێت کە بەبێ ئاهەنگو عیبادەتێکی تایبەتی‌و دوورو درێژ ، کەس بتوانێ خوێ بە گامێش بدات .

عیبادەتەکانی ئیتالیای کاتۆلیك — هەتا ئەم نزیکانەش — لەهی خێڵە هیندیەکە کەمتر نەبوون ، واتە ئەبوایە لە رۆژێکا چەند جار نوێژ بکرایەو زیارەتی کەنیسەو خزمەت کردنی رەچاو بکرایە .

هیندۆسی (هیندۆیزم) ، ئیمرۆکە ئایینی سەرەکی هیندوستانە ، رۆژانە بە عیبادەتی گرانو سەخت چەند سەعاتێك وەختی هەر یەکێك لە پەیرەو کەرانی ئەم ئاینە دەبات . ژمێردراوە ، کە لەم وولاتەدا رۆژانە سەدەها ملیۆن سەعات بەم کارانەوە بە فیرۆ دەروات . لە ناو ئەم عیبادەتانەدا ، هەندێ شتی جوانیش هەن . بۆ نموونە — ئافرەتی هیندی ، هەموو بەیانی‌یەك لەبەر دەرگای ماڵی خۆی‌دا « بە خۆڵێ رەنگاورەنگ نەقش‌و نیگاری سەیر دروست دەکات .

پەروەردەکردنی مناڵیش لە نێو میللەتاندا جیاوازە . زۆر لەم یاساو خووو رەوشتانەی منالێ پەروەردەکردن سروشتێکی قۆناغی (مرحلی)یان هەیە جا ، بابزانین ئەم خووو رەوشتانە لە کۆمەڵگای مەشاعی‌دا هەبوون ؟ لە یەکەم چاو پیاخشاندندا — لامان وایە کە هەرگیز نەبوون . لای ئەوروپاییەکان باو نەبووە مناڵەکانیان سزابدەنو رێگەیان دەدەن هەموو شتێك بکەن . کەچی ، ئەو ئەوروپایی‌و ئەمەریکیانەی لەناو ئەسکیمۆییەکاندا دەژیان ، زۆریان لاسەیربوو کە ئەرکی زۆر کەوتۆتە سەر شانی مناڵەکانیانو دایكو باوك رێگەیان دەدەن یاری زۆر ترسناك بکەن ، کە مەترسی تیاچوونیانی تیاهەبێ . لە ناو خێڵی مایووچی (لە خوارووی ئەرجەنتین) لە رابردووی کۆندا ، بەبێ قسەلێ‌کردن هەموو جۆرە داخوازیەکی مناڵی چوار ساڵانە جێ‌بەجێ‌دەکرا ، هەتا ئەگەر ویستبای خانووەکەیان بگوێزنەوە ، بەڵام بە هەر جۆرێك بێت ، لە حەوت ساڵی‌دا ، مناڵە هیندیەکە ، هەروەکو ئەسکیمۆییەکە . ئیشکەرێکی باشی لێ دەردەچوو . لێرەدا وەختە بڵێین . کەوا وەسیەتەکانی پەروەردەکردنی هیندوستانی کۆن جێ‌بەجێ دەکرێن . هەتا پێنج ساڵی وەکو شا سەیری منالێ بکە ، دواین هەتا پازدە ساڵی وەکو خزمەتکار ، پاش پازدە ساڵی بە یەك چاو وەکوخۆت» . بەڵام لە کۆمەڵگای مایووچی‌دا ، نە خزمەتکارو نە شا هەبوون ، بەڵکو هەموویان یەکسان‌بوون . بەڵام یەکسانی ئەندامانی خێڵ ، خۆی لە خۆی‌دا سەرکەوتنی پەروەردەی مەشاعی دابین ناکات . هەموو ئەندامانی مەشاعیەت هەست دەکەن کە زۆر بەهێز بە مەشاعی‌یەتەکەیانەوە بەستراونەتەوە . بێ‌گومان هەریەك لە ئێمەیش هەست بەو پەیوەندی‌یە بە هێزی خۆی لەگەڵ خێزانو وولاتی خۆی دەکاتو ئەوەش کارێکی زۆر دەکاتە سەر هەڵسو کەوتی ئێمە . لە گەڵ ئەمەش ، وەکو یەکێتی ئادەمیزادی کۆنو

کۆمەڵگا مەشاعی یەکەی خۆی نی یە . مارکس ئەم یەکێتی یەی بە هەنگ‌و شانەکەی شوبهاندووە .

لەناو خێڵدا ، یەکێتی ژیان‌و یاساو خووو رەوشتەکانی لە هەموو شتێ گرنگ‌ترو سەرەکی ترن . ئەمانە هەمووی ئەبێ بە نەوەکانی داهاتوو بسپێردرێن ، ئەمەیە ئەرکی سەرەکی پەروەردی خێلایەتی . جا لێرە – واتە ، لە کۆمەڵگای مەشاعی دا – نە لە منالّ دەدەن‌و نە بە سەریشیان‌دا دەقیژێنن . گەلێ لە هیندی‌یە (بەربەریە)کانی ئەمەریکای سەروو ، گەورەترین سزدانی منالّەکانیان ئەوەبوو ، کە دایك یا باوك لە دەمی‌یەوە ئاو بە دەم‌و چاوی منالّەکەی‌دا دەکرد (لێرە ، مەبەست تف‌کردنی‌یە . وەرگێر) ، ئەمەشیان کەم‌دەکرد ، دەترسان ، جاری وا هەبووە منالّەکە لە داخان‌دا خۆی کوشتووە . رەنگە بلێن ، کەوا هیندیەکان سەرجەم بەرگەی ئازار ناگرن ؟ بێ‌گومان نا . ستوونی ئازار دانتان بیر دەخەینەوە ، کە دیلەکانیان پێوە دەبەستەوەو خەڵکی بە ئارزووی خۆیان دەبوون بە جەللاد . رەنگە ، هیندیەکان بەگشتی ، باش‌بن لە گەلّ منالّەکانیان‌دا ؟ نەخێر . ئەنستێکەکان دەولەتیان هەبوو ، کەچی زۆر دلّ رەقانە سزای منالّەکانیان دەدان . بۆ نموونە ، سەریان دەخستە ناو چرە دووکەڵەوە .

لە پۆلینیزیا ، ئەفەریقیای ناوەراست ، مەدەغەشقەر ، هەروەها لەسەر خاکی ئاگرین‌دا[٢٨] – لەو شوێنانەی کە هێشتا کۆمەڵگای مەشاعی بوون ، منالّەکانیان سزا نەدەدان . تەنانەت هەندێ جاران ، لە کۆمەڵگای چینداریش (طبقي) هەر وەك قۆناغی مەشاعی هەڵسوکەوت‌و رەفتار لەگەلّ منالّ‌دا دەکرا . ئیستاکەش ئەم پەیوەندی‌یە مەشاعی‌یە ، دەربارەی هەڵسوکەوت لەگەلّ منالّ‌دا ، لە یاباندا – وەکو دیاردەیەکی زۆر دەگمەن – هەر ماوە . لە هیندوستان ، منالّ هەتاکو پازدە سالّی ئەبێ خزمەتکاری دایك‌و باوك‌بێت ، جا چ جۆرە هەڵسوکەوتێك ، لە دەوری کوێلایەتی‌و دەرەبەگی‌دا ، لەگەلّ خزمەتکاردا دەکرا ، هەموومان باش دەیزانین ، ئەبێ مەبدەئەکانی پەروەردەکردنی مەشاعی چی‌بن ؟ لە تەمەنێکی دیارکراودا منالّ کاروباری ئەکەوتە سەرشان‌و توانای بەجێ نەهێنانی ئەو کاروبارانەی ، لە رادەی نەتوانینی مێش هەنگوینێك بوو لە شانەکانی خۆیدا ، منالّ بەشێك‌بوو لە مەشاعیەت کە لێ‌ی جیا نەدەبووەوە . لەناو ئەو مەشاعی‌یەتە بچووکەدا ، کە هەموو شتێك‌و هەموو کەسێك لەبەر چاوبوو – منالّ زۆر باش هەستی بەوە دەکرد کە نابێ شتی نارەوا بکات . گەورەکان کەم لە بەینی خۆیان‌دا تێك دەچوون ، هەروەها منالّانیش دەمەقالّیان نەدەبوو . شەریان نەدەکرد . بە هێزی‌و ئازایەتی خۆیان لە راوکردنا بەدیار دەخست ، یان لەم جۆرە یاریانەدا : منالّان بەریزە پەنگریان دەخستە ناو لەپیان ، کێ زیاتر رای گرتبا ، ئەوا ئەو دەیبردەوە .

لە تەمەنی خۆناسین‌دا ، هەر مێرد منداڵێك – لە زۆر شوێنیشدا هەر کچێك – بە تاقی کردنەوەدا تێ‌دەپەرین . تاقی کردنەوەیەکی سەیرە ، بۆ وەرگرتنی ئیجازەی گەورەبوون – واتە بالّغ‌بوون . پرۆگرامی ئەم تاقی‌کردنەوەیە لەمانە پێك‌هاتبوو : خۆراگرتن لەبەردەم ئازاردانا ، برسی‌کردن‌و تینووکردن بۆ ماوەیەکی زۆر ، توانینی نان پەیدا کردن‌و . . . هەموو منالّێك دەیزانی کە ئەم تاقی‌کردنەوانەی لەپێشە ، ئەگەر تیایاندا دەرنەچێ ، شتێکی زۆر ترسناك چاوەرێ‌ی دەکرد – هەموو ژیانی ئەبوایە بە جلی منالّی ، یا جلی ژنانەوە بباتە سەرو هیچ دەنگ‌و رەنگێکی لە کۆبونەوەکانی خێل‌دا نەدەبوو .

لە هەموو شوێنێك ، ئەم تاقی‌کردنەوەیە بۆ کچان ئەبوو ، بەلام لەو شوێنانەی کە هەبوو ، ئاسان‌ترنەبوو لەهی کورەکان . چەند مانگێك یاچەند سالّێك ئەبوایە تیشکی رۆژ نەبینن‌و لە تاریکایی‌دا بژین ، بە هەفتە برسی‌یان دەکردن‌و ئەبوایە چەند رۆژێکیان بە تینویەتی ببردایەتە سەر . لەم جۆرە تاقی‌کردنەوانەدا یاساکانی خێل بەنەوە تازەکان دەسپێردران‌و لە ژیاندا بەیەکجاری دەچەسپێن . چی جێگەی ئەم جۆرە داب‌و نەریت‌و پەروەردەیەی گرتەوە ؟ .

چیرۆكێكی فۆلكلۆری

# هەمی تشت دبوورن بەلێ مرن نابورت

رمضان حجی قادر

هەبوو نەبوو كەسێ ژ خودێ مەزنتر نەبوو كەسێ ژ بەنیا درەوینتر نەبوو ، دبێژن دوو زەلام برایێد ئێك بوون ، برایێ مەزن خودان زاروك بوو ، ژیانا وان گەلەك باش بوو ، ئو دۆستەك هەبوو هەر جار جار دچوو سەرا ددا ئو لحالێ وان د پرسی . بەلێ دنیا دەورانە سال بورین رۆژ بورین هەردوو برا گەلەك هەژارو بێ چارە بوون ، برایێ مەزن گۆتە برایێ بچویك من بفروشە ئو بچویكێد من پێ بخودان بكە . برایێ بچویك گۆتێ تۆ من بفروشە ، ئو تۆ و بچویكێد خوە لدەڤێك بن و بۆ خوە پێكڤە بژین . برایێ مەزن رابوو برایێ خوە برە مەیدانكێ ئو فروت . خوین مێژەكی كورك كری ئور برە مالێ . فراڤین دایێ و بۆ شەق شیڤا خوە خار . سپێدێ زوی تێشت دایێ و گایێ خوەژی تێشت كرو نیرك و هەڤجار دەینانە سەر ملێد كوركی و گایێ خوە دا بەرێ خوە دا ناڤ جووتی . . . زەلام رابوو كورك لگەل گای گرێدا و نیرك دەینا سەر ملێد هەردووكا ئو هەڤجار بدویڤ ڤەكر دا جوتی پێ بكەت . كوركی گۆتێ :-

ما دێ جوتی بمن كەی ؟! !

زەلام :- پانێ من تۆ بێ كری ، چ شولێ من بڤێت دێ بتە كەم .

زەلامی دەست هاڤێت كێلانا زەڤیێ ئو بۆ قارە قارا وی لگەل گای و كوركی ، دوستێ كوركی هات .

دوست :- ها برا چ حالە ؟ !

كورك :- دێ بورت .

بو ئێڤار حاكمێ دەڤەرێ لگەل هندەك رێبەرو خلمەت كارا دەركەت بوون بۆ سەیرانەكێ . . . هەكەر حاكمی چاڤ بەڤی جووتی كەتی . . كو كورەك و گایەك یێد لبەر سینگێ زەلامەكی . و بێ جوتی پێ دكەت حاكمی گۆتە ئەوان كەسێد لگەل . دا خوە نێزیكی ئەوی جوتێ هە بكەین . . . هەكەر چوینە دەڤ

حاكم : شەڤ زەحمەتا .

زەلامی بەرسڤا وان دا .

حاكم : تۆ بۆچی جوتی بڤی كوركی د كەی ؟ !

زەلام : من بێ كری .

حاكم : تە بچەندێ كریە ؟

زەلام : بـ (هندە) زێرا .

حاکم : «ئەو» زێر دانە کابرای و گۆتە کورکی تۆ دێ لگەل من هێی . . . دێ لناڤ کوچکێ شولکەی .

کورك بۆ چایچی و چاگێراند لناڤ کوچکێ . . . روژەکێ دوستێ وان هات . . بەرێ خوە دایێ کورك یێ چایێ د گێرینیت لناڤ کۆچکا حاکمی .

دوست : چ حالە برا ؟

کورك : دێ بوورت .

سالێ بوورین دەمەکی حاکم مر . . . خەلکێ باژێری تەیرکێ دەولەتێ هلاڤێت . . . دادا سەر سەرێ کورکی . . . کورك بۆ حاکمێ باژێری و حاکم لباژێری و دەڤەرێ هەمیێ کر . هەیامەکێ کێم بووری . دوستێ وان هات کوچکێ بەرێ خوە ددەتێ کورك یێ بویە حاکم .

دوست : برا چ حالە ؟

حاکم «کورك» : دێ بوورت . تە ئەز و برایێ من دیتین خەنەکێ باش . پاشی تە ئەم دیتین گەلەك بێ چارە . پاشی تە ئەز دیتم دەمێ ملێ من و گای پێکڤە لبەر سینگێ جوتکاری . پاشی تە ئەز دیتم چایچی لکوچکا حاکمی . لێ بەلێ ئەو هەمی بوورین . ئەڤە تۆ یێ من دبینی ئەز حاکمم . لێ ئەوژی دێ بوورت . چەند سالەك بوورین حاکم نەساخ بوو بنەخوشیەکا پیس . . . . دوستێ وی هات سەرادا . . . هەکەر بەرێ خوە ددەتێ حاکم زۆر یێ بێ چارەیە .

دوست :- برا چ حالە ؟

کورك «حاکم» : هەمی بوورین . لێ بەلێ ئەڤە نا بووریت .

حاکم مر . و چوو بەر دلوڤانیا خودێ مەزن .

هزار رەحمەت لدەیبابێت خوێندەڤانا .

**تێبین :**

ئەڤ چیروکە هاتە وەرگرتن ژ زار دەڤێ ئەحمەدێ ئوسمانێ خەنکێ گوندێ قومرێیە لدەڤەرا بەرواری بالا . ژیێ وی نێزیکی ٥٠ سالە یە .

# بالۆره

**ئەحمەد شادی**

**قەلادزێ**

**١٩٨٤**

بالۆره . . . بریتی‌یە لەو دەنگ‌و ئاوازەی کە لە گەروی مرۆڤەوە دێتە دەرەوە . بەهۆی لێدانی دەست‌و پەنجەوە . لەخوار چەناگەوە تاکۆتایی‌مل بەسینگەوە . بەهۆی هەڵبرینی دەنگەکە بەسەدایەکی خۆش . پەنجەی دەستیش رۆڵێ خۆی تێدا دەبینێ . بەهۆی لەراندنەوەی دەنگەکە واتا قامك لە گەروودان‌و دەنگ دەبنە مۆسیقاو ئاوازێك . . . بالۆره گووتن . . . . هەموو کەسێك ناتوانێت بیلێت . ئاوازو ئیقاعەکەی بەرێك‌و پێکی دەربرێت . وەکو نۆتەی مۆسیقا شارەزایەکی باشی دەوێت . هەرچەندە دەنگی خۆش بۆ خۆی سازو ئاوازێکە . . دەنگی ناسك‌و تیژو خۆش بۆ بالۆره گووتن دەشێن . زیاتر دەنگی ئافرەت بەتام‌و چێشترە بۆ بالۆره گووتن . . بالۆره دەکرێت بەسێ بەشەوە . . .

١ – **بالۆرەی ئەویندارىو خۆشەویستی .**
٢ – **بالۆرەی (هجو) واتا شەرە جنێو .**
٣ – **بالۆرەی (وصف) کردنی سروشتو جوانی .**

١ – **بالۆرەی ئەویندارىو خۆشەویستی :—**

ئەو جۆرە بالۆرەیە پیٚهەڵدا گووتنێکە لە نێوان شۆرە لاوو کیژۆلانّدا ، بەتایبەتی لە کێوو کەژان . . لە لێرەوارو هەڵدێران . . لە بژوێنو زەمەندان لە مێرگو مەزرایان . . لە نشێوو گەواندا . . سەرەتای کەژی بەهاران بەکۆمەڵ کیژو کوران دەچنە کنگرو ڕێواسان ، دەست دەکەن بە بالۆرە گووتن ، هەرکەسە بەسەر خۆشەویستەکەی خۆیدا هەڵدا دەڵێت . بەبالۆرە گووتنو پێداهەڵگوتن بەسەرهاتی ئەو ئەشقە پیرۆزەیان هۆنیوەتەوە ، هەر لە کازیوەی سبەینانەوە تازەردەی خۆرئاوا .

٢ – **بالۆرەی (هجو) واتا شەرە جنێو :—**

ئەو جۆرە بالۆرانەش هێجگار باون لە نێو کۆمەڵگەی کوردەواریماندا چ لە نێوان کورو کیژدا یان کیژ لەگەڵ کیژدا . . . بەم جۆرە ڕۆژ دەبەنە سەر بەگاڵتەو خۆشیو پیٚکەنینەوە . بالۆرەی جنێو دان تورەبوونو زویربوونی تێدا نی‌یە تەنها بۆ خۆشیو ڕۆژ بردنە سەرە ، چونکە لە سنووری تایبەتی خۆی دەرناچیٚ .

٣ – **بالۆرەی (وصف) کردنی سروشتو جوانی :—**

بە بالۆرە گووتنو هەڵدان وەصفی جوانی سروشتیان کردووە جا چ لوتکەی شاخو زورگو هەڵدێرو دارستانو مەزراو ڕەزو باغ بێ ! یان وەصفی جلو بەرگو لەنجەو لارو چاوو برۆبێ . هەر دیمەنێکی ڕەنگاو ڕەنگو قەشەنگ سەرنجی ڕاکێشابن بەسەریاندا هەڵداگووتووەو لێك چوونو لەو چونی خۆشەویستەکەیان بەو دیمەنو جوانی‌یە کردووە .

بالۆرە گووتن . . . بەزۆری لەلایان ئافرەتەوە زیاتر دەگووترێت . لە نێو لادێیەکانی کوردستان ئافرەت سەربەستی‌یەکی تەواوی هەبووە . هەمیشە بە ئازادیو سەربەخۆیی ژیاوە ، ڕێگەی لیٚ نەگیراوە لە زۆرکاردا شان بە شانی پیاو هەڵسو کەوتی کردووە . نموونەیە ئێستاش کە ئافرەتێکی لادیٚ دێتە شار بیٚعەباو پەچەیە ، وەیەك دوو بار ترێو تەماتەش دەفرۆشیٚ لەگەڵ کریاران بیٚشەرمو بیٚسڵەمینەوە ڕادەوەستیٚ . . سروشتو خاك وای لیٚکردووە کە فێری خۆشەویستیەکی پاکو بیٚگەردبیٚ ، بەئازادی دەنگی بەرز کردۆتەوە لە حەیرانو لاوكو بالۆرەو بەستەو گۆرانی . . لە کۆندا زۆر باو بووە بالۆرە گووتن لە نێو لادێو گوندەکانی کوردستان ، بەداخەوە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بەرەو کەمیو لەناو چوون نزیك دەبیتەوە چ شیعرو حەیرانو بەستەو لاوكو بالۆرە سودێکی زۆر زۆریان هەبووە بۆ ئەدەبی کەلەپورو فولکلۆری کوردی ، زیندویان کردۆتەوە دەمەودەم بۆمان ماوەتەوەو زۆر شتیان لە لەناو چوون ڕزگار کردووە . بەلاشتانەوە سەیرو سەر سورمێنەر نەبیٚ گەر بڵێین بەشی زۆری خوێندەوارو نەخوێندەوار نازانن بالۆرە چی‌یە ؟ ! ! . . چۆنە ؟ ! تەنها ووشەکەیان بیستووەو بەس لیٚی ناکۆڵنەوەو پشت گوێی دەخەن . .

بەڕای خۆم ئەو پرسیارو چەندو چۆنە دەخەمە ئەستۆی ئەدیبو ڕۆشنبیران . . بەتایبەتی ئەو بەڕێزانەی کە بەدووای فولکلۆردا دەگەڕێنو خۆیان بۆ تەرخان کردووە . هەتاکو ئێستا تەنها سیٚ دێرێك باسی بالۆرە نەکراوە . جگە لە باسەکەی کاك (مولود بێخاڵی) کە لە ژمارە (٨)ی گۆڤاری کاروان کورتە باسێکی دەربارەی بالۆرە نوسیوەو بەو شێوەیە پیٚناسەی کردووە .

(بەلورە :— بریتی‌یە لە دانانی هەردوو ئانگوستی گەورەی دەست : لەسەر قورگ وەگێرانی نزمە گۆرانیەکی تایبەتی بەم جۆرە هەمویان ووردە ووردە کۆ دەبنەوە بۆ گەڕانەوە بەرەو ماڵ . پاش ڕابواردنێکی خۆش لە ناو گوڵو گوڵزاری داوێنی چەمانی چیا)[1] هەرچەندە کارێکی چاکی کردووە . بەڵام کەمو کوری بەکارەکەیەوە دیارە . . . کە بالۆرەی گۆڕیووە بە لورە . . پێناسێکی ناتەواویشی کردووە.

تەماشایەکی کتێبی (دەروازەیەك بۆ ئاوازو گۆرانی کوردی)م کرد کە لە لایەن مامۆستا محمود زامدارەوە ئامادەکراوە، ئەویش هەر باسی نەکردوە پیاوو ئافرەتەکانی لادێ دەگێڕنەوەو دەڵێن :

کاتێك کە دەبینی کیژۆڵە یەکی جوانو شۆخ و شەنگ کە بە قامکە ناسکەکانی لەگەروو دەداتو بالۆرە دەڵێت . . ڕێبوار ڕێی لێ بزردەبێو باڵندەش بە باڵەکانی لەنگەر دەگرێ هێندە خۆشو ناسك بووە بەو ئاوازو هەستو سۆزەی بەسەر خۆشەویستەکەیدا هەڵاگوتووە ئەمانەش چەند نموونەیەکن:ـ

هەی کۆوە شانازیە
لولەپی دەروازیە
ئاغایە دەم کوژیە
بە زمانی تورکیە
لۆ کوڕەی گەورکیە

* *

هەر دەڕۆم بانەو بانە
کلکی کۆچکێم پانە
شوبرام عەلی خانە
کوژرا لەو دووکانە
سەر چۆپی مەنگوڕانە

* *

هەر دەڕۆم چۆماو چۆمە
بەگوارەی شەش گۆمە
من بوکێ خاڵی خۆمە
کەسم نەکات لۆمە

* *

وەرە لەلاپی لایە
بۆم ڕاخەن بەڵمێو
پێم دادەن کایە
دۆستی بێ بەقا
برایمی دەدایە

* *

چبکەم بۆ برادەرێکی
بینێرم بۆ ماڵێکی
دەڵێن یارم نەخۆشەو
بابمرم بە جارێکی

* *

لەسەر دارە بیمە
خوشکێ تفەنگ چیمە
لە دمی بابت ڕیمە
پێشت قایل نیمە

* *

دەربەند لەمن بەچەرخە
لەسەرێ مەڕوو لەبنی بەرخە
حەزلێکردنی منو حەیرانێ بۆتە
بە خاتون ئەستیو شێخ فەرخە

* *

پەپوسێانەی دەندوك زێڕینە
کوڕە حەیرانێم لە بۆ وەبینە
هەرۆ سەر ئەوان بڵندو شاخانە
کولاو قوتنی دەسرۆك هەورینە
جوابی ئەصەحی لە بۆ من بینە

* *

وەرە لە دووری دیاری
گوڵوکەی ئەوەل بەهاری
کوانێن بەریو دیاری

* *

ئەو شاخەی گەڕان گەڕە
کاکێ من تولێ تەڕە
بێریان لەسەر شەڕە

* *

ئەو شاخەی دەدیارن
سەریان بەژەنگارن
لاویان تێڕا دیارن

* *

ئەو شاخەی بڵندو نەوی
یاخوا کەلێنیت تێ کەوی
تاکا کم لێ وەدیارکەوی

* *

ئەو مانگەی لە چڵکێدا
کاکیم دەبەندێدا
سەرو ماڵم لێدا

* *

دەڕۆم لەپێت پێتان
مەیتی من لە کوێتان
ناکەم مەنگوڕە شێتان

* *

سوارەی لەسەر ئەسپی
خەنجەر نەبڕی دەستی
حەیفە دەزگیرانیان خواستی

* *

بریا داری بی بام
لە دەرکێ ئاشی بام
نیسێیە لاوی بام

* *

شەدەکەی سەرت حاشیای دوخاوە
لەبەر چاووزار بۆی بانە دراوە
ئێستا مەیلی تۆم بەکەس نەداوە

* *

ئەو مەنە گەورە خەزورانم بێ
چیغی لول دراو دیوە خانم بێ
سەوزەی قەدبارێك دەزگیرانم بێ

* *

دەستە سڕی دەستیت تۆپێ کەتانێ
بێنە بۆت بشۆم بەرەو جێژنانێ
تاپێك شاد ببین قائەخری زەمانێ

* *

فەصڵێك دەمبەنو دەمنێژن
قەبریم بەگولاوێ داڕێژن
هەتا یار دێ هەر مەم نێژن

* *

خوایە قەبرم سەرە ڕێبێ
دایم و دەرهەم تەقەی پێ بێ
ئەگەر یار هات چاوم لێبێ

* *

فەصڵێك دەبمەن بۆ سەرقەبری
تاوێك لەمن بگرن سەبری
داخوا یارم چۆن بۆ دەگری

* *

دەستەسڕی دەستیت هەوری بەهارێ
خۆمن نەمردووم تۆ دەگری یارێ

* *

دەستەسڕی دەستیت ئاڵی لیمۆیە
ئارەق پێ بڕێژە لە ڕێگای کۆیە

* *

دەستەسڕی دەستیت سوری کڵۆکێ
خۆمن نەمردوم تۆ دێنی بوکێ

* *

دەستەسڕی دەستیت کڵۆجە تاقەیی
ئاوران مەدەوە عالەم تێگەیی

# چەند شیعرێکی فۆلکلۆری

**حمه أحمد جاف**
**قەلادزێ**

باخچەی شیعری فۆلکلۆری بێ‌پەرژین‌و بێ‌سنوورە . چونکە تا چاو برکا بێ‌کۆتایی درێژ بۆتەوەو مەیدانێکی بەر فراوانیشی لە زمان‌و ئەدەبی بە پێزو رەسەنی کوردی داگرتووە . . چونکە سەر هەڵدان‌و گەشەکردنی ژیانی مرۆڤ‌و شارستانیەتەکەی زیاتر بۆ بە پێزو بە هێزی فۆلکلۆرەکەی دەگەڕێتەوە . .

بێ‌گومان هەر گەلێك فۆلکلۆرەکەی هەنگاوێ پێش بکەوێ بگرە رەورەوەی مێژووەکەشی چەند هەنگاوێ بەرەو پێش دەئاژووێ . کەواتە دەتوانین بڵێین : فۆلکلۆر زمانی بە پێزو چێژو رەسەنی مێژووە . . مێژووش لە سەرچاوەی زمانی گەلەوە هەڵدەقوڵێ‌و لاپەرەکانیشی بە (داستانی قارەمانیەتی‌و رووداوو کارەساتی دڵتەزێن‌و نامۆو ، رۆمان‌و چیرۆکی هەزارو یەکشەوەی گوێ ئاگردانوو باسی ئازایەتی ناودارانوو سەربهوردی گەورە پیاوان پڕکراونەتەوە) کەواتە زمان‌و ئەدەبی کوردی لە دەقی بناغە بنەرەتیەکەیەوە (کە ئەویش فۆلکلۆرەکەیەتی) وەرگیراوە . . .

ئەو گەلەی کە فۆلکلۆرەکەشی بێ هێزو پێزو کرچ‌و کاڵ بێ . بێ‌گومان زمانی ئەدەبەکەش هێشتا نەپژاوەو ماویشیەتی کامڵ بێ . . واتە لاڵ‌و کۆڵن . .

کەواتە بە ئەدەبەکەش دەگووترێ (زرکە ئەدەب) . . جا لە کۆتایی باسەکەشماندا ، داوای هەرە پێویست‌و گرینگ لە خوێنەرو نووسەرو ئەدەب دۆستانی ئازیزیش ئەوەیە کە بە پێی تواناو بێ‌کەمتەرخەمی ، هەریەکەو لە ئاقاری خۆیەوە . گەشتێك بە نێو مەزراو گوڵزاری ئەدەبوو باخچەی ناکامڵ‌و ساوای شیعری فۆلکلۆری کوانووی کەلەپووری نەتەوایەتی‌دا بکاو چەند چەپکۆکێك لەو گوڵە بەیتە بۆن خۆشە شیعریانەی کە لە باخچەی (ئەفسانەو بەیت‌و داستان‌و باڵۆرەو لاوك‌و حەیرانی کوردی دان) بچنێ‌و بە ئێخەی کراوەو ترازاوی گەشکۆڵ‌و رۆژنامەو گۆڤارەکانیدا هەڵبواسێ . .

هەروەکو لە بەشی پێشەوەدا باسم‌کرد ، کە باخچەی شیعری فۆلکلۆری بێ مەرزو بێ پەرژینە ، کەواتە بۆ هەموان هەیە کە هەریەکەمان بە پێی تواناو بەراستگۆیی ئەسپی رەسەنی خۆمانی تێدا تاو بدەین .

ئەو چەپکە شیعرانەی کەوا لە خوارەوە پێشکێشتانی دەکەین چەند خونچەیەکی تری تازە گەشاوەو پشکوتوون لە باخچەی چروپری شیعری فۆلکلۆری کورددا . . کە لەوانەش چەند بەندو بەیتێکیان دەماو دەم بە گۆرانی گوتراوون . .

-١-

کەپرۆکەی بە نەدەنێ
لە کەفرو جەگەنێ
یار بنوێ بە تەنێ (١)
بۆ وی (٢) رانەقەنێ (٣)

* * *

کەپری بەر ئەشکەوتێ
لە گیاو داری جەوتێ
کچێ مەلای مەزگەوتێ
لە سەری دەزەوتێ(٤)
قەت لێی ناکا ڕەوتێ(٥)

* * *

با هووی(٦) لە بەندەنی
هێرۆی لە چەقەنی
بیری دێی ڕەبەنی
جوانی دە(٧) مەوتەنی

– ٢ –

کچێ جاف و زەنگەنێ
لە شاخ و چەقەنێ(٨)
بەرامبەر مەوتەنێ
لێدەدەن چەقەنێ(٩)

* * *

کچێ سەکرو مامەشان
دەمانچەو تفەنگ بە شان
چۆیە(١٠) بە شانەو شان
بە سۆلێ(١١) بنەوشان
بێ گێرەو ڕاکێشان
وەك بەزمی دەروێشان

* * *

کچێ لەکو بلباسان
ناکەن(١٢) بە نەناسان
بەلام بە قسەو باسان
دەگیرێن زۆر ئاسان

– ٣ –

لە حەوزی هەر مالآن
چۆیە چاو کەژالآن
بە زورناو شمشالآن
بە (دۆ)(١٣)ی کچ و کالآن
دەبەستن دەسمالآن

* *

باخی گوێزو هەنار
لێی هاتوونە خوار
پرچیان وەکو ڕەشمار
بێ (دۆ)ی گێل گێلەدار
کورگەل نابن بەشدار

* * *

باخی چنارو بێ
ڕەشبەلەك و چۆپی
بێ (دۆ)ی چاروك سپی
بە تەنێ چۆن دەبێ ! ؟

– ٤ –

شاخی بارم تێیە(١٤)
چبکەم دوورە ڕێیە
قەت ناگەمە جێیە
چونکی یارمی لێیە

* * *

جوتیر(١٥) لە نشێوێ
خەتی باوێ نێوێ
سمێلأنی دەبزێوێ
بۆتهات لە ئیسێوێ(١٦)

* * *

جوتیرەی گا ڕەشە
خەتی بیست و شەشە
بۆتهات کراس ڕەشە
دە بکانی ماچکە .

وەك قەتەرانی ڕەشە !

\- ٥ -

تەنەدورکێ تەلانی
خەجێ دەکا نانی
زەردو سووری ملانی
ئارەقێ بسکانی

* * *

زێڕی لە زێڕ خانێ
پارچەی لە دوکانێ
بەرخی لە تەیمانێ
دراوی لە ئێغدانێ[17]

* * *

حاکمی نەوەی سالاری
شێخ زادەی کوردەواری
بەگزادەی بەختیاری
بازو بێری هەواری
سەیزادەی بەڕوداری[18]

\- ٦ -

سابات و کەپران لە دارەبەنێ
دەیان هاوێمی وورده جەگەنێ
لەسەری بنوێ یارم بەتەنێ

* * *

سابات و کەپران لەولای چیایە
دەیان هاوێمێ وورده گیایە
لەسەری بنوێ کچی مەلایە

* * *

زەویە بەر مالان ، هەنارو گوێزە
ڕەشبەڵەکیان گرت ، چارۆك تەورێزە
جاحێڵی بێ(دۆ) وەك کەری دێزە

* * *

زەویە بەر مالان ، چنارو بی یە
ڕەشبەڵەکیانگرت چارۆك سپی یە
جاحێڵی بێ (دۆ) وەك سەی مەڕی یە

* * *

بەڕۆژ دروێنەی درك و دالْ دەکەم
بەشەو خزمەتی وورده خالْ دەکەم
بەڕۆژ دروێنەی دێمە جۆ دەکەم
بەشەو خزمەتی بالای تۆ دەکەم

* * *

سوارێك هاتووە لە تانجەڕۆ
چیتم بۆبێ لە کراسی تۆ
ئەگەر داکم نەیدام بەتۆ
هەڵم بگرەو بۆ خۆت بڕۆ

\- ٧ -

تاچمە کوێستانان نام بە بێری
بەفرێ (گاڕووتە)[19]ی بای هەڵدەدێری
حەیفە کوڕی گەنج ، تووتنێ بدێری

* * *

دوو ڕۆژە قامکم ژانۆکەی[21] دێنێ
دەبڵێن : بە یارم پێچێ[21] دەقورێنێ
ئەورۆ چوار ڕۆژە ، سەرۆکەم دێشێ
دەبڵێن : بە یارم خۆ دەقوڕێ کێشێ

* * *

قەلای (قەلادزێ) لە من بە تەمە
پشتی خولایەو[22] ژێرڕای میرمەمە
یەکێم کەرەمکە لەو دوو کەلەمە
مارەی ئەوکیژەی لەو کوڕە ئەستەمە

تاخوا نەی‌نووسی‌و پێغەمبەر لی‌ی نەدا قەڵەمە

- ٨ -

## ئەم شیعرە فۆلکلۆریەش زیاتر بە گۆرانی گوتراوە . . .

هەی بە هەرمێ بە هەرمێ
هەی بە هەرمێ کرووزی
بە بارانت بۆ دێنم . . .
لە هەرمێی ڕەواندوزی
شەرتە کە لێم بی ڕازی
تا (سەحەر)ی بۆت دەڵێم
وەکو برایانی زیزی [23]

* * *

هەنجیرەو شیری نی یە
تری یەو بۆڵی نی یە
هەنارەو دەنکی نی یە
ئەگەر ئەوکچە لێرە بێ
ئەو چرایە شەوقی نی یە

* * *

هاتە خواری لەو ژێرە
بەژنی شەتڵە شلێرە داوای دوو ماچم لێکرد
جاحێڵم بە من خێرە

* * *

لەکایەو لەکادێنێ
بای دێو بسکان دەژنێ
سەرپۆشی لی‌دەفڕێنێ
سەری خۆی لە پەڵی دا
خوایە چاوی دەرێنێ

* * *

هاتم ، چووم بۆ کانی‌تو [24]
دوو سوورە گوڵم لەگەڵ بوو
هەتا ئاورم دایەوە
یەکێیانم لی بزربوو
لەو سەرکێوە بڵندە
دەتهاوێمی ئەو بەندە
بێنە مەمکۆڵەت ماچ کەم
هەر دەڵی سەرە قەندە
چێدیم مەهێنەو مەبە
دەبڵێ : کرێکەت چەندە ! ؟

## ● سەرچاوەو پەراوێزەکان ●

سەر چاوەی وەرگرتنی ئەم (بابەتە فۆلکلۆریە) دەگەڕێتەوە بۆ پوورم (فاتیمەی ئەحمەدە سووری کوێرەکانی) کە تەمەنی نێزیکەی «٧٦» ساڵ دەبێ‌و تا ئێستاش هەر لە ژیان دایەو لە شاری (قەڵادزێ) نیشتەجێ‌یە . .

(١) - بەتەنێ : بە تەنهایی .
(٢) - وی : ئەو .
(٣) ڕاناقەنێ : ڕانانیشێ : ناکەوێت .
(٤) - ڕەونێ : کۆچ ناکات ، ناڕوات . .
(٦) - باهوو : ئاسك
(٧) - دە : لە
(٨) - چەقەن : دامێنی شاخ‌و چیاو بەندەن . . .
(٩) - لێدەدن چەقەنێ : واتە ئەی‌کەن بە سەماو چەقەنەو چەپڵە لێدان . .
(١٠) - چۆپە : شایی‌و هەڵپەڕکێ
(١١) سۆلێ : پێڵاو : کەوشە : قوندەرە
(١٢) ناکەن : مێرد ناکەن : واتە شوو ناکەن بە بە ئسیوێ .
(١٣) - دۆ : ئەو کچەیە کە لە شایی‌و هەڵپەڕکێی ڕەشبەڵەکدا لە دەستی کوڕدا هەڵ دەپەڕێ . .
(١٤) - بارم تێ‌یە : ڕووم تێ‌یەتی : بەرامبەرمە . .
(١٥) جوتێر : جوتیار
(١٦) - ئیسیوێ : نێوی گوندێکە لە ناوچەی «پشدەرێ»
(١٧) - ئێغدان : سندوق : کە لە کۆندا ئەو ئێغدانانە وەك بۆفیە ئاسای ئێستە وابوون . . .
(١٨) - بەروودار : تیرەیەکن لە کوردستان . کە ئەمیرخانی لەپ‌زێڕین لەو تیرەیە بووە . .
(١٩) - گارووتە : ناوی چیایەکە لە ناوچەی «مەرگێ» . .
(٢٠) ژانۆکە : ووردە ژان‌و ئازار . ئازارێکی کەم . .
(٢١) - پێچ : پێشە سەر
(٢٢) - خولاَ : خوا : کە بە زۆری خەڵکی ناوچەی موکری ئەم ووشەیە بە کاردێنن .
(٢٣) - برایانی زیزی : بەم دوو برایە دەگووترێ کە جاران لە ئێستگەی کوردی ئێرانێ گۆرانیان دەگووت . .
(٢٤) کانی‌تو : نێوی گوندێکە لە ناوچەی (مەرگێ)ی سەر بە شارۆچکەی بنگردی . قەزای دوکانە . .

شانۆگەری

# ئۆپەرێتی برازیدی
# شۆڕمەحمودو مەرزن گیان

## بەشی یەکەم
## دیمەنی یەکەم

شوێن : گۆڕەپانی پێش ماڵی میرزا چاوشین

ڕەشاغە : (بەتووڕەیی بانگی میرزا دەکا) بەخولاّ هێندەم نەماوە شەق بەرم !

میرزا : (دەگاتو دەستی دەخاتە سەرشانی ئاغە) دوژمنت شەق بەریّ . . خولاّیاریّ دەیفەوتێنین !

ڕەشاغە : (بەتووڕەیی دەستی میرزا لادەبا) هەر قسەت هەیە . .

میرزا : (بەزەردەخەنەوە) نا . . نا ، بەلاّم برازاتەو دەسگیرانی مەرزن گیانە .

ڕەشاغە : (بەتووڕەیی) ئەو نەگبەتە ؟ من لە کویّ ئەو گاوانە لۆتیە لە کویّ !

میرزا : باشە ، لەکاتی خۆیدا لەبەردەم خەڵکی (بیّئاو) تۆو ڕەحمەتی برات لێکتان مارە نەکردوون ؟

ڕەشاغە : (بەچاو سوورکردنەوە) دمت بگرە ، برای چیو مارەکردنی چی ؟ ئێمە کوڕی ئەمڕۆیین .

میرزا : هەر خۆمانین ، مەحمودی برازات شوهرەتی شۆڕەسواری بە گاڵتە وەرنەگرتوە

ڕەشاغە : پیاوی وەك تۆم هەبیّ دوژمنم بۆ چیە ؟ !

میرزا : ئازایەتیو سوارچاکی مەحمود هیچ ، ئەی زمانی خەڵکەکە ؟

ڕەشاغە : زمانیان دەبڕم . . ئەی بۆ ئەوە ناڵێن کە باوکی مرد بەخێوم کرد تا گەیشتە ئەم ڕۆژە ، ئێستایش بۆتە دڕکی نێو ماڵم .

میرزا : برازاتە

ڕەشاغە : هاشاوەلیلا : ئەگەر کارێکت پیّدەکریّ باشە ، ئەگەرنا چەنە چەنی پیّ ناویّ !

میرزا : (بەقسەی تووڕە دەبیّ) باوکیشی ئەسوتێنم

ڕەشاغە : (بەسەرسوورمانەوە) چلۆن ؟

میرزا : عەرزی ئاغام دەکەم . . بەسەرکردایەتی بینێرە سەر سەرداری عوسمانی

ڕەشاغە : قسەت کرد ، ئەمن دەڵێم (نێرە ئەتۆ دەڵیّی بیدۆشە»

میرزا : قوربان قسەم تەواو نەبووە

ڕەشاغە : (بەدەست وەشاندن) بابزانم

میرزا : (لیّی نزیك دەبێتەوە) شۆڕمەحمود بانگ بکەو بڵیّ : کوڕم ئەوە سەرداری عوسمانی خۆی ئامادە کردووە هێرشمان بێنتە سەر ، خۆیشت دەزانی پیر بووموو هێزی جارانم نەماوە ، میراتگری منیش مەگەر تۆ نەبی ؟ بۆیە بڕیارمداوە بەخۆتو سوپایەك بەر لەوان هێرشێکیان بۆ بکە .

ڕەشاغە : ئەی تۆ نازانی سەرداری عوسمانی دەبێتە زاوام ؟

میرزا : چلۆن نازانم ، کاتیّ شۆڕ مەحمودی برازات

ڕەشاغە : (بەتووڕەیی قسەی پێدەبڕیّ) مەڵیّ برازات !

میرزا : باشە قوربان . . هێشتا قسەکانت تەواو نابیّ حودە ڕەزامەندی خۆی پیشاندەدا ، چونکە سەردار خوازبێنی دەسگیرانی کردووەو داخ لە دڵە !

ئینجا تۆیش قاسیدێك بنێرەو هەواڵی هێرشەکەی حودەیان پیّڕابگەینیّ «ئاوان بێنەو دەستان بشۆ»

ڕەشاغە : قسەیەکی جوانە ، بەلاّم نامەویّ جارێکی تر گوێم لە

ـزاو دەسگیران بێ !

(لەگەڵ زەردایی ڕۆژئاوابوون هەردووکیان

دەم بە پێکەنین بەرەو دیوەخانی ڕەشەئاغە دەڕۆن)

## دیمەنی دووەم

شوێن : دیوەخانی ڕەشەئاغە

(دیوەخان پڕە لە خەڵك ، شۆڕ مەحمودیش لەگەڵ خزمەتکارەکان لە ناو پێلاوەکان بە خەمناکی دانیشتووە ! لە ـکاو ڕەشە ئاغە هەڵدەسێ‌و بە پێکەنین دەگاتە لای شۆڕمەحمود ، ئەو کارەی ئاغە دانیشتوانی دیوەخانی حەپەساند ، شۆڕ مەحمودیش لە خۆشیان دەم بە پێکەنین خۆی داوێتە سەردەستی مامەی ، مامەیشی دەستی دەگرێ‌و دەگەڕێتەوە شوێنی تایبەتی خۆی ، شان بە شان دادەنیشن‌و لە دوای چایە خواردنەوە . . ڕەشە ئاغە لە نزیکەوە بێ ئەوەی کەسێك گوێی لە قسەکە بێ پیلانەکەی میرزای پێ‌دەڵێ)

شۆڕمەحمود : (بەسەرسوورمانەوە) گاڵتەم پێ‌دەکەی ؟

ڕەشاغە : (بەپێکەنین دەست دەخاتە سەرشانی شۆڕمەحمود) گوێ بگرن خەڵکینە ، سەرداری عوسمانی دەیەوێ هێرشمان بۆ بێنێ . . بەڵام خەیاڵ خاوە ، جا پێویستە دەستوەکەریەك بکەین ! بۆیە بڕیارمدا شۆڕ مەحمودی برازاو دەسگیرانی مەرزن گیانی کچم‌و شۆڕە سواری (بێ‌ئاو) ببێتە سەرکردەی ئەو سوپایەی هێرش دەکاتە سەر ناحەزمان ، لە دوای گەڕانەوەی شۆڕ مەحمود خولاًیاربێ زەماوەندی ئەو دوو ئامۆزایە ساز دەکەین .

میرزا : (ڕوو دەکاتە شۆڕمەحمود) سەفەرخێر ، جا ئاغام خۆش‌بێ ، شۆڕ مەحمود شیاوی ئەم مەنزلەیە .

سەعەگەڕ : (بەچاوێکی قوچاو) ئەشهەدومابیلا «ماڵ بە ماخۆی نەچێ حەرامە» مەگەر برازای ئاغە نەبێ ؟ !

ڕەشاغە : (بەفیزەوە) میرزا

میرزا : (دەست لەسەرسنگ) بەڵێ قوربان

ڕەشاغە : جل‌وبەرگێکی جاڵسی بۆ خۆت‌و سەعەگەڕو مەحمود بکرە

میرزاوسەعەگەڕ : (پێکەوە) لەسەروماڵت بەزیادبێ

ڕەشاغە : (ڕوو دەکاتە شۆڕمەحمود) دەمەوێ بەیانی زوو خۆت‌و سوپات ئامادەبن .

شۆڕمەحمود : (لەسەرەخۆ) چلۆنی دەڵێ‌ی وادەبێ (دەڕوا)

## دیمەنی سێیەم

شوێن : ژوورە کەلاوەکەی خاڵۆ فەیزوڵڵای کۆنە نۆبەدارە بە ئەمەکەکەی باوکی شۆڕ مەحمود .

(شۆڕ مەحمود بە خەمناکی لە خاڵۆ وەژوور دەکەوێ)

خاڵۆ : (لەبەری هەڵدەسێ) کوا برادەرەکەت ؟

شۆڕمەحمود : (پشت بە دەرگاکە وەدەنێ) بۆ برادەر ماوە ؟

خاڵۆ : ها . . ها ڕۆڵە ، سەلام سەلامی خولاًیە

شۆڕمەحمود : (بە قورگێ گیراوی) هاتوومە بۆ گەردەن ئازابی !

خاڵۆ : (دەستی بە چاوی دادێنێ) خەونت دیوە ؟

شۆڕمەحمود : مامە ڕەشە !

خاڵۆ : بە نەعلەت‌بێ . . مەسەلەی مەرزن گیانە ؟

شۆڕمەحمود : لەو بابەتەیە . بەڵام بە پیلانێکی‌تر

خاڵۆ : پێشینان درۆیان نەکردووە «مامان برازا بزرکرد . خاڵان خوارزا مەزن کرد» ئا وەرە دانیشە بزانم چی قەوماوە .

شۆڕمەحمود : (دادەنیشێ) مامە ڕەشە دەمنێرێتە شەڕێ . . دەیەوێ لە نێوم ببا !

خاڵۆ : نەکەی ! ئەوە پیلانە ، ئەو ناپیاوە لەوە زیاتر چی دەوێ ؟ ئاغایەتی‌و بردی ! ماڵ‌و سامان دەستی بەسەرداگرت ! نەدانی مەرزن گیان هەمووی گوتمان حەواڵەی خولاًبێ ، بەڵام لەناوبردنت ! نەخێر هەزار جار نەخێر . .

شۆڕمەحمود : (سەر لەسەر ڕانی خاڵۆ فەیزوڵلاً دادەنێ) خولاًیاربێ دەبێ بەسەر بڵندی بێمەوە ئینجا من‌و ئەو . .

خاڵۆ : (دەست بەسەر سەری شۆڕ مەحمود دادێنێ) بەقسەی ئەو نائەموارە نەکەی . ئەوە میرزا . ئەوە سەعەگەڕ .

ئەوانی تر . .
شۆڕمەحمود : دوعام بۆ بکە . . ئەو مەهانەیش دەبڕم ، لەبەر چاوی مەرزنی ئامۆزام
خاڵۆ : بەقسەی من بکە مەچۆ
شۆڕمەحمود : (لەسەر ڕانی خاڵۆ لادەچیٚ) دەتەویٚ کیژۆکاڵی (بیٚئاو) سەرزەنیشتی مەرزن بکەنو بڵێن ئەوە لاوی بەر دلاَن بوو . . نەخێر خاڵۆ گیان ، یا ئەتەویٚ شوهرەتی شۆڕە سواریم لە نێو خەڵکا نەمێنیٚ ؟ !
خاڵۆ : خولاٚ دەزانیٚ حەزناکەم ، بەلاٚم
شۆڕمەحمود : (قسەی پیٚدەبڕیٚ) دوعای خێرم بۆ بکە (هەڵدەسیٚ بڕوا)
خاڵۆ : دوعام بە ئاهی بیٚ باوکان بیٚ .

## دیمەنی چوارەم

شوێن : حەوشی کۆشكو بالاٚخانەی مەرزن گیان
(شۆڕ مەحمود دەچێتە لای مەرزنی ئامۆزاو دەسگیرانی بۆ خولاٚحافیزی)
شۆڕمەحمود :
«کیژیٚ بیٚ باسەتو باسەت پیٚنەدراوی
ئەوە شەرە ئێستا دەست دەینە مەقەندالٚی»
مەرزن گیان :
«ئەوە کاری بابە دەتنێریٚ بۆ جەنگی
ئاگادارتبی ئەلیاسی لە بەحرو خدری لە چۆلو بەڕی»
شۆڕ مەحموود :
«بابت دەمنێرێتە سەفەریٚ تێناگەم نەبە بریندار ، نەبەکوژراوی ، نەبە نەخۆشی دێمەوە نەبەئەنگواوی»
مەرزن گیان :
«یارەبی لاوە لە پاشت بەجیٚنەمێنیٚ بەژنەکی باریكو دووکوڵمە لیمۆیی‌یە»
شۆڕمەحموود :
«زەردە مەمکانت لە منیٚ غەریبیٚ حەپس کردووە لە ژێر کراسەکی مەخمەلیدا بە میسالی» .
مەرزن گیان :
«خەبەری ناخۆشم بۆ نەیە سەرم بەرمەوە بەر کووپەڵەی دەخمی‌یە»
شۆڕ مەحموود :
«هەرمیٚ گولاٚوی مومنی دوعای بەخێرم بۆ بکە ئێست لیٚنەقەوماوی»
مەرزنگیان :
«خولا ئاگادارتبی ، پاشی توو زیندەگانیم بۆ چی‌یە»
شۆڕ مەحموود :
«ئەمن دەچمەوە سەفەریٚ هاتونەهاتی
ئەتو دەبی گەڵێك خوێنت بێتەوە لە دوو چاوی»
مەرزنگیان :
«ئەمن ئیفتخار دەکەم ئەتۆ هاتیە کنە من بەعەزمی خولاٚ حافیزی‌یە
شەرت بی تا دەمرم بۆت بکەم یا ئەڵلاٚ ئەڵلاٚ رەبی‌یە
رەبی کۆمەکت پیٚبکەن چل سوارەی غەیبی‌یە
هەتا دیٚیەوە لە من وایە (بیٚئاو) چۆلە ، ئاوەدانی تێدا نیە»
(تاریکی دەکەوێتە سەر شۆڕ مەحمودو مەرزن ، رووناکی بۆ سەر شایەر لە کونجێکی شانۆو کتێبێکی لەبەردەست دایە ، بەم جۆرە تا کۆتایی)
شایەر : مەرزن دەڵیٚ :
«زەینی خۆم دەداوە دەرکیٚ ماڵە بابم لە سواران گرمە گرمەو ناڵە ناڵە
ئەورۆ دەروونم خۆش نابیٚ زارم یەکجاری زۆر تاڵە
دڵم وەکو هەوری ئاسمانیٚ گەوالٚ گەوالە
پێم خۆش نیە لاوە بچیەوە سەفەریٚ هاتونەهاتی
بەبیٚ سەندو قەبالاٚت بەردی ساردو گەرمت نەیتەوە سەر ریٚیە
بەدووربی لە دەردیٚبەلاٚیٚ ، رەبی زوبانم بیتەوە لاڵە
بە میرات بەجیٚ نەیڵی بەژنەکی باریكو دوو چاوی کاڵە»

مەرزن گیان :
«لە دڵەکەی من گەڕیٚ چەند لەژانە
دەڵیٚی بەحری شنۆییٚیە لاوە
خودا بەویٚ ڕۆژیٚ نەکا ، لە دونیایٚشم بەس بۆ نەبیٚ لە قیامەتم
نەمات پیٚیە
بابم پەلپی لیٚگرتووی ، لە خولاٚم تەڵبە بگریتەوە ئازاری گڵی»
شایەر : مەرزن دەڵیٚ :
«تەما دار بووین ئەو ساڵە چیغ‌و چادرمان بچیٚتەوە هەوار
خدری
موقەدەری هەق دەستی لاوی نەهیٚشت تەواو نەبوو خەیالٚ
دەگەلٚ فکری
ئەمما لەو سەفەرەی بیٚیەوە پیٚم چاکتری
ئەتوو زەینەکەی خۆت بدەوە کراسەکی مەخمەڵداری
لەسەر گراوی پانیٚم وەکو فەرەنگی
تەماشای زەردە ماٚلکانمکە لەبن کراسەکی مەخمەڵداری
هەڵدێنیٚ ژەنگی
هەتا دیٚیەوە دادەنیشم بە خاماکی‌و بەبیٚ دەنگی»
مەرزن گیان :
«زەینی خۆم دەدا کۆسرەتی شاڵەبەگیان لیٚی دەپشکوتن
هەلاٚلەو بەیبون‌و شلکە گیا خاوە
نێرگز بۆنی خۆشە تازە جنجنی بە گوڵەوە ناوە»
شایەر : مەرزن دەڵیٚ :
«ئەتوو دەزانی من زۆر نارەحەتم تازە بنی مەمکانم داناوە
خۆ لە خەڵکی حەرامە چونکە خودای تەعالاٚ بۆ پەنجە کوشینی بۆ
تۆ داناوە
چونکە دەڵیٚن مەزن گیان لە شۆڕ مەحمودی مارەکراوە
ئەتو تەماشای کوڵمەت نەکردم دەڵیٚی شەمامەی حەفت
ڕەنگییە شەختەی
پاییزیٚ لیٚداوە»
مەرزن گیان :
«ئەتو تەماشای بەژنیٚم ناکەی دەڵیٚی چناری عەرعەرە
بە ئەمری خودای بە بیٚ گریٚ خوڵقاوە
دەسەلاتی بابم نیە ، دەنا کاریٚکی وام دەکرد نەچیەوە ئەویٚ
سووکە سەفەریٚ پیٚم
دەڵیٚن مەرزن گیان حەیای نەماوە»
شایەر :
«ئەوە شۆڕ مەحمود لە پشتی وولاٚخی دەکرد زینەکی
موورەسەع ، لەزاری دەکردەوە
دانەلغاوە
هاواری دەکرد یونس ئەگەر ئەلیاس لە بەحریٚدا ماوە
شۆڕ مەحمود دڵم خولاٚ تۆفیق داوە
ئەوە حاکمانی تەرک‌و تورکمانیٚی ستاندو گەڕاوە»
شۆڕمەحمود :
«جا دەبیٚ کیژیٚ لە کیژانم زیٚدە
سینگم بۆ بکەی بە باغی شەداد ، بۆ منی هەڵیٚنیەوە گۆشە چاوە
هیٚندەك بڵیٚن حۆری ئاسمانە
هیٚندیٚك بڵیٚن خیٚر کۆترە سەری لیٚشیٚواوە»
شایەر : شۆڕمەحمود دەڵیٚ :
«کوڵمەت بە من بمیٚنی بە گوڵی دەکویٚستان خونچی تازە
شکۆفەی داوە ، بولبول لەسەر گوڵ دەخوێنیٚ حەیفە پەیمانمان
دەبیٚتەوە
بلاٚوە
جا خولاٚحافیزت لیٚ دەکەم دەوڵەت زیادو ماڵ ئاوە
نازانم نەئەجەلە نەخولاٚ تەرەقی لەشانی من ناوە
تا ئیٚستا ڕۆژیٚ سیٚ جارم دەدیتی پیٚم‌وایە ئەوجا لەمن دەبیەوە بە
قاتی
چونکە ئەمن دەچمەوە سەفەریٚ هات‌ونەهاتی»
شۆڕمەحمود :
«گەردەنت بە من بمیٚنی بە بەیداخی ڕۆمیان ، ئەگەر با
دەیشەکیٚنی چلەی زستانە

چاوت به من بمێنی به ئەستێرەی رۆژێ ئەوا هەلاّت له پیره
کوێستانه
دوعای بەخێرم بۆ بکەن خزمینه پێم وایه وەختی دەست لێك
بەردانه»
مەرزن گیان :
«ئەگەر خولاّ دەکا لەو سەفەرەی دەگەڕێیەوە دواوه
سینگمت بۆ دەکەم به باغی خواجه حەسەنی ، ئەگه تازه
ڕیشەی هەناری لێداوه»
شایەر : مەرزن دەڵێ :
«جا من چلۆن کوێر نەبم دەنگی ڕەسو خاڵ خاڵو ئاوزەنگی
لاوەکەی من
لەبەر دەرکێ ماڵه بابم نایێ
جا من چلۆن ئازارێك نەمگرێ
ئەگەر نەڵێم سینگ‌و بەرۆکی من دەستی شۆڕ مەحموودی
تێدایه»
مەرزن گیان :
«شەرت بێ نەێلێم بای ئەمماڵ بچتەوه نێو سینگ‌و مەمکانم
هەتا لەو سەفەرەی دەگەڕێیەوە دواوه»
شایەر :
«شۆڕ مەحمود دەپێ‌ی کردووه جوتێك چەکمەی سایل
نەمامی بنی کوردی وەستا نەسری‌یه
سواره له وولاّخی خاڵ خاڵ ئەسڵ شێر غەزاڵی‌یه
سمت تەبەق گوێ مەسقەتی ئەسڵه بەحری‌یه
له شانی کردووه ڕمبەکی دم ڕەشی هەژده قەفی‌یه
به خوێنی نەکردووه لێ‌دەتکێتەوە دلۆپەی دەخوێنی‌یه
لەبەرێ‌ی دایه خەنجەرەکی دەبان ئەسڵه وەستاکاری‌یه
قەدیمی زەمانی دەڵێن لەبەرکەسدا خەنجەری وانی‌یه»
مەرزن گیان :
«ڕەبێ بەدووربێ له موقەدەری حەفت دەستی ئیلاهی‌یه
خۆ قەسەم بەوەیکەم نەلەگوینی کەسه ، نەکەسی له گوینی‌یه
خۆ له توو زیاتر من تەمام بەکەسی دیکه نی‌یه»
شایەر : مەرزن گیان دەڵێ :
«دەترسێم خاتری خۆتکەی جوان چاکیم بەبێ مرادی بەرمەوه
بن
باری سیده گلی‌یه
ئینشاڵلاّ قسمەتی تۆیه قسمەتی هیچ کەسی‌دیکه نی‌یه
ئەدی نارِوانیه گواران ، تۆقان ، زێڕان ، کرمەکان دەگەڵ
بەندی پیره گوارێ
بابان‌وێرانم قەلەندەرم پاشی توو فرمێسك له چاوم دەبارێ
خۆ له توو زیاتر کەسم له ماڵه باب‌و بابەواناندا نی‌یه
ئامانەتداری تووبێ حەزرەتی وەیسەل قەرەنی‌یه
یونس له دەریایه ئەگەر له زگی ماسیدا قەراری نی‌یه»
مەرزن گیان :
«وێنەم بکێشه له جێگایەکی چۆل‌وبەری بڵێ : هەر من
هەمه دۆست‌و یارێ بۆ توو دەبیتەوه به قنیات‌و به حەسەنەوات
هەموو سبحەینان‌و ئێوارێ»
شایەر :
«باز ئەوه هاته دەرێ له قۆشخانه شمقاره بازه شەهێنه
تەولانه
ئەوا مەرزن دەگرێ دەڵێ : خولاّوەندی میری مەزن جوتێك
هەناری لەسەر سینگی من دانایه
سەلاّی گەورەو گرانم لێ‌ڕابوو کلفەتان بۆم بگێڕن شینگاێ بۆم
دابنێنەوه خنخانه»
مەرزن گیان :
«دڵم یەکجار زۆر له ئێشەو له گەرمه ژانه
زۆر دەترسێم شۆڕ مەحمود به خولاّی پێم وایه وەختی دەست
لێك بەردانه»
شایەر :
«ئەوەبوو به هەلاّ هەلاّو گرمەگرمی سواران هەرکەس له
خزم‌و ئەقرەبای خۆی دەکا خولاّحافیزی‌یه

ﻪشكرى وا له هيچ شاخاتێك‌دا نى‌يه
شۆڕ مەحمود دەگەڕاوە بۆ حەرەمخانە بە عەزمى خولاحافیزى‌یه
دەیگوت : كیژێ لە كیژانم زێده
ئەمن كۆمەكم نیه ، ئەمما زۆرم ئومێد به بەژنەكى باریك‌و دوو
داوو دەلنگى حاجى حوسێنى‌یه»
شۆڕ مەحمود :
«قوربانى دوو چاوى شەهێنت بم دەگەڵ سینگەكى سپى‌یه
هاوارم وەبەر حەزرەتى ئیبرائیم‌و حەزرەتى ئیسماعیله
ئەگەر بۆ وان داندرا كابەتوڵلا بە ئەسەحى‌یه»
شایەر :
«مەرزن گیان دەگرێ بە چاوێكى بازو بە ئەبرۆیەكە شەهێنه
دەڵێ : خولاوەندى میرى مەزن ، ئەتوو شۆڕمەحمودى لە من
مەستێنه
نیوەى بەربەرانى دەكەم نەزرى خێرى مەولودى پێغەمبەرى بۆ
فەقیرو هەژارى بێ وێنه
ئەى خالقى میرى مەزن ئەتوو بە كونفەیەكونێ دنیات دانه
وەجەرگى دوژمنى لاوەكەى من بكەویتەوە تیرى سەر بە پەیكانه
بەمیرات لەپاشى بەجێ نەمێنێ بەژنەكى باریك‌و كیژەكى وەكو
مەرزن‌گیانه»
مەرزن گیان :
«ئەى خولایە ، خولایەكى بێ‌مەكانه
ئەگەر ئەتوو ئەرزو ئاسمانت بە كونفەیەكونێك دانه
تابووتى بۆ دوژمنى لاوەكەى من بێنن ، بۆى بێنەوە گۆڕو
گۆڕخانه»
شایەر :
«ئەوە شۆڕ مەحمود بەشانى ڕاستەدا ئاورى دەداوە
مەرزن‌گیان دەتكوت جەیرانە سەرى لێ‌شێواوە
بەزارى زەردەخەندە فرمێسكى دەهات لە هەرتك چاوە»
دەیكوت :
مەرزن گیان :
«لە دوعاى بەخێر زیاتر چ دەسەلاتى دیكەم نەماوە
چاوەڕێى ئەوەم ئەگەر بگەڕێتەوە لاوەكەى من دەگەڵى
بیمەوە بە كامڕاوى بە ئەملانى»

## بەشى دووەم

## دیمەنى یەكەم

شوێن : دیوەخانى ئیحسان بێگى سەردارى عوسمانى
(چەند پیاو ماقولانى وولات لە دەوروبەرى ئیحسان بێگ
دانیشتوون ، لە ناكاو عەساف نۆبەدار بە پەشۆكاوى دێته
ژوور ، بەمل كەچى لەبەردەم بێگ ڕادەوەستێ)
بێگ : لاڵ بووى قسە ناكەى ؟
عەساف : بێگ ، سەعەگەڕ قاسیدى ڕەشە ئاغەى
(بێ‌ئاو) گەیشت
بێگ : (بەزەردەخەنەوە) با بێتە ژوور (ڕوو دەكاتە
دانیشتوەكان) وادیارە مەسەلەى مەرزن گیانه
سەعەگەڕ : (بەچاوێكى قوچاو ، خۆى داوێتە سەر دەستى
بێگ) بێگ ، ئاغەم ڕێزى بۆت هەیە .
بێگ : ئەو . . چۆنه ؟
سەعەگەڕ : (بەخەمناكى) چلۆن‌بێ ! هەتا ئەو سەگسارە
مابێ . . . !
بێگ : مەحموود ؟
سەعەگەڕ : بەڵێ قوربان ، مەحمودو دم ڕووتەكان لەسەر
مەسەلەكەى تۆ لە ئاغە ڕاست بۆونەتەوە .
بێگ : (قسەى پێ‌دەبڕێ‌و ڕوودەكاتە دانیشتوەكان)
بەخولا ئەو كوڕە شێتە مەرزن چلۆن مێردى پێ‌دەكا ؟ !
: سەعەگەڕ : لەبەرئەوە ڕەشە ئاغە ناردوومى
بێگ : چى وت ؟
سەعەگەڕ : مەحمود . . هێرشت بۆ دێنێ
بێگ : (بەقاقاى پێكەنین) هێرش ؟ ! وەك سەگ
ئەى‌تۆپێنین
سەعەگەڕ : (بەترسەوە) بەلام ئەوە نێوى شۆڕ مەحمودە

بێگ : لە وولآتی (بێئاو) نەك لێرە ، تۆ بگەڕێوەو بە ئاغات بڵێ : چاوەڕێ بێ بە خۆمو سەری ئەو هەتیوە دێمەوە خوازبێنی مەرزن گیان

سەعەگەر : (دەست لەسەر سینگ) رەشە ئاغەیش بەم ئومێدەیە (دەڕوا)

بێگ : سوپا ئامادە بکەنو بڕۆنە بەرابی

جێگر : ئەمردەکەی . . بێگ ، چ ئامۆژگاریەکی ترت هەیە ؟

بێگ :

«دەجاوەرن سواران باوەخڕبن دڵەوگیری دوژمن بکەن رۆژی لیٚقەومانە
کەلەك دەکەویتە گۆری رۆژی دلٚ ئێشانە
غافڵی شۆڕ مەحمود مەبن پیاوێکی زور گەرمو زۆر چاك زانە
ئابروومان نەبەنەوە لێمان بستێنی مەملەکەتی باپیرانە»

شایەر : (باسی شەڕەکە دەکا)

«سەفی سواران دەگیرا هەمووی زێڕی لە خەنجەری داوە
دژی شۆڕ مەحمودینە تا لەو سەفەرەی نەگەڕێتە دواوە
شۆڕ مەحمود هەرجارێ رکێفی بۆ وولآخی شێر غەزالی دەردەهێناوە
دوازدە کەسی لە میرو سەردار عێلان فڕێ دەداوە
سەنگەری بەتاڵ دەکردن لەشکری عەولای حەسۆی دەشکاوە
شۆڕ مەحمود تەنگەی زینی شل نەکردۆتەوە
لەزاری وولآخی دەرنەهێناوەتەوە دانە لغاوە
وابزانم سامی نەریمانە تازە سەری لەبن گڵێ دەرهێناوە
بۆ خۆی لە شەڕێیەو روحی لەکن مەرزن گیانە
مەرزن گیان دڵی بردۆتەوە حەپسخانە
بەرنابی بەستویەتی بە زنجیری دەزولفانە
بەپەلەیە زوو بگاتەوە بەژنەکی باریكو دوو کوڵمەی شەوچرایە»

مرزن گیان : (بەتەنیا دەردەکەوێ)

«پەکی پیٚنیە ، ئەوەی لە دڵی من دایە
هەرچەندی دەکەمو دەکەم بە هیچ شتێك سوکنای دڵم نایە»

شۆڕمەحمود : (بەتەنیا لەکاتی گەڕانەوە)

«بەژنی مەرزن گیانم دەڵێی چووزە بیزایە
ئۆخەی ئارامی دڵەکەی من کەس لە قابلیەت توو نایە»

شایەر :

«ئەوە شۆڕ مەحمود لەشکرەکەی دەشکاندو کەلەك دەکەویتە مەیدانێ
مەگەر خولا دەنا کەس بە سەفتو قەباڵی وان نازانێ
رۆژی هەلاتنو تیر پێوەنانێ
ئەوە مەرزن گیان چووە گەڕانێ
ئێستا خەبەری فەتحی شۆڕ مەحمودی نەزانیوە»

مەرزنگیان :

«تا لاوەکەی من دێتەوە ، مردن بۆ من خۆشترە لەو ژیانە
ئەدی بۆچی بۆمنی نەناردووە نامەونیشانە ؟
هەتا ئەمن سینگی خۆمی بۆ بکەمەوە بە دەفتەرخانە
مەمکی خۆمی بۆ بکەمەوە بە فنجانە
چاوی بۆ بکەم بە ساقی وەختی شەراب گێڕانە»

شایەر :

«لەو عەینەدابوو دەرکەی لەسەرخۆی دادەخستو گاڵە گاڵو ناڵە ناڵە
دوو سواری پەڕ بەسەر لە دەرکی مەرزن گیان ڕاوەستاوە
کاغەزو خەبەری شۆڕ مەحمودیان لەبۆ مەرزن گیان دەهێناوە»

(ئەم دیمەنە بە وێنە پیشاندەدرێ)

مەرزن گیان :

«ئۆخەی خەبەرم بۆ هات ئارامی دڵەکەم نەچۆتەوە بادە پەنایە»

شایەر :

«ئەوە مەرزن گیان بۆ شۆڕ مەحمودی دەنارد ئەمانەتی‌یە
لەعلی رومانە ، یاقوتی عبدالحسینە ، زێڕ سپی‌یە
ئارەقەی بن پرچانە وورده ئارەقەی مابێن سینگو هەردوو

مەمكی یە»

مەرزن گیان :

«شوكرانەی خولاٚم زور كرد ، دوعای من بۆیە كاری خۆی كردی یە

دوژمنت كوێر بووە ، وەدەستت كەوت فەتحو نەسرەتی یە»

شایەر :

«مەرزن گیان وەلاٚمی بۆ شۆڕ مەحمودی دەنارد ، بەوەیكەمە ئەگەر بینای چاوە

شەوێ بێ‌خەوم لەبەر خەیالاٚت خەوم نەكەوتۆتەوە لە هەرتك چاوە

وەختە دڵم بتۆقی بۆگەنیم بێتەوە لە جەرگ‌و هەناوە

كە شۆڕ مەحمود ببینم وادەزانم تازە خولاٚ دنیای داناوە»

مەرزن گیان :

«ئاخ بە چاوی خۆم بمدیبا سمێڵەكی خورمایی لەسەر كوڵمەكی پڕ گوڵێ داناوە»

شایەر :

«جاوەكی شۆڕ مەحموود پیێ دەگەیشت كاغەزی مەرزن گیانە

وەكو بمری ببیەنەوە سەر قەبرانە

لەبن گوێی بێ خرەی پاچو پێمەرانە

چونكە قسەی مەرزن گیان بۆ ووی ئعتبارو مومتانە»

شۆڕمەحمود :

«شل‌وملو خاسەكەوی زۆر زۆر جوانە

چونكە خەیاڵو مرادی دڵی من ئەوەیە ، ئارامی لەبەردلاٚنە وەكو پەری ، هێندەك دەڵێن لە ئەرزن ، هێندێكیش دەڵێن لە ئاسمانە»

شایەر :

«ئەوە جا شۆڕ مەحموود بە دزی مامی دەهاتەوە كن مەرزن گیانە» (بە وێنە نیشاندەدرێ)

مەرزن گیان : (دەستی لە نێو دەستی شۆڕ مەحمودە)

«توخولاٚ دەستت بێنە بەڵكو غەریباتیەكەم لەبیر بچێتەوە

زورت ئەزیەت‌و ئازاب لەسەرەمنی سەر بەتاڵە كێشاوە

پێت قەرزدارم فەرموو وەربگرە كام‌وكاوە»

شایەر :

«ئەوە سمێڵەكی خورمایی لەسەر كوڵمەكی ناسك‌و شلك دانە وورده ووردە لێوی لێ‌دەبزاوت لەو مەسو خەرامانە

هێندەك دەیانكوت : رۆژی حەشرە ، هێندەك دەیانكوت : دەنگی قازو قوڵنگە

هێندەك دەیانكوت : لە ئەرزە ، هێندەك دەیانكوت : لە گەواڵەی دەئاسمانە

هێندەك دەیانكوت : نەخێر ئەوە دەنگی شەپۆلی بەحرانە ،

هێندەك دەیانكوت : خێر قافلەی كاروانە

هێندەك دەیانكوت : نەخێر پاییزە وەختی لەیل‌و مەجرووم خۆلێكدانە

شور مەحمود مێوان‌بوو هەتا سێ شەوو سێ رۆژانە

لێتان مبارك‌بی ئەو عەیش‌و لەزت‌و نۆشی ئەو توفلە»

شۆڕمەحمود :

«وەختێك دەبی خەبەرت بۆ بێن بڵێن شۆڕ مەحمود گەراوە دەركی خەزێنت بشكێنە ، بڵێن لە عێلیدا فەقیرو داماو نەماوە» (دەروا)

شایەر :

شۆڕ مەحمود زوو بەرێ‌بوو ، لەوێ دەرۆیشتەوە بۆ چلوانی ، دەڵێ هەتا من ئەو

عەروسی‌یە بە دەستی خۆم دەكەمەوە تەواوە

ئەمن لەخۆم نابینم كام‌وكاوە ، رەشی مارگازی لە دڵی من داوە

زەهری روشتووە جەرگ‌و هەناوە

هەرچەندی وەبیرم دێتەوە لێم شل دەبیتەوە هەنگاو ئەژنۆم شكاوە

ئەو تیرەی ئەگەر لە گرێی پشتی منی داوە

عیلاجی بەكەس ناكرێ مەگەر بڵێن مەرزن گیان بە دەستی

خوی دەری‌هێناوە
دەنا ئەو تیرە تەشەنداره جەرگم پڕ دەکا لە خوێن‌و لە زووخاوە
مەڵێن شۆڕ مەحمود پیاوێکی بێ ئەقڵەو ئەقلی نەماوە»

## دیمەنی دووەم

شوێن : پاوانێکی نزیك (بێ‌ئاو)

(لەوکاتەی شۆڕ مەحموود بە نهێنی دێتەوە لای مەرزنی ئامۆزای‌و دەگەڕێتەوە نێو لەشکرە سەرکەوتوەکەی . . لەدوای دەست نیشانکردنی لێپرسراوو کارگێڕی وولات ، بە خۆی‌و چەند سوارێکی بەرەو (بێ‌ئاو) دەگەڕێتەوە بۆ جێ‌بەجێ کردنی کاری ژن گواستنەوەی . . لە نزیك (بێ‌ئاو) تووشی خاڵۆ فەیزوڵلا دەبێ)

خاڵۆ : (بەخەمناکی) ماندوونەبی

شۆڕمەحموود : (بەسەرسووڕمان) بەهەشتی‌بین ، خاڵۆ گیان چ روویداوە ؟

خاڵۆ : هیچ . . هیچ ، فەرموو بابڕۆین

شور مەحموود : بۆ کوێ ؟ ئەوە بۆ وا چۆڵە ؟

خاڵۆ : دوای ، دوای

شور مەحموود : توو ئەو خولایە ئەگەر پێم نەڵێی ! دڵم تۆقی

خاڵۆ : ناوی خولای لەسەرسەرم ، چیت پێ‌بڵێم : نەموت ناپیاوە ، لەوکاتەی هەواڵی سەرکەوتنی تۆی بیست لەگەڵ بانگی کەڵەبابی نیوەشەو بەخۆی‌و میرزا چاوشین‌و سەعەگەرو چەندان ماڵی‌تر . . باروبارگەیان پێچاوو مەرزنیشیان بە پەلەکێشی ڕاکێشاو بە مل شکاوی بەرەو (بەڵەخ) و (بوخارا) ڕۆیشتن !

شۆڕمەحموود : لەبەرچی ؟

خاڵۆ : خۆ منداڵ‌نی ، نایەوێ مەرزنت بداتێ

شۆڕ مەحموود : (بەهەناسە هەڵکێشان)

«بەهارە لە خەڵکی بەهارە قاتی ، دەمرمەوە لەبەر قەرەزولفانت
ئەگەر وەکو ڕەشەماری دەیانهاوێ‌بەوە سەرشانی
ئەمنت دەمرم لەبەر قۆڵگەی بەرگەردنێت ئاوی کەوسەرە
حەوزو بازو دوکانی
مەجبوورم بەدوای دەکەوم . . یانە دەرێژم خوێنی یانە دەبەمەوە فانی»

شایەر : شۆڕ مەحموود دەڵێ :

«خۆ من پیاوێکی نامەرد نیم ، ئەمما خەڵکی دەڵێن : لە شۆڕ مەحمودی بەخسیر کراوە
سبحەینێ سەرزەنیشتم دەکەن دەڵێن مەرزن گیانی لێ‌ستاندراوە
قەسەم بەوەیکەم کە بینای چاوە ، هەتا زیندووم روح لەسەر ئێخەی کراسم ماوە
ئەمن دەست هەڵناگرم لەم بژانگە ئەگەر دەڵێی تیرە لە کەوانێت ناوە
ئەوە کیژێ لە کیژانم زێدە
کاکەمەم ئەگەر خۆی بە هیلاكدا بە خولای قەت وەکو توو جوان نەبوو ئەو خاتوزینە»

شۆڕمەحمود :

«ئەمن فکرێ لە گەردەنێ بەخاڵت دەکەم ، ئەگەر سبحەینان لێی دەباریتەوە وورینگەی
دەخوناوێ
ئەمن ئەو دنیا ڕوونەم بە خولای خاترجەم بە بێی توو ناوێ»

شایەر :

«جارچی جار دەکێشی وولاخان لە مەیتەرخانەی بێنە دەرێ
شۆڕ مەحموود لەخۆی‌داوە تانۆت‌و هونەرێ
لەتەپلی سەری لێی دەباری غیرەت‌و جەوهەرێ
دەڵێ : خەونم دیووە نازانم لەو سەفەرەی‌دا خولا چم بەسەردێنێ
رەبی مامە هەر رۆژە مەیتەکت لە ماڵە بەرنە دەرێ
مەرزن گیانت لەمن وەدوور ئێخست چلۆنی پێبەرم زەفەرێ»

شۆڕ مەحموود : (لەکاتی رۆیشتن)

«ئەوەی لەگەڵە من هاتووە ، لەگەڵ منی لێ‌قەوماوە
ئەلعان سەفەرم لەبەرە دەچمەوە بەدوای بەژنەکی باریك‌و دوو

کوڵمەی خاوە»
شایەر :
«شۆڕ مەحموود لە پێشێدا پیی لە رکێفی دانە
بەبێ ئاوێدا دەڕۆبێ ، جار جار بە نەرمەو جار جار دەیخستەوە
پڕتاوە»
شۆڕ مەحموود : (لەکاتی ئاوردانەوە)
«بەبێ مەرزن‌گیان دنیای رووناوێ ، تاقەتی پیاوەتی‌و بینای
چاوانم لەکن نەماوە
سەرزەنیشتم نەکەن تیری عیشقە راست‌و چەپ لە جەرگم
دراوە»
شایەر :
«ژن‌و پیاو خان‌و بەگلەر ئاغەو نۆکەر پاك لە کوورەی گریانیان
دەداوە
دەیانکوت : شۆڕ مەحمود شێتە نازانی یازدە هەزار کەس
چاوی لەرێی وویە
وەدوای مەرزن گیان دەکەوێ هەقیشێتی مەرزن گیان حۆری
بەهەشتی‌یە
لە شۆڕ مەحموودی جوانە سەرو رکێف‌و ئاوزەنگی‌یە
سواربووە لە وولاخەکی شێر غەزالی ئەسلە گوڵ‌گوڵی‌یە
یوسفی میسرە زولێخا دیارنی‌یە
رەبی شۆڕ مەحموود شانت نەگرێ بەدبەخت‌و نەگبەتی‌یە
رەبی مامە رەش بگری ئازاری گلی‌یە
شۆڕ مەحموود سوار دەبوو بۆکەناری هەموو رێگای حەوت
سەعاتی لەگەڵ هاتن بەرێیان کردی‌یە
تەکانی دەدا بە وولاخی شێر غەزالی سمت تەبەقی ئەسلە بەحری‌یە
رەبی چاوت نەبێ لە خوانی زینی‌یە
دوژمنت زۆر خۆشحاڵن دەڵێن شۆڕ مەحموود لە گۆڕێ نی‌یە»

## دیمەنی سێیەم

شوێن : سەرپردێك
(لەرێگادا کاروانی رەشە ئاغە بە گەلی‌یەکدا تێپەر دەبێ)
میرزا : (دەچێتە نزیك ئاغە) ئەوە چ رۆژێکە بۆ خاتری
خولا ؟ !
رەشاغە : (بەلالووتی) تۆم میرزابێ . . لەمە باشتر نابم
میرزا : خولایاربێ لەنێوی ئەبەم
رەشاغە : چاکت لەنێوبرد !
میرزا : ئەمجارە بمبێنە
رەشاغە : چلۆن ؟
میرزا : برۆ لای ئەم پردەوانەو دەمی چەوربکەو . . (قسەکە
نابیستری)
رەشاغە : ئەمەیش دەکەم (دەچێتە نزیك پردەوان‌و دەڵێ)
«پردەوان دەستی منت بەدامێن بێ
ئەگەر شور مەحمود هات ئەدەب شیرن لاوە
پیی بڵێ مەرزن‌گیان دەگەڵ مامە رەشی رۆیین بۆ بەلەخ‌و
بوخارایە
ئەمما گەراوە لەکنە من برەك راوەستاوە فرمێسکی دەهات لە
دوو چاوە
گەڵێکی بە شۆڕ مەحمودی‌دا هەڵدەگوتن بەندوباوە
ئەمما ئاخیری خۆی دەرووباری هاویشت لەو رووبارەی‌دا
خنکاوە»
شایەر : (ئەو دیمەنە بچووکە بە وێنە پیشاندەدری)
«ئەوە جا کیژ دەگەرێتەوە کن پردەوانی دەڵێ :
مەرزن گیان :
«پردەوان بە شۆڕ مەحمودی بڵێ ئاخر بەوەیکەمە ئەگەر
ئەبەدی‌یە
خاترجەمی شۆڕ مەحمودبین بەشی کەس تێدا نی‌یە ، بابە وەلی
نعمەتە مختار لە
دەستی خۆمدا نی‌یە
ئەوە دەرۆم لێت دەکەم خولاحافیزی‌یە»
شایەر : (ئەم دیمەنە بچووکە بە وێنە نیشاندەدری)
«ئەوە مەرزن گیانیش دەگەراوە سی‌ی زێری دەدا بە

پردەوانی یە»
شۆڕمەحمود : (لە ڕۆیشتندایە)
«مام دەبێ لە جێگای بابێ بێ
ئەمما تەماشای ، چی لەگەڵە من کرد ، لە دەستم دەرچوو
کیژەکی وەکو مەرزنگیانە»
شایەر :
«دەنا شەرت بێ سەکتەی پیێ بکەم بیکەمەوە بێگیانە
چونکە شەوڕۆی بە مەرزنگیان دەکا ، لیێ تێك دەچیتەوە
زنجیری دەزولفانە
هەك نەمێنم نەوەکو خەوی بشکێتەوە لە چاوانی
حادزبێ شلومل و لەبەردلانە ، مردن بۆ من چاکترە لەو
حەسرەتو گیان کێشانە
هەك نەمێنم نەژیم بەو ژیانە ، بە سێ ڕۆژی دیکانە دەیگێڕمەوە
کەژاوە»
پردەوان : (دەچێتە لای خێزانەکەی خۆی) مەنیج گیان
مەنیج : (بەتوورەیی) خۆرکت لیێکەویێ ، چیت ئەویێ ؟
پردەوان : پاڵە ، زۆڵێ ، زۆڵێ (پێدەکەنێ)
مەنیج : خەونت دیووە ؟
پردەوان : (بەقاقای پێکەنین) پیاوێك سێسەد زێڵی داوەمەتیێو
کچەکەیشی سیێ زێڵ !
مەنیج : (بە دیتنی پارەکە گەشکە دەگرێ) لەبەرچی ، خێریان
کرد ؟
پردەوان : نا . . نا ، وەکو مەسەلەی خۆمو تۆ !
مەنیج : مەسەلەیچی ؟ ئێمە کەی مەسەلەمان هەبووە !
پردەوان : (خۆی دەجوولێنی و لە دوورەوە بە دەم لاسای ماچ
کردن دەکاتەوە) بەڵام نازانم بە قسەی کامیان بکەم (قسەکەی
بۆ دەگێڕێتەوە . . قسەکە نابیسترێ)
مەنیج : (بەلاسمیێیەوە) بە قسەی پارە زۆرەکە بکە
پردەوان : (دەروا) باشە ، بە قسەی پاڵە زۆڵەکە دەکەم
شایەر : (ئەم دیمەنە بچووکە بە وێنە پیشاندەدرێ)

«ئەوە شۆڕ مەحمود دەهاتەوە سەر پردیێو پیاوێك لەسەر پردیێ
راوەستاوە دەڵیێ»
شۆڕمەحمود
«پردەوان تووئەو خولایە گەر ئەبەدی یە
بمدەیێ خەبەرەکی بە ڕاست و بە ئەسەحی یە
مامەرەش هات ڕۆیی سەرداری - بێئاو - یێ ، بۆ بەلەخۆ
بوخارایە ؟
ئەتوو ئەو خولایەی ، پردەوان پێم بڵێ لەگەڵیدا بوون هیچ
حورمو کچ و ژن»
شایەر :«ئەوە ڕووی بابێ پردەوانی ڕەش بێ بۆ نەگریا گوتی
پردەوان :
«ئەی ئەمیر بەو ئەلیاسەیکەم ئەگەر دایم خەریکی مەئموری
بەحرانە
بەو خدرەیکەم ئەگەر دایم خەریکی مەئمووری چۆل و بەریانە
بەو موحەمەدەل مستەفایەیکەمە ئەگەر لە خۆشەویستی ووی
دنیای دانە
بە نوحی نەبیکەم ئەگەر عومری دەگەیشتەوە نۆسەد ساڵانە
لەخزمەتی توودا درۆ ناکەم ، هیچ ناکەمەوە بوختانە»
شایەر : (ئەم دیمەنە بە وێنە نیشاندەدرێ)
«دەستی دەدا لە ڕانانە ، ئاوی دەهات لە چاوانە
بە نەعلەتبێ جا ئەویش شەشومو شەیتانە»
لەتەپڵی سەری خۆی دەدا دەستی دەکردەوەبەگریانە .
پردەوان :
«برینت کولاندەمەوە ئەو دەردەم تازە ناکرێتەوە دەرمانە
کیژێکیان دەگەڵ بوو شلومل و نێوی مەرزن گیانە ، بالاٌ بڵندو
گەردن گەشانە
دەیکوت : پاشی شۆڕ مەحمودی مردن خۆشترە لەو ژیانە
تازە چاومان بە یەکتر ناکەویتەوە هەتا ڕۆژی خولاٌ دەکاتەوە
دیوانە
خۆی لە چۆمی هاویشت ئەلعان قەبری ووی زگی ماسی یانە»

شایەر : (ئەم دیمەنە بە وێنە پیشاندەدرێ)
«جا ئەوە شۆڕ مەحمود داحەپەساوە ، هیچ لەکنی نەماوە روحو گیانە
قرمەی لە خەنجەرێ دەهێنا دەتکوت ئەمیر ئەرسەلانە
سەعاتی هەوەل پردەوانی دەکردەوە بێ گیانە»
شۆڕمەحمود :
«ئەمن بە ئاوات بووم بمدەیێ خەبەرێ خۆشی مەرزن گیانە
ماڵەکەم ئاور تێبەردەن با لە ماڵەکەم وەدەر نەکەوتەوە ماڵ و خێزانە»
شایەر : «جا ئەوە شۆڕ مەحمود دەیکوت»
شۆڕمەحمود :
«مەرزن گیان چبکەم هەتا رۆژی قیامەتێ لەمن بوویەوە بە قاتی
جا خۆ نەمانی توو بۆ من باسی سەرە
خودی میراتی من بۆ سەردار عێلان بەجێ‌مینێ ئەوبەر ئەوبەرە
لەسەررا خۆی لە پردێ هاویشتە ئەوبەر ئەوبەرە»
شایەر : (بەوێنە) «جا ئەگەر مەرزن گیان وای دەزانی شۆڕ مەحمود نەهاتەوە
سەد زێڕی‌دا کوتی بمگێڕنەوە بۆ سەر پردێ
ئەگەر هات دیتی هەموو کلکی وولاخیان کردۆتەوە شینە»
مەرزن گیان :
«کورە تووخولاً راستە دەڵێن شۆڕمەحمود لە گێژاوی دەریادا خنکاوە ؟
سەلاًی گەورەوگرانم لێ‌رابوو کەسم لەماڵە باب‌و بابەواناندا نەماوە»
شایەر : مەرزن گیان دەڵێ :
«هەتا ئەوێ رۆژێ دەڵێن رۆژی قیامەتە ، رۆژی مەحشەرە خولاً دیوانی داناوە
کورە گەریدە سو ر ن بۆم بگێڕنەوە بۆم بکەنەوە شەرناخێوی جلیتانێ
تا ئەمن سەری خۆم بەرمەوە بن کووپەڵەی دەخمی سەر
شێلنگەی دەخمخانێ لەبۆ سوارەکەی هات‌ونەهاتی لە گێژاوی دەریادا خنکاوەو بۆتەوە بێ گیانێ»
مەرزن گیان :
«سوار بۆم بگێڕن گەرمەشینێ گەر هیچ شتێك لایەقی شۆڕمەحمود نی‌یە
وەڵڵاهی بیلاًهی ئەمنیش وەکو توو کفنم زگی ماسی‌یە»
شایەر : (بەچاوی بە فرمێسك)
«لە چەپلەی دەدا ئەویش خۆی داویشتەوە دەنێو گەریدە پردی‌یە جا دەڵێ دنیای وێرانەو بناغە رووخاو
دڵێت بە کوێت خۆشکەم ، دنیای نەهاتەوە ، جێگاو ڕێگای شێرانی تێکدراو
لەدەریادا چلۆن شۆڕ مەحمودو مەرزن گیان خنکاو
نۆسەد کەس بوون هەر لە جەماتێ ، لەوێ شێت بوون بۆ حوکم‌و حوکماتێ
دنیای بێ‌وەفا کەست ناگاتێ یا ساحب جەوهەرێ یانە بێ‌هونەر
یان فەرمانبەردار یان ئەمربەر تا شاو سولتان تا میرو بەگلەر
دنیای بێ‌وەفا ، بو کەس ناچیتە سەر ، ئای لەوێ‌کەو لە دنیایە بۆ کەسی نەبوو شەرت‌و وەفایە ، جوانان دەستیان پێ‌دەگرت دنیا ، پیران دەستیان لێ بەردەدایە
چەند خان‌و خاتوون زولفی عەنبەربۆ ناسك جەبینان شیرن چاوو برۆ
ساحب جەوهەران کوڵمە وەك لیمۆ ، عاقیبەت مەرگەو من دەستەو ئەژنۆ
چەند رۆڵەی جوان چەند بالاً نەستەرەن ، هەمووی چاوەڕێ حەوزی کەوسەرن
چەند میروبەگلەر چەند پەر بەسەرن ، عاقیبەت دەبێ خەبەری مەرگ بەرن»

**بۆ ئاگاداری :**

**دەرهێنەر مافی خۆیەتی دەسکاری دەقەکە بکات بۆ سەر شانۆ ، لەگەڵ دەستنیشانکردنی شێوەی ئاوازی گۆرانی‌یەکە . .**

# راپۆرتی پایتەخت

«بەهرە ئامادەی دەکات»

لەم ژمارەیەوە ، نامەی رۆشنبیری لەشاری بەغداوە بەخوێندەوارانی گۆڤاری «کاروان» رادەگەیەنین بەنیازی ئاگاداری خوێندەواران لەو چالاکیە نوێیانەی لە پایتەخت دەکرێ لە لایەکو لەلایەکی‌تر وەك تۆمارێکی روشنبیری کە دەمێکە «کاروان» ئەم رێبازەی گرتووە .

● **گۆڤاری بەیان**

**ژمارەی نوێو ئاواتی نوێ**

گۆڤاری «بەیان» کە گۆڤارێکی مانگانەی ئەدەبی‌یەو لە شاری بەغدادەوە لە دەزگای رۆشنبیری‌و بلاوکردنەوەی کوردی دەردەچێت ژمارەی ١١٦ی سالی هەژدەهەمی لیَ دەرچوو دوای ئەوەی لەمانگی تشرینی دووەمی رابووردووەوە حەڤدە سالی لەتەمەنی بەخششی ئەدەبی‌و رۆشنبیری لەدنیای رۆژنامەنووسی کوردیدا بەسەر برد .

لەم‌ژمارەیەدا : تۆماری جەنگ‌و لێکولینەوەی ئەدەبی‌و چیرۆك‌و رەخنەو شیعرو کەلەپوورو بەرهەمی لاوانو راپۆرتی رۆشنبیری بلاوکراوەتەوە کە ژمارەیەکی دیار لە ئەدیب‌و نووسەرانمان بەشداری‌یان لە نووسینیدا کردوە .

● **رۆژی کوردستان**

گۆڤاری «رۆژی کوردستان» کە گۆڤارێکی رۆشنبیری گشتی‌یەو بەهەردوو زمانی عەرەبی‌و کوردی کۆمەلەی رۆشنبیری کوردی لەبەغداد دەری دەکات لەم دواییەدا ژمارەی (٧٠)ی لیَ‌دەرچوو ، لەم ژمارەیەدا لەبەشی عەرەبی‌یەکەی چەند باس‌و بابەت بلاوکراونەتەوە کە پەیوەندی‌یان بەئەدەب‌و رۆشنبیری کوردی‌یەوە هەیەو لەبەشی کوردی‌یەکەیدا دیسان چەندان باس‌و بابەتی ئەدەبی‌و هونەری‌و بابەتی رۆشنبیری گشتی بلاوکراوەتەوە .

● **دەزگای رۆشنبیری‌و بلاوکردنەوەی کوردی‌و چاپکراوی نوێ**

لە دەزگای ورۆشنبیری‌و بلاوکردنەوەی کوردی‌یەوە لەبەغداد نەخشەی چاپکردن‌و بلاوکردنەوەی بەرهەمی ئەدەبی‌و رۆشنبیری ئەدیب‌و نووسەرانی کورد بەردەوامەو لەم‌دواییەدا ئەم بەرهەمانە لەو دەزگایەوە دەرچوون :

- **(بۆ ئەمیری حەسەن پوور لە هەرکوێیەك بێت)**

لەنووسینی مامۆستا مەسعوود محەمەد ژمارە ١٠٢ی چاپکراوەکانی دەزگایەو لە ١٧٤ لاپەرەی قەوارە مام ناوندیدایە .

- **(مامکێن کوردی)** بریتی‌یە لە کۆمەلی پەندو مەتەلی کوردی مامۆستا احمد عبدالله زەرۆ ئامادەی کردوون‌و لەسەریانی نووسیوەو ژمارە ١١٢ی چاپکراوەکانی دەزگایە لە ١٠٤ لاپەرەدا .
- **(پەیڤێت دلی)** کۆمەلە شیعرێکی شاعیر قسیم حسن محمد امین‌و ژمارە ١١٨ی چاپکراوەکانی دەزگای رۆشنبیری‌یە لە ٦٤ لاپەرەدا کە ٢٢ شیعری شاعیری تیایە .
- **(گەنجینەی گۆرانی کوردی)** ژمارەی ١٢٠ی چاپکراوی دەزگای رۆشنبیری‌و بلاوکردنەوەی کوردی کتێبێکە بە ناوی



گەنجینەی گۆرانی کوردی‌یەوە کە مامۆستا عثمان شارباژێری کۆی‌کردنەتەوەو لەسەریانی نووسی‌وەو بریتی‌یە لە ٤٢٠ لاپەرە .

– **(پەندی کوردی)** بەرگی سی‌یەمی ئەم کتێبە کە مامۆستا عمر شیخ‌الله دەشتەکی کۆی کردوونەتەوەو لێیانی کۆڵیوەتەوە چاپکراوی ژمارە ١٢١ی ئەم دەزگایە لە ٨٨ لاپەرەدا .

● **دوا وەرزی رۆشنبیری کۆمەڵەی رۆشنبیری کوردی لە بەغداد**

لە ناوەراستی مانگی دوودا کۆمەڵەی روشنبیری کوردی لە بەغداد دووەم وەرزی رۆشنبیری تەواوکرد کە چەند لایەنێکی چالاکی رۆشنبیری‌و سیاسی‌و ئەدەبی‌و هونەری گرتەوە لەو وەرزەدا کۆمەڵ ئەم چالاکی‌یانەی پێشکەش کرد : (باری رۆشنبیری ناوچەی کوردستان) باسێك بوو د . بدرخان سندی پێشکەشی کردو لە سەرەتادا مامۆستا عبد الستار کاظم بە وتارێك وەرزی رۆشنبیری راگەیاندنو خاوەن باسی بە ئامادەبووان پێشکەش‌کردو دوکتور بدرخان لەباسەکەیدا بەوردی‌و مەوزوعی باری پێشکەوتووی رۆشنبیری‌و ئەدەبی کوردی لەناوچەی کوردستانی عیراق پێشکەش کرد .

– **(پێشانگای بەفرو چیا** : بریتی‌بوو لە پێشانگایەکی وێنەی فۆتوگرافی رەنگاو رەنگ کە بەکامیرای هونەرمەند فارس سعدی گیراونو دیمەنی هەمە رەنگی ناوچەی کوردستانیان دەنواند لە وەرزی بەفر بارینداو پێش‌نگا کە لەلایەن مامۆستا هاشم حسن عقراوی وەزیر دەولەت سەرەکی کۆمەڵەوە کرایەوەو پێنج رۆژی خایاند .

– **پێشانگای هونەرمەند وەهبی رەسول** :

لەم پێشانگایەدا بەرهەمە هونەری‌یەکانی هونەرمەندی‌لاو وەهبی رەسول پیشاندرانو ماوەی ٥ رۆژی خایاندو تابلۆکانی ئەم هونەرمەندە کە هەندێکیان بە بۆیاخی زەیتی‌و هەندێکی‌تریان بەقەڵەمی رەش کێشرابوون لایەنەکانی ژیانی رۆژانەی کۆمەڵی کوردەواریان گرتبوەخۆ

– **شیعری ئەمرۆمانو باری سەرنج** :

لەم کۆرەدا شاعیر عبدالله عباس باسێکی دەربارەی شیعری هاوچەرخی کوردی پێشکەش‌کردو لەدوایی باسەکەیدا چەند شیعرێکی خوێندەوە . کۆرەکە لەلایەن مامۆستای شاعیر محمد بدری‌یەوە پێشکەش‌کرا .

● **هەواڵی تری روشنبیری لەپایتەختەوە**

**١ – بەیاتی لە دوا گفتوگۆدا** :

بەشی رۆشنبیری گۆڤاری «التضامن» لە ژمارەی ١٥١دا گفتوگۆیەکی تیرو تەسەلی لەگەڵ شاعیری ناسراوی عیراق عبدالوهاب بەیاتی‌دا کردوە کە زۆر لایەنی ژیانی تایبەتی خۆی‌و بزوتنەوەی شیعری عیراق‌و عەرەبی گرتۆتەوە ، بەیاتی لە وەڵامی پرسیارێکدا دەربارەی ژیانی خۆی لەم گفتوگۆیەدا دەڵێت :

(هێشتا واهەست دەکەم تەمەنم شەش ساڵانەیەو لەسەرەتای تەمەنی منداڵیمدام ، هەست‌بەوە ناکەم شتێکم خەسار کردبێت یان قازانجێکم کردبێت ، ئەوەی هەستی پی‌دەکەم ئەوەیە تەواو ژیان ژیاوم ، لێرەدا وەك شاعیری مەزن «اسدالله غالب» دەڵێت (ژیانم لەگەڵ ئەوەدا بەهەژاری بردە سەرو هەژار بووم ، بەڵام توانیم وای‌لێ بکەم لەژیانی پاشاکان بەتام‌تر بێت) . . سەرەرای ئێش‌و ئازارو کۆسپ‌و تەگەرە ژیانێکی دەوڵەمەندو خۆش ژیام لەبەر ئەوە لە هیچ شت پەشیمان‌نیم . . هەست ناکەم هیچم لەدەست چووبێت ئەوەی بۆم هەیە بیڵێم . . ژیان . . ژیام . . !) .

# كاروانی رۆشنبیری له کوردستاندا

## له هەولێر

دژوار : ئامادەی کردووە

### شانۆگەری هۆشیاربوونەوە

قوتابخانەی ئامادەیی هەولێری کوڕان لە ڕۆژی ۱۹۸٦/۱/۷دا شانۆگەریی (هۆشیاربونەوە)ی لە نووسینو دەرهێنانی حمد رەنجدەر پێشکەش‌کرد . لە سەرەتاوە دەرهێنەر وتی (هەر لە کۆنەوە لەوکاتەی مرۆڤ پیی نـاوەتە ئەم ژیانە ، بە دوای ژیانێکی چاکترو خۆشتردا گەڕاوە . . بۆیە گەلیٚ جار مرۆڤ لە پێناو ژیانێکی پڕ خۆشیو سەربەرزی گیانی خۆی بەخت دەکاو ئەبێتە نموونەیەکی قارەمانێتیو ئازایەتی بۆ گەلەکەی دەمێنێتەوە ، لاپەڕەیەکی پڕ شانازی لە مێژووی گەلەکەی پڕ دەکاتەوە)

ئەوەی شایانی باسە ئەم ئەکتەرانە بەشداری شانۆگەریەکەیان کرد : حمد رەنجدەر – حیکات‌خوان ، خلیل عزیز – شێرکۆ ، ئەدیبە عزیز – ئەدیبە ، نەوزاد عبداللە – باوك ، سعید شێخانی – پیاوە زاناکە ، حکیم ولیا – پیاوی (۲) ، مهدی عباس – قۆمیسەر ، کامەران عبدالکریم – پۆلیس ، خطاب حامد کاروانی – عمر ئاغە ، محمد حسن – قادر بەگ ، مظفر عبداللەو خەسرۆ احمدو ادریس بهجت دەوری بەندکراوەکانیان بینی ، انور اسماعیل بە گۆرانی گوتن بەشداری کرد .



### کەلیلەو دمنە

شاکاری فەیلەسوفی هند بەیدابا کە لەسەردەمی فەرمانڕەوایی دەبشەلیم ، پاشای هندستان لەسەر زاری باڵندەو گیانداران کۆکراوەتەوەو پڕە لە چیرۆکی پەروەردەییو قسەی نەستەق . ئەم شاکارە لەسەردەمی عەباسی‌یەکان عەبدڵڵای موقەفەع کردوویە بەعەرەبیو مامۆستا عومەر توفیق لە ساڵی ۱۹۷۰دا بۆ یەکەم جار وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی .

لە چالاکی‌یەکانی دەزگای ڕوشنبیریو بلاوکردنەوەی کوردی ، لە ڕۆژی ۱۹۸٦/۲/۱۰و ، ڕۆژانی‌تر . . لە ئامادەکردنو دەرهێنانی کاك محسن محەمەد حەمەد ، چیرۆکی (شێروگا) کە بەشێکی ئەم شاکارە بەناوبانگەیە لەسەر شانۆی ڕۆشنبیری جەماوەر پێشکەشی بینەرانی کردو ، بە ئومێدی ئەوەن کە لە ساڵی ئایندەدا (کۆترە ڕازاوە) بۆ شانۆ ئامادە بکەن .

کاك محسن دەرهێنەری ئەم شانۆگەری‌یە دەربارەی ئەم هەوڵەی وتی (واجارێکی‌تر لە باغی هونەردا بەیەك دەگەینەوە ، ئەو باغەی کە ژیان بەرەو خۆشیو چاكو چاکتر دەبات ، سەر بڵندین بە دڵشاد بوونتانو هاتنتان بۆ ئەو مەنزڵگایەی پیرۆزی دەداتە هونەری نەتەوەکەمانو ڕۆڵەکانی دامێنی سەفینی گەردەن کەش . . پیرۆزبیٚ ئەو مەنزڵگایە ، مەزن‌تر بێت ئەو کاروانە سەختەی کە نەوجەوانانو جگەرگۆشەکانی سەفین خەونی پێوە دەبینن) .

ئەکتەرەکان بەگشتی : نەوزاد مستەفا – شێر ، ئیحسان ئەحمەد – ڕێوی ، حەمەد سوار – گوێدرێژ ، شێرزاد زیاد –



پلنگ ، ئەنوەر ئیسماعیل – سەگ ، ئیسماعیل عەزیز – کەروێشك ، ئەدیبە – عەزیز کەروێشك ، جەوهەر ئەنوەر – دمنە ، دڵشاد ئەکرەم * کەلیلە ، عەبدولخالق قادر – پشیلە ، فکری عەزیز * شەترەبە ،

● **چلەی ماتەمینی مامۆستا «عزالدین فیضی»ە**

یەکێتی ی ئەدیبو نووسەرانی کورد – لق هەولێر ، لە رۆژی «١٩٨٦/١/٣٠» ، لە هۆڵی ئەمینداریێتی گشتی ی رۆشنبیریو لاوان ، چلەی ماتەمینی بۆ مامۆستاو ئەدیبو رۆژنامە نووس «عزالدین فیضی» سازکرد .

لە سەرەتادا بە دوو ووتەی کورت بەخێرهاتنی ئامادەبووانکرا ، ئینجا «مەلا جرجیسی هەولێری» چەند ئایەتێکی لە قورئانی پیرۆز خوێندەوە ، دوا بە دوای ئەو ، ووتاری لیژنەی چلەی ماتەم ، لەلایەن کاك عەزیز حەریری خوێندرایەوە . ئیتر ماتەمینەکە بەم شێوەی خوارەوە درێژەی پێدرا . .

● مامۆستا «رشاد مفتی» چەند سەربردەو بیرەوەری یەکی خۆیو مامۆستای خوا لێ خۆشبووی لە شێوەی ووتارێکدا خوێندەوە .

● ووتاری یەکێتی ی ئەدیبو نووسەرانی کورد – لق هەولێر ، لەلایەن برای شاعیر کاك «احمد تاقانە» خوێندرایەوە .

● ووتاری ئەمینداریێتی گشتی رۆشنبیری ی و لاوان لە لایەن مامۆستا محمد محی الدین جێداری ئەمینداری روشنبیری و لاوان خوێندرایەوە .

● ووتاری نەقابەی مامۆستایانی ناوچەی کوردستان لە لایەن مامۆستا ابراهیم محمدامین خوێندرایەوە .

● ووتاری نەقابەی رۆژنامەنووسانی ناوچەی کوردستان لە لایەن مامۆستا ممتاز حەیدەری خوێندرایەوە .

● ووتاری یەکەی سەرپەرشتیاری پەروەردەیی سەرەتایی لە بەرێوەبەرایەتی گشتی ی پەروەردەی هەولێر لە لایەن مامۆستا کمال بەرزنجی خوێندرایەوە .

● ووتاری دەزگای رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی لە لایەن مامۆستا محمود زامدار خوێندرایەوە .

● ووتاری یەکێتی ی ئەدیبو نووسەرانی کورد لق سلێمانی لە لایەن کاك محمدامین پێنجوێنی شاعیر خوێندرایەوە .

● ووتاری یەکێتی ی ئەدیبو نووسەرانی کورد لق دهۆك لە لایەن کاك انور محمد طاهر خوێندرایەوە .

● بیرەوەری یەکانی مەلا مجید گوێری لەگەڵ





خوالیٚخۆشبوودا له لایەن کاك عبدالخالق سەرسام خوێندرایەوە .

- ووتاری بنەماڵەی خوالیٚخۆشبوو لەلایەن مامۆستا سۆران عزالدین فیضی خوێندرایەوە .
- کۆرێکی ئەدەبی بە ناونیشانی عزالدین فیضی مرۆڤ‌و مامۆستاو رۆژنامەنووس‌و نووسەری کورد ، له لایەن مامۆستا کریم شارەزا پێشکەش‌کرا . له سەرەتادا مامۆستا شارەزا ووتی (له گوندێکی خامۆشی کوردستانی گیرۆدەی برسیەتی گرانیبە کوشندەکەی دوا دوای جەنگی یەکەمی جیهاندا ، گوندی (سەیدان)ی سەر بە هەولێر ، له رۆژێکی تاریك‌و تەنگی ساڵی ۱۹۱۷دا ، له خێزانێکی فەلاحی رەنجدەر ، منداڵێکی چاو گەشی گەنم رەنگ چاوی ژیانی هەڵێناو زایەڵەی گریانی بوو بە مژدەهێنی نزیك بوونەوەی رۆژی برانەوەی جەنگی پڕ کارەساتی وێرانکاری‌ی سامناك‌و کاتی له دایك‌بوونی ئاسایش‌و هێمنی‌ی جیهان له دوا رۆژێکی نزیك‌دا . بەم جۆرە سەرەتای کاروانی ژیانی پڕ له تاڵی‌و ترشی‌و خۆشی‌و ناخۆشی عیزەدین کوری فەیزی‌بە فەندی کوری مەلا عەبدوڵلای زانای ئاین پەروەری نەوەی زانای گەورەی کورد مەلا جەرجیسی ئەربیللی دەستی پێ‌کردو کەوتە سەر رێ‌ی هات‌و نەهاتی دنیای ئەم سەردەمە ئاڵۆزەی ئادەمیزاد .

دوای ئەم پێشەکی‌یە ، مامۆستا شارەزا باسەکەی خۆی بەسەر چوار برگەدا ، دابەش‌کردوو ، بە شێوەیەکی چرو پوخت ئەم چوار لایەنەی باسەکەی بۆ ئامادەبووان روونکردەوە :

- «عزالدین فیضی» مامۆستا .
- «عزالدین فیضی» نووسەری کورد .
- بەرهەمە چاپکراوەکان‌و چاپ نەکراوەکانی .
- «عزالدین فیضی» مرۆڤ‌و نیشتمان پەروەر .

– ئەوەی شایانی باسکردنە ، خەڵکێکی زۆر له هاوری‌و دۆست‌و دڵسۆزانی مامۆستای نەمر ، بەشداری‌یان له چلەی ماتەمینەکەدا کرد ، ئەمەیش بۆ ئەو پایەو رێزەی مامۆستا «عزالدین فیضی» دەگەرێتەوە ، کە له نێو دڵ‌و دەروونی زوربەی زۆری خەڵکی ناوچەکەدا جێگەی خۆی گرتۆتەوە ، هەر لەم ماتەمینەیشدا هەندێ ئەدیبی هاوری‌و دۆستی مامۆستای خوا لیٚخۆشبوو ، له شاری سلێمانی‌و دهۆکەوە هاتبوون . .

### کاروان‌و کاروانچی

به چاودێری بەرێز محمدامین محمد احمد ئەمینداری گشتی رۆشنبیری‌و لاوان سەر نووسەری گۆڤاری کاروان ، دەستەی نووسەرانی کاروان کۆبوونەوەیەکی فرەوانی له ئێوارەی رۆژی ۱۹۸٦/۲/۹ له بنکەی گۆڤاری کارواندا سازکرد ، بۆ پێشخستن‌و پەرەپێدانی گۆڤاری کاروان‌و بۆ زێدەخزمەت‌کردنی رۆشنبیری نەتەوەکەمان . له سەرەتاوە بەرێز مامۆستا حسین عارف جێداری سەر نووسەر بەخێرهاتنی بەرێز سەرنووسەرو دەستەی نووسەران‌و بەرێوەبەرانی دیوانی ئەمینداریتی کردو باسی پووختەیەکی مەبەستی ئەم کۆبوونەوەیەی کرد . ئینجا بەرێز سەر نووسەر باسی له دایك بوونی گۆڤاری کاروان‌و پاشکۆکەی کردو لەم ماوەیەدا چی‌وەدەست هێناوەو له ساڵی نوێ‌داو ساڵانی‌تردا چیان دەوێ بۆ زێدە خزمەت‌کردنی ئەم لایەنە گرنگانەی رۆشنبیری‌ی میللەتەکەمان‌و ئەرکی سەرشانی هەر یەکە له ئێمەمانان – واتە سەر نووسەرو دەستەی

نووسەران .

دوا بە دوای ئەمە بەڕێزی داوای لە هەر یەکەی دەستەی نووسەران لە هەموو بەشەکانیدا کرد کە ئامۆژگاریو بۆچوونەکانیان باس بکەن ، بۆ ئەم مەبەستەیش هەر یەکە بە پێی ئیشووکاری خۆی گفتوگۆیان کرد ، دەتوانین بەم خاڵە سەرەکیانە ئەنجامی کۆبوونەوەکە بدەینە دەست :

– هەوڵدان بۆ پاش نەکەوتنی دەرچوونی گۆڤار لە کاتی دیارکراوی خۆیدا .

– هەر چەندە کاروان بۆتە منبەری زیاتر لە پێنج سەد نووسەری کوردو لەبەر ئەوەی گۆڤاری کاروان مولکی میللەتە پێویستە جێگای هەموو رۆشنبیرو ئەدیبو نووسەری کورد بکاتەوە .

– هەوڵدان بۆ پێگەیاندنی کادیری رۆژنامەنووسی کوردو لە دوایبدا دەزگایەکی رۆژنامەگەری کورد .

– وەرگرتنی بیرو رای ئەدیبانو نووسەرانی کورد بۆ چۆنیەتی پەرەپیدانو پێشخستنی ئەم گۆڤارەو دەزگاکەی – واتە بەشداركردنی ئەوانیش لەم پێشخستنە – و سەرەرای چەندان خاڵی‌تر .

## لە سلێمانی

**«ئازاد» ئامادەی کردووە**

**کۆڕ :-**

دەزگای رۆشنبیریو بلاوکردنەوەی کوردی- لقی سلێمانی ، وەرزی رۆشنبیریی ئەمساڵ (١٩٨٦)ی بە کۆڕێك دەستپێکرد کە بۆ خوێندنەوەو هەڵسەنگاندنی چیرۆکی لاوان ، لە رۆژی هەینی رێکەوتی ٣١-١-١٩٨٦ داو لە هۆڵی نیقابەی کرێکاران سازکرا .

سێ چیرۆکنووسی لاو کە تازە پێیان ناوەتە جیهانی چیرۆکەوە ، هەریەکەیان بە کورتە چیرۆکێك لەم کۆڕەدا بەشداری کرد :-

١ – ساڵح بێچار بە چیرۆکی «نوێبوونەوەی زامی دەروونێك»

٢ – رێزان حسێن بە چیرۆکی «کرێکار» .

٣ – دڵسۆز عەبدولرەحمان بە چیرۆکی «شەوێکی ناو کۆشکەکە» پاش خوێندنەوەی چیرۆکەکان چیرۆکنووس کاك «محەمەد رەشید فەتاح» بە تۆژینەوەیەك لە ژێر ناوی (باچرۆکان بگەشێنەوە – لاکردنەوە لە سێ تاقیکردنەوەی لاوان)دا لە رووی ناوەرۆکەوە لە چیرۆکەکان دواو هەڵیسەنگاندن ، دوای ئەمیش کاك دڵشاد مەریوانی هەڵساو سەبارەت هەندێ لایەنی تەکنیکی چیرۆکەکان چەند راو سەرنجێکی خستە روو ، لە کۆتاییدا چەند پرسیارێك لەلایەن ئامادە بووانەوە ئاراستەی چیرۆکنووسەکانو هەڵسەنگێنەر کراو بەمە کۆڕەکە کۆتایی پێ هێنرا .



ئەوەی شایانی باسە ژمارەیەکی زۆر لە ئەدیبو ئەدەب دۆستان ئامادەی کۆڕەکە بوون .

### «کۆڕێکی زانستی»

هەر لەلایەن دەزگای رۆشنبیریو بلاوکردنەوەی کوردیەوەو لە رۆژی پێنجشەمە رێکەوتی ٦-٢-١٩٨٦ دا کۆڕێك بۆ مامۆستایان (کەمال جەلال غەریب)و (کەمال نوری مەعروف) لە هۆڵی کارگەی جگەرەی سلێمانی سازکرا .

باسەکەی مامۆستا (کەمال جەلال) بە ناونیشانی (زانیاریو زانست لە کوردەواریدا) بوو ، کە بە شێوەیەکی مەنهەجیانە بە سەر ئەم خالانەدا دابەشی کردبوو :-

١ - واتای زانیاریو جۆرەکانیو مێژووی گەشەکردنی زانیاریەکان .
٢ - رۆڵی دەزگا زانیاریو پەروەردەییو رۆشنبیریە کوردیەکان لە پێشخستنی ئاستی زانیاریی کورددا .
٣ - وەرگێرانی زانیاریانە .
٤ - رۆڵی بەیانی (١١)ی ئازار لە پێشخستنی ئاستی زانیاریی کورددا .
٥ - زاراوەی زانیاری کوردی .
٦ - باری زانیاریی ئێستامان .
٧ - ئەو سامانە کوردەواریانەی کە دەشێن لێکۆڵینەوەیان لە سەر بکرێت .
٨ - کەلەپووری زانیاریی کورد .
٩ - پەیوەندیی زانیاری بە ئەدەبەوە .
١٠ - خەیاڵ (ئەندێشە)ی زانیاری .
١١ - نوقلانە لێدانی زانیاریانە .
١٢ - لیستەی ناوی زانا کوردەکانی ئەم سەردەمە .
١٣ - نووسینەوەی مێژووی زانیاری کوردی .

پاشان هاتە سەر دەستنیشانکردنی ئەو هۆیانەی بوونەتە لەمپەر لە رێی دواکەوتنی باری زانیاری کوردیدا ، دوای ئەمیش بانگاشەی پرۆژەیەکی کرد بۆ بەرزکردنەوەی باری زانیاری لە کوردەواریداو بەمە کۆتایی بە باسە بەنرخەکەی هێنا .

تۆژینەوەکەی مامۆستا (کەمال نوری مەعروف)یش لەژێر ناوی (ئەشکەوتەکەی گوندۆكو نەخشە هەڵکەندراوەکانی)یەوە بوو ، تیایدا بە تێرو تەسەلی لەمەڕ ئەو ئاسەوارە دێرینەوە دواو زۆر راستیی پەنهانی سەبارەت ئەو شوێنەوارە روون کردەوە .



### «چوار کورتە چیرۆك لە کۆڕێکدا»

(رەشەباکە ، وەسیلە ، ئیرهاب ، هەردوو لاو شاهیدێك) ، بەم ناونیشانانە چوار چیرۆکی کورت لەلایەن هەردوو چیرۆکنوسی لاو (کامەران رەفیق - خاوەنی دوو چیرۆکی یەکەم)و (ئاریان فەرەج)ەوە لە ئێوارە کۆڕێکدا کە لە رێکەوتی ٦-٢-١٩٨٦ دا گێرا خوێندرانەوە . ئەم کۆڕە بەڕێوەبەرێتی روشنبیریی جەماوەر لە سلێمانیو لە هۆڵی یەکێتی نیقابەی کرێکارانی سلێمانی بۆیانی ساز کردبوو .

دوای خوێندنەوەی چیرۆکەکان برایان کاك عەبدولکەریم حەسەنو کاك دڵشاد مەریوانی هەڵسانو باری سەرنجی خۆیان ئاراستەی تەکنیكو ناوەرۆکی چیرۆکەکان کرد .

پاش ئەمانیش چەند پرسیارێك لەلایەن ئامادەبووانەوە ئاراستەی چیرۆکنووسەکان کراو بەمە کۆتایی بە کۆڕەکە هێنرا .

**«تیۆری‌ی دراما لای ئەرستۆ»**

لە ئێوارەی رۆژی دووشەمە رێکەوتی ١٠-٢-٨٦ داو لە هۆڵی یەکێتی نیقابەی کرێکارانی سلێمانی ، دەزگای رۆشنبیری‌و بلاوکردنەوەی کوردی کۆڕێکی شانۆیی بە ناونیشانی «تیۆری‌ی دراما لای ئەرستۆ»وە بۆ (ئازاد بەرزنجی) سازکرد .

دوای ئەوەی کۆڕگێڕ (دانا عەلی) پێ‌ی لە پێویستی بوونی ئەو جۆرە توێژینەوانە داگرت ، خاوەن باس ئەو سەرچاوانەی دەسنیشان کرد کە سوودی لێیان وەرگرتبوو وپاشان دەستی بە خوێندنەوەی باسەکەی کردو وردە وردە کەوتە شیکردنەوەو تاوتوێ کردنی تیوری‌ی دراما لای ئەرسطۆ لە میانەی کتێبی «هونەری شیعر»ەکەیەوە .

لە سەرەتادا بە کورتی لەمەڕ سەرهەڵدانی دراما لای یۆنانیە کۆنەکان دواو پاشان چەمکی «شیعر»و «لاسایی‌کردنەوە»ی لای «ئەفلاطون»و «ئەرسطۆ» روونکردەوەو ئینجا هاتە سەر دیاریکردنی جۆرەکانی شیعر لای ئەرسطۆ کەبرێتین لە (تراژیدیاو کۆمێدیاو داستان) ، پاشان لەمەڕ توخمە پێکهێنەرەکانی تراژیدیاوە لای ئەرستۆ دواو ووتی (ئەو تــــــــوخمانەی تراژیدیایان لێ پێکدێ برێتین لە :- چیرۆك ، ئاکار ، فیکر ، ئەمانە توخمە سەرەکیەکانن ، هەروەها :- زمان ، دیمەن ، سروود (یاگۆرانی) کە توخمە لاوەکیەکانن) .

دوای ئەوە بەشە پێکهێنەرەکانی تراژیدیای بەم شێوەیە دیاری کرد (گۆڕان ، ناسینەوە ، گرێ ، چارەسەر ، ئازارئەنگێز)و سی‌ی‌کردنەوە ، دوابەدوای ئەمەیش سەبارەت مەسەلەیەکی گرنگ لە تیۆریەکەی ئەرستۆدا دوا کە «پاکژکردنەوە - کاثارسیس»ەو ئامانجی تراژیدیایە ، پاشان باسی کۆمێدیاو داستانی کردو بەمە کۆتایی بە باسەکە هات .

دوای تەواوبوونی خوێندنەوەکە هەندێك لە ئامادەبووان هەڵسانو راوباری سەرنجی خۆیان سەبارەت باسەکە خستە روو لەوانە :- بەیاد عەبدولقادر ، سەربەست خەسرەو ، ئاراس عەزیز ، ئینجا چەند پرسیارێك ئاراستەی خاوەن باس کراو وەرام درانەوەو بەمە کۆتایی بە کۆڕەکە هات

ئەوەی جی‌ی سەرنجە ژمارەیەکی زۆر لە ئەدیب‌و ئەدەب دۆستان ئامادەی کۆڕەکە بوون .

● **پیشانگا** :-

**«پیشانگایەکی هاوبەش»**

بەڕێوەبەرێتی رۆشنبیری‌ی جەماوەر لە سلێمانی لە ١٢-٢/تا ١٩-٢-١٩٨٦و لە هۆڵی مۆزەخانەی سلێمانی پیشانگایەکی هاوبەشی بۆ کاك (ئاشتی مەهدی) و (عەلی وەیس کردەوە

لە کارە پیشاندراوەکانی کاك ئاشتی مەهدی :-

رەوورەوەی ژیان - گۆگرد

ژیانو ئاشتی - گەچ

خۆشەویستی - هێڵکاری

● لە ساڵی ١٩٦٥ لە قادرکەرەم لەدایك‌بووە .

● ساڵی ١٩٨٥ پیشانگایەکی تایبەتی هێڵکاری لە کەرکوك بۆکراوەتەوە .

● قوتابی‌ی دواپۆلی پەیمانگای هونەرە جوانەکانی سلێمانی‌یە - بەشی پەیکەرتاشین .

لە تابلۆ پیشاندراوەکانی کاك (عەلی یوسف)یش لەم پیشانگایەدا :-

قەڵای کەرکوك - زەیتی

کوا ئاشتی - کۆلاج

چایخانە - گرافیك

● لە ساڵی ١٩٦٠ لە کەرکوك لەدایك‌بووە .

● ساڵی ١٩٨١ بەشداری یەکەم پیشانگای هونەرە جوانەکانی موسڵی کردووە .

● ساڵی ١٩٨٣ پەیمانگای هونەرە جوانەکانی بەغدادی تەواوکردووە .

# له دهۆك

**ئامادەکرنا : مەتین**

## ● پێشانگەها هونەرمەندێ کورد «اسماعیل خیاط» .

ژچالاکیێت دەزگەها رەوشەنبیری‌و بەلاڤکرنا کوردی ل‌ژێر چاڤدێریا هێژا محمد أمین عبو ی جێگرێ پارێزگەرێ دهوکێ ل رێکەفتی ٣-٢-١٩٨٦ ل هولاً خاندنگەها گولستان ، پێشانگەها هونەرمەندێ کورد اسماعیل خیاط ی هاتە ڤەکرن . ژ هژمارەکا مەزن یا رەوشەنبیرێت کورد بو دەمێ سێ رۆژا سەرەدان برنە ڤێ پێشانگەها سەرکەفتی .

کارێت پێشانگەهێ ژ ٣٢ کەڤالا پێکهاتینە ، سەربورا کاك اسماعیل ی ژسالا ١٩٦٣ یێ و تا سالا ١٩٧٥ خویا دکەت ، قوناغا مەیینا کەسوکاتیا وی یا هونەری خویا دکەت .

ئەڤ کارێت وی لوکەکا بلند دەست‌نیشان دکەن ، «لبن بارانێ – هویردە فروشەك – ژوینەیێت شکەفتا – فالچی – دەیکا من – گوندی‌یەك – دارەك» ئەڤ کارە تامەکا تایبەتی ددەنە مروڤی ، دەرگەهێت داهینەری‌و بەهرەوەریا کاك اسماعیل ی ل مە ل‌تاق دکەن . بو چێکرنا کەڤالێت خو ژی ئەڤ کەرەستە بکارە ئینانینە :

«رەنگێت ئاڤی – قەلەم رساس – مەرکەبێ چینیێ رەنگ * رەنگێت ماچیك» .

چاخێ مروڤ سەیرانەکێ دبەتە باغێ کاك اسماعیل ی یێ رەنگین‌و خ پڕ خەمل دلێ مروڤی بێ‌قام ڤەدبیت‌و گەش دبیت ، کارێت وی هەست‌و نەستێت بینەری دئارزینن‌و لنیڤەکا جیهانەکا تایبەتی ، مشتی بێهنا سروشتێ کوردەواری‌و مروڤایەتیێ .



کەسێت وی ددارێتینە ژهەست‌و نهێنیا ، رویچکێت وان هەتا وێ رادی دخەمگینن ، دێ‌بێژی کو کاك اسماعیل یێ مە پال‌ددەت کو پشکداریێ لگەل نەخوشیا وان بکەن ، پشت گریا وان بکەین‌و دەستێ وان بگرین . وینێت ژکول‌و کوڤانا دزێن ، مەشاهدێت تێکرا ، هەر وەکی بهەستێت خو یێت سەنگەلاو نەتەبتی شێلاین‌و هەڤیرکرین . کەچی ددەرگەهێ هشیاریێ‌و خوارگرتنا بیری‌را ڤ ژوور دکەڤیتە سروشتی‌و بابەتێت کارێت خو . چاخی، مروڤ هویرك بیناهیا خو دئێخیتە رەنگێت وی دێ بینیت :

رەنگێت وی دتەنانە ، جارنا دکەڤالەکیدا تەنها رەنگەك بکار ئانیە ، داهینەریا وی ژی ل هێرە یا دهندێ‌را ، کو هندەك رەنگێت دی ژنك خو ژوی رەنگی چێکرینە ، ئەڤە ژی دکەڤالێ «لبن بارانێ» و «گوندی‌یەك»دا ئاشکرایە .

کەکێ خیاط هێزەکا مەزن ژمەرا بەلی‌دکەت دوێنەگرتنا رویچکێن کوردەواریدا ، سەرو سیمایێت کوردا وسا چێکرینە ، تو ل چ ئەردێ ببینی دێ بێژی ئەڤە کوردە چ پێ نەڤێت !

هەر وەکی یا خویا دکەڤالێ «رویەك ژ خانەقینێ» «خیچلك کێشان» ، «دەیکا من» ، «گوندی یەك» . کەڤالێ «وینەیەك ژ شکەفتێ» ، چاڤێ ئاشوپیێ‌و چاڤێ چاڤ دئێخنە کاری بهەڤرا . جانەوەرەکێ لسەر تاقێ شکەفتێ لبەر روناهیا ئاگری دبرسکیت‌و تاری دبیت ، پێکولێ دکەت ژکەڤلوژانکێ خو دەرکەڤیت‌و خو ڤەدکێشیت‌و مینا سیتاڤکێ وندا دبیت . ئەڤ کەڤالە هەر وەکی دڤێت ژمەرا بێژیت : کو مروڤ هند شیان‌و پێڤەهاتنا یا هەی کو هەمی تشتا ببینیت ، دیسان شوین تلێت مروڤا لسەر دیوارێت شکەفتێ ، مەزنیا مروڤی ل قەلەم ددەن .

## زنجیرەکا ڤەکولینا لسەر جەگەرخوینێ نەمر

ژ بزاڤێت تایێ دهوکێ یێ ئێکەتیا تورەڤانو نفیسڤانێت کورد ، ل رۆژا چوارشەمێ رێکەفتی ٥-٢-١٩٨٦ ل هولا چالاکیێت خاندنگەهاو لژێر چاڤدێریا هێژا محمد أمین عبو ی جێگرێ پارێزگەرێ دهوکێ ، زنجیرە ڤەکولینەك هاتە ڤەکرن ، بو هوزانڤانێ کوردێ نەمر جەگەرخوین ی . ژ رێڤە هژمارەکا گوتارا هاتنە خواندن ژ لایێ جێگرێ پارێزگەریڤەو هەڤال عبدالسلام عناز جێگرێ رازگرێ تایێ دهوکێ ، یێ پارتا بەعسا عەرەبیا هەڤپشکیو گوتارا لقێ کوردستانێو پاش یا لقێ دهوکێ یا ئێکەتیا ئەدیبو نفیسڤانێت کورد . د دویڤدا بڤێ شێوێ ژێری ڤەکولینا دەستپێکر :

(١) – مصطفی نەریمان : بەراوردکرنەك لناڤبەرا ئەسیریو جەگەرخوینی .

(٢) – حجی جعفر : ڤەکولین و شەکرن لسەر هەلبەستەکا جەگەرخوینی . کاك عبدالخالق سەرسامی رێڤەبەریا ڤان هەردو کورا کر .

(٣) – عبدالکریم فندی : کەلەپور د شعرا جەگەرخوین یدا .

(٤) – سگڤان عبدالحکیم : خویندنو زانین د شعرا جەگەرخوین یدا . ئەڤ هەردوو کورەژی هاتنە رێڤەبرن ژ لایێ تورەڤانێ هێژا ڤە کەریم زەندی .

ئەڤە ل سپێدێو ئێڤاریا رۆژا ٥-٢-١٩٨٦ . ل رۆژا ٦-٢-١٩٨٦ ژی ، ئەڤ کورە هاتنە پێشکێش کرن :

(٥) – تیلی أمین : زمانێ شعری د دیوانا ئێکێدا .

(٦) – صبری بوتانی : بیرانینێت من لگەل جەگەرخوینیی .

ئەڤ هەردوو کورە ژی ژ لایێ هوزانڤانێ هێژا محمد البدری ڤە هاتنە بێڤەبرن .

ئەڤەبو پروگرامێ ڤێ زنجیرە ڤەکولینا بسەرکەفتی .

## «جەگەرخوینو ئەسیری»

سەیدا نەریمانی بڤێ پەیڤێ دەست بڤەکولینا خو کر : «جەگەرخوینو ئەسیری هەردووکیان ئاوارەو دەربەدەربون پەیوەندیەکا موکم دناڤبەرا واندا هەبو ، زۆر لایێت وان پێکڤە دچن . ئارمانجێت وان یەکبونو چ جیاوازیا وەها لناڤبەرا وان نەبو» .

پاش ئەسیریو جەگەرخوین هەردووك دانە نیاسین . دوویڤدا هەلبەستێت ڤان هوزانڤانێت نەمر ژهەڤرا شاندین ل وەختێ خو ژمەرا خاندن .

«ڤەکولینو شەکرن لسەر هەلبەستەکا جەگەرخوین ی» هێژا حجی جعفر پشتی کورتیەکێ لسەر ژیانا هوزانڤانێ نەمر ئاخفتی ، بیرو رایێت هژمارەکا تورەڤانو بسپورا لسەر جەگەرخوین ی خویا کرن ، ژوان توما بوا ، ئوردیخانێ جەلیل ، د . عزالدین مصطفی رسول . ددویڤدا کاك حجی پێڤەچو گوت :

ئەم دکارین لسەر زمانی دشعرا جەگەرخوین یدا بنڤیسین چمکی زمانزان بو ، دیسان ئەم دکارین لسەر چیرۆکی دشعرا ویدا بنڤیسین چمکی چیروك نڤیس بو ، هەر وەها ئەم دکارین لسەر شعرا وی بنڤیسین چمکی شاعر بوو گەلەك دیوان یێت هەین .

پاش کاك حجی بەرفرەهی لسەر هەلبستا «سەرهاتیا جوان دەولەتە» ئاخفت ژلایێ روخسارو ناڤەروکاڤەو دویماهیێ تێبینیو ئەنجامێت خو لڤەلەم دانو پاشی ژێدەرێت خو خاندن .

لکوتایێ هژمارەکا برادەرا کەتنە قادا گفتو گوێ لگەل ماموستا نەریمانیو حجی جعفر ی

ژوان : تیلی امین ، محسن قوچان ، کریم بیانی ، خدرێ سلیمان .

## «کەلەپور دشعرا جەگەرخوین یدا»

سەیدا عبدالکریم فندی بەحسێ ڤان لایەنا دشعرا جەگەرخوین یدا کر : ستران ، پەندێن پێشیا ، مێژوو ، ئەدەبێ کوردی ، ژیانا کوردەواری ، بکورتی لسەر ڤان لایەنا ئاخفت ، ل دویماهیێ ژی چەند ژێدەرەك خاندن یێت مفا بو ڤی

گوتارێ خو ژێ وەرگرتین .

### «جەگەرخوینو خاندنو نڤیسین»

پشتی کاك سگڤانی خویا کری کو هژمارەکا مەزن یا هوزانێت جەگەرخوین ی لسەر خاندنو نڤیسینو فێرکرنێ بون ، دیسان گەلەك کوردا بهاریکاریا شعرێت وی خو فێری خاندنێ کریە ، هەر وەها سترانبێژا ژی مفایەکێ مەزن ژخورا ژشعرێت جەگەرخوین ی وەرگرتییە . لدوماهیێ گەلەك بابەتێت ژیانێ کو جەگەرخوینی ی دەرگەهێ وان قوتاین و هوزان لسەر ڤەهاندین ژمەرا خویا کرنو ئەڤ لایەنە شەکرنو تبابەکێ لسەر ئاخڤت . لدویماهیێ هژمارەکا حازرا کەتنە قادا دانو ستاندێ لگەل موحازرا لسەر بیرو رایێت دگوتارێت وان‌دا هاتین .

### «زمانێ شعرێ ددیوانائێکێدا»

ژێڤە کاك تێلی تبابەکێ لسەر فێرگەها کلاسیکی دشعرێدا ئاخڤت ، پاشی پێشەکیەکا درێژ ژمەرا خاند لسەر هوزانڤانێت کوردو زمانێ وان یێ شعری ، ژوان هوزانڤانا : خانی ، نالی ، جزیری ، عەلی‌حەریری ، تەیران ، هتد . ددویڤدا هندەك تێبینی بەلی کرن ژوان :

-- بزمانەکێ سادەو سڤكو زەلال دنڤیس .

– پەیوەندیەکا موکم ئێخستە ناڤبەرا شعرێو دۆزا مروڤێ کورد ، ئەڤە ژی تاقیکرنەکا نوی‌یە دشعرا کوردیدا . وەك هونەرمەند شعرا خو درست پاراست .

– بزمانێ خەلکی یێ رۆژانە دنڤیس .

– زمانەکێ رونو ئاشکرا هەیە .

– رەمز بکار ئینایە ، لێ رەمزێت وی دساناهینەو درون بەلی‌نە .

– دڤیا زمانەکێ کوردی یێ ئێکگرتی بچەسپینیت وی ئەڤ هزرە لبەر بو بەری کو بهێتە عیراقێ . دیسان هوزان ڤەهاندینە بشێوێ ژێریو ژمارەکا ئێکجار زۆر ژبەیڤێت سورانی دشعرێت خودا بکار ئینانە .

– بیرەکا نەتەوەیی یا تیژ هەبو ، لێ شعرێت وی تەنها مینا دروشمێت رامیاریو راگەهاندنێ بون .

### «بیرانینێت من لگەل جەگەرخوینی»

لدویماهیا ڤێ چالاکییا مەزن هوزانڤانێ هێژاو بەرکەفتی صبری بوتانی بو مە بیرهاتنێت خو لگەل هوزانڤانێ نەمر گێران .

پاشی کرە بەحسێ کارکرنا جەگەرخوینی لپێلوەشا کوردی «ئیزگا» لبەغدا کو دوو پروگرام پێشکێش دکرن یەکێ مێژوویی‌و یێ دی یێ زمانەوانی .

پشتی هینگی چەند تێبینییەك خویا کرن ژوان :

– جەگەرخوینی خوەسەری‌یا شعرا کوردی پاراست ژکێشو پیڤانێت بیانی .

– جەگەرخوین ی بزاڤو خەباتەکا مەزن کر کو ئەو فەرهەنگەکا تەڤابی لگەل زاناو شارەزایێت کورد بینیتە گورێ .

پاشی کرە بەحسێ بیرهاتنێت خوە لگەل ل موسلو لبەغداو ل کوردستانێو دویماهیێ ژی بەرهەمێت خودێ لێخوش بو جەماوەرێ حازر هژمارتنو تبابەکێ بەحسێ گرنگییا ڤان بەرهەما کر ژلایێ زمانو نوی‌ژەنیێ لپاناڤا شعرا کوردی .

ئەڤەو هژمارەکا مەزن یا پسیارا هاتنە کرن ژ ئامادەبیاو هێژا صبری بەرسڤا هەمیادا .

هەروەها لسەر بیرو رایێت کو دگوتارا کاك تیلی‌دا هاتین چەند برادەرەك کەتنە قادا گفتوگویێ وەکی کاك رشید فندی ، حسن حجی حسن ، عصمت محمد ، سگڤان عبدالحکیم ، عبدالکریم فندیو گەلەکێت دی . لدویماهیکا ڤێ زنجیرێ پشکدارا برویسکەك بو سەروکێ فەرماندە بلندکرن تێدا دوویات کر راوەستیا خوە وەکی قەلەم هلگر لبەر سینگێ دوژمنێ فارسێ توخم پەرێسو بەرەڤانی ژئاخا وەلاتێ پیروز .

# كاروان

مجلة ثقافية شهرية
تصدرها الامانة العامة للثقافة و الشباب
باللغتين الكردية و العربية

رئيس التحرير
محمد امين محمد احمد

نائب رئيس التحرير
حسين عارف

43
نيسان ١٩٨٦
السنة الرابعة

في هذا العدد



العنوان : اربيل ـ الامانة العامة للثقافة والشباب ـ مجلة كاروان ـ هاتف / ٢٠٨٠٠

# الشاعر محسن قوجان

ترجمة وتقديم :
بدل رفو المزوري

**نبذة عن حياة الشاعر :**

– ولد الشاعر محسن قوجان عام ١٩٥٤ في قرية بامرني .

– درس في مدرسة القرية الأبتدائية ، وارتحل بعدها الى مدينة الموصل حيث أكمل دراسته الابتدائية والثانوية وواصل تحصيله الدراسي في جامعة الموصل (كلية الزراعة والغابات) .

– عمل عضواً في أتحاد الأدباء الاكراد – فرع دهوك .

– له العديد من الاسهامات الشعرية في الصحف والمجلات الكردية : «هاوكارى ، بيان ، كاروان ، العراق»

– شارك في عدد من الندوات الأدبية حول الشعر الكردي الحديث – كمحاضر تارة ، وكناقد تارة

– تعود بدايته الشعرية الى عام ١٩٧٠ .

– يستعد لأصدار ديوان شعري بعنوان (الثلج هنا)

– له أسلوبه الخاص المتميز على صعيد الشعر لذلك فنذ الوهلة الاولى اعتبره النقاد موهبة أدبية شابة يمتلك زمام الشاعرية خلال السنوات القادمة .

يجسد الشاعر في قصائده الهم الأنساني والتوتر النفسي لدى الأنسان المستلب مستخدماً بذلك التصاوير الواقعية الصادقة ، وأنه ينهل أسلوبه ولغته الشعرية من ينابيع الفلكلور الكردي حيث يستعمل المفردات والكتابات والأمثال الشعبية الكردية في قصائده .

– وقد أختار الشاعر هذه القصائد بنفسه للترجمة .

المترجم

**القصيدة الاولى :**

**لم يبق لي شيءٌ سوى اللسان**

يا لها من أعجوبة
كل ليلة . . وكل ليلة
كزهو الحورية . . .
تنفجرُ من عمق امواج العدم
وبحر عينيها الربيع
وتترّنم أغنية النهر على شفاهها
من أين يأتي . . . ؟
ومن أين ينبع . . . ؟
لكن !
أمِنْ أحضان صفحات دفتري ؟
أم من أعماق زحام أفكاري ؟
لست أدري . . .
لكن ! تحلُ عليَّ ضيفة ، في كل ليلة
وتعلم جيداً . . .
بأني أعشق شعرها القدسي
وأهوى خضرة عينيها الربيعية
أكثر من عشقي وحبي لقصائدي .

× ×

وتجيءُ في كل ليلة
الوجنتان مثل التفاح الناضج
ومن لهيب الهوى تكاد تنفجر بكاء
أجل ، أنها مثلُ اللهيب

